# کولتووری شارنشینی له‌ شاره‌کانی رۆژهه‌ڵات

جنێفه‌ر سکێرس



وه‌رگێرانی: شه‌هلا وه‌لی جه‌بار

# کولتووری شارنشینی له شارەکانی ڕۆژهەڵات

خستنەرووی ڕووبەری ناوەوەی خانوو

جنيفەر سكێرس

# كولتووری شارنشینی له شارەكانی رۆژهەلات

خستنەرووی ڕووبەری ناوەوەی خانوو

وەرگێرانی له عەرەبییەوە
شەهلا وەلی جەبار



هەولێر- ٢٠١٢



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **کولتووری شارنشینی لە شارەکانی رۆژهەلات**
- نووسینی: **جنێفەر سکێرس**
- وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: **لەیلا ئەلموسەوی**
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: **شەهلا وەلی جەبار**
- نەخشەسازی ناوەوە: **هەردی**
- بەرگ: **جێگر عەبدولجەبار**
- ژمارەی سپاردن: **(٢٤٤٠) لە ساڵی ٢٠١٠**
- نرخ: **(٤٠٠٠) دینار**
- چاپی یەکەم : **٢٠١٢**
- تیراژ: **٧٥٠ دانە**
- چاپخانە: **چاپخانەی رۆژهەلات (هەولێر)**

**زنجیرەی کتێب (٥٤٠)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

پێشکەشە بە (نادیە)ی خوشکم، کە هیچ

وشەیەک ناتوانێت گوزارشت لە گەورەیی و

لێبووردەیی ئەو بکەن.

## پێڕست

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

لە کتێبێکی قەبارە بچووکی پێکهاتوو لە پێنج بەش و پاشکۆیەکی وێنـەیی نـاوازەدا، دەتوانرێـت لـە دیدگایـەکی تـرەوە مێـژووی هەنـدێك لـە کۆمەڵگـە ڕۆژهەڵاتییەکان بخوێنرێتەوە، جیاواز لەوەی لەگەڵی ڕاهاتووین. بەشە یەك بەدوای یەکـەکانی ئـەم کتێبـە بانگەشـەیەکە بـۆ ئـەوەی بـە سـۆراخی ناسـینی ئـەو جیاکارییانــەوە بـین کـە ژیـانی ڕۆژانــەی نـاو مـاڵ، کۆشـك و تـەلاری شـارە بەناوبانگەکانی تورکیا، میسر و ئێران هەیانە، کە بە گشتی سیحر و جوانییەکی بێ وێنەی بە هەریەك لە شارەکانی (ئەسـتەنبوڵ، قاهیرە و تاران) بەخشیوە.

لـە کتێبـی (کولتـووری شارنشـینی لـە شـارەکانی ڕۆژهـەڵات)، خانمـە نووسـەر سـەرەتا لایەنـە گشـتییەکان باسـدەکات، دواتـر ووردەووردە دەپرژێتـە سـەر لایەنـە تایبەتییەکانی ئەو ژیانەی کە شارەکانی ڕۆژهەڵات لە ماوەی نێوان سەدەی شازدەو هـەژدەی زایەنیـدا تێیـدا ژیـاون، ئـەویش بـەم جۆرەیـە: شـار، خـانوو، شـوێنی نیشتەجێبوون، ژیانی خێزانی، ژیانی کۆمەڵایەتی و گشتی. خانمە نووسەر لـە ڕێگـەی خستنەڕووی لایەنە گشتییەکانی ژیانی کۆمەڵایـەتی دانیشـتوان، بەتایبـەتیش ژیـانی ڕۆژانەی چینی ناوەند و باڵای ئەسـتەنبوڵ، قـاهیرە و چـەند شـارێکی گـەورەی ئێـران، هەوڵدەدات وێنەی ژیان، چۆنیەتی پەیوەندییەکۆمەڵایەتی و خزمایـەتی و میوانـداری، ڕێو ڕەسم و سرووتەکانمان بە وشە و جارجارەش بە وێنەی فۆتۆگرافی، بێنێتە زەینمان.

بەشە یەك بەدوای یەکەکانی ئەم کتێبە ڕوئیایەکی گشتیمان لەسەر ئـەو شـارە کۆنانە پێ دەدات، کە تێکەڵاوییەکە لە هەوڵدان بۆ خوشگوزەرانی و گرنگیـدان بـە جلوبـەرگ، خـواردن و خواردنـەوەو شـوێنی نیشـتەجێبوون، لـە هەمانکاتیشـدا پابەندبوون بە ڕۆحی فێرکردن و بەها ئیسلامییەکان. هەر بۆیەشە تێبینـی دەکرێـت لەو کۆمەڵگەیانەدا پێداگیرییەکی زۆر لەسەر جیاکردنەوەی فەزای گشتی لە فـەزای تایبەت، واتە جیاکردنـەوەی دیودخـان کـە تایبـەتـە بـە پیـاوان و پێشوازیکردن لـە میوانـە پیاوەکانیـان و ڕاییکردنـی ئیشـوکارەکانیان، لـەو بەشـەی کـە تایبەتـە بـە ئەندامانی خێزان (ژن، ماڵ و منداڵ، میوانە ژنەکانیان) دەکرێت.

ژیـانی کۆمـەڵایـەتی لـە نێـو ئـەو شـەقامانەدا کـە خزمـەتگوزاری، بـازاڕو بازرگانی تێدایە، بەڕێوە دەچێت، کەچی ژیـانی تایبـەتی لـە نێـو ماڵـەکان و لـە چوارچێوەی حەوش و ژووره پەرژینداره‌کاندا، کە بەڕواڵـەت سـادەو لـە نـاوەوەش رازاوە، شـاردراوەتەوە. ئینجـا لـە رێگـەی پەیوەنـدی نێـوان نـاوەوە و دەرەوە، هەروەها روونکردنەوەی شێوازی رێکخستنی خزمەتگوزارییـەکانی نـاو شـار وەك ئاوو ئاوەڕۆ، دامەزراوە گشتییەکان و بەشی بەرگری لە ئەستەنبوڵ و تاران، ئـەوا خانمە نووسـەر بـە شـێوەیەکی زۆر سەرسـامانە گوزارشـت لـە تایبەتمەندییـەکانی بیناسـازی لـە شـارەکانی رۆژهـەڵات دەکـات. پاشـان دەچێتە سـەر باسـکردنی دابەشکردنی فەزای تایبەت، حەوش، بەشـی تایبـەت بـە پیـاوان و بەشـی ژنـان لەگەڵ شوێنی خزمەتکارەکان لەنێو ماڵدا.

وەسفکردنێکی ووردی فەزای ناوەوە بـە بـێ هەڵوەسـتەکردن و باسـکردن لـە کەلوپەلی بەکارهاتوو لە ناو ماڵ کامڵ نابێت. کەلوپەلەکانی نـاو مـاڵ هـەروەك دیزاینی بیناسازی فاکتەرێکی بنچینەییە بۆ مسۆگەری بەکارهێنانێکی گونجـاوی فەزای نـاوەوە، هـەروەها بـۆ دەسـتەبەرکردنی دەوروبـەرێکی تایبـەتی بـۆ ژیـانی ئەندامانی خێزان.

ناو ماڵی رۆژهەڵاتی جیاواز لەگەڵ ناو ماڵی رۆژئاوایی کەلوپـەلی نـەگوازراوەیان تەنیا بریتیبوو لەو تاق و سەکۆیانەی کە بـەدەوری دیوەخانەکانـدا بـۆ شـوێنی کـەل و پـەلی رازاندنـەوە، پێخـەف و بـۆ دانیشـتن نامـادەکرابوون، پێکـدەهات. واتـە مێـزی نانخواردن، قەرەوێڵەی نووستن و شوێنی جلوبورگ هەڵگرتنیان نەبووە، کە ئەمـەش بـۆ رۆژئاواییەکان شتێکی سەرسوڕهێنەربوو.

لەو بەشەدا کە تایبەتە بە ژیانی خێزانی، خانمە نووسـەر شـیکردنەوەیەك بـۆ ئـەو سروشـتە ئـاڵۆزەی ژیـانی خێزانـی ماڵـە دەوڵەمەنـدەکان و چـینە باڵاکـانی کۆمەڵگـەی رۆژهـەڵاتی دەکـات. ئـەم ژیانـە بەشـێوەیەکی نـەریتی لـە تۆڕێـك پەیوەنـدی خزمایـەتی و ژنـو ژنخـوازی و ئەرکـەکانیان بەرامبـەر ئـەوانی تـر پێکهاتووە، بۆیە ئەم جۆرە خێزانانـە پێویسـتییان بـە شـوێنێکی نیشـتەجێبوونی

گەورە هەیە تاوەکو بتوانێت هەموو ئەندامانی لە خۆبگرێت و بەشێوەیەکی کارا وەزیفەکانی ئەنجامبدات. بونیادی خێزان نەرمونیانییەکی هەیە کە وادەکات کەسی تری وەك کوڕە مام، ئەندامی بێوەژن یا تەڵاقدراو، لەخۆ بگرێت، چونکە خێرخوازیی لە کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتیدا ئەرکێکی کۆمەڵایەتی و ئاینییە، ئەمە لەگەڵ رەچاوکردنی جیاکردنەوەی بەشی تایبەتی لە بەشی گشتی.

لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا خانمە نووسەر بەشێوەیەکی خێرا بەرەو دەرخستنی جۆری جلوبەرگ، رەنگی بەکارهاتوو، خواردن و خواردنەوە دەچێت. هەروەها خستنەڕووی رووکاری ژیانی رۆژانە و چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵکی رۆژهەڵاتی لەگەڵ تێپەڕینی ساتەکانی ژیانی تاك وەك لەدایکبوون، سونەتکردن، هاوسەرگیری و مردن، کە تێیدا جەخت لەسەر نهێنی ئەو تێکەڵە سحرییەی، ژیانی ئەم کۆمەڵگەیانە هەیانە، دەکات. لە کۆتاییشدا کتێبەکە بە پاشکۆیەکی وێنەیی کە بریتییە لە (٨٤) وێنەی زۆر جوان و چێژ بەخشی رەنگاورەنگ و رەشوسپی، کۆتایی دێت.

لەبەر ئەوەی لەو ماوە زەمەنییەی خانمە نووسەر دەست بە خستنەڕوو و شیکردنەوەکانی خۆی دەکات، ئەوا کوردستان لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە لایەك و سەفەوی لە لایەکی ترەوە، دابەشکرابوو، بۆیە پێمان وایە کولتووری شارە تورکی و ئێرانییەکان کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر تاکی کوردی دروستکردووە و ئەنجام ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەوە جۆرێك لە کولتووری تورکییان بەسەردا زاڵە، لەبەرامبەریشدا پارچەکانی ژێر دەستی سەفەوییەکان کولتووری ئێرانی بەسەریاندا باڵی کێشاوە. بۆیە پێمان وایە ئەگەر ئەم کتێبە بۆ تاکی رۆژئاوایی و تاکی عەرەبی گرنگە، ئەوا بۆ ئێمەی کوردیش بێشك بایەخی خۆی هەیە. لە لایەکی تریشەوە ناسینی ئەو کولتوورەی کە رەنگە رۆژێك لە رۆژان بەسەر باووباپیرانماندا زاڵبوە تامو چێژوو گرنگی خۆی هەیە، کە وادەکات هیچ نەبێت لە رێگەی کولتووری زاڵەوە بتوانین شتێك لە کولتووری خۆمان هەڵێنجین، ئالێرەدا دەردەکەوێت، کە خوێندنەوەی کتێبێکی دانسقی وەك ئەمەی لەبەردەستدایە چ مانایەك دەبەخشێت.

ئەم کتێبەی لەبەر دەستدایە لە ساڵی ٢٠٠٣ چاپی دووەمی بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە، ئەگەرچی زۆر درەنگ چاپە ئینگلیزییەکەم بە دەست گەیشت، بەڵام بە سەرنجدان لە کتێبەکە بە زمانی ئینگلیزی بۆم دەرکەوت کە وەرگێڕی عەرەبی هەموو شتێکی ئەم کتێبەی بۆ زمانی عەرەبی وەرنەگێڕاوە، بەجۆرێك خانمە نووسەر لەم کتێبەیدا باس لە ژیانی کۆمەڵایەتی وڵاتانی تری وەك لیتوانیا و ئەرمینیا و هەندێ وڵاتی تری ئەو ناوچەیەش دەکات، کە ئەمانە لە چاپە عەرەبییەکەدا نە بە وێنەو نە بە باسکردن، ئاماژەیان پێ نەکراوە.

لە کۆتاییدا بەو هیوایەی خوێنەری کوردیش بتوانێت بەو کولتوورانەی کە لە وڵاتە دراوسێکانی هەبووە و هەیە، ئاشنابێت.

کورتەیەك لەسەر ژیانی خانمە نووسەر(جنێفەر سکێرس)

لە مۆزەخانەی پاشایی سکۆتلەندی سەرپەرشتی بەشی ڕۆژهەڵات و هند بووە. جگە لەم کتێبەی کە لەبەر دەستدایە، ساڵی ١٩٨١ کتێبی (جلوبەرگ لە ڕۆژ هەڵات)( Middle Eastern Costume. NMS Publishing Limited:1981) ی بڵاوکردوەتەوە.

ساڵی ١٩٩٥ کتێبی (جلوبەرگی ژنان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خواروو) Women's Costume of the Near and Middle East. Publisher: Routledge; New Ed edition. 2003). ی بڵاوکردوەتەوە.

سکێرس ماوە ماوە و بەشێوەیەکی بەردەوام چەندین پێشانگای تایبەت بە کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ مۆزەخانەی سکۆتلەندی نێو دەوڵەتی ڕێکدەخات. بەشێوەیەکی سەرکێشانە باکووری ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست-ئێران، تورکیا، وڵاتانی کەنداوی عەرەبی، میسر، مۆریتانیا و تونس گەڕاوە. ئێستا وانەبێژی فەخرییە لە کۆلێژی (Duncan of Jordonston) سەر بە زانکۆی (Dundee) لە بەریتانیا.

## پێشەکی وەرگێڕی عەرەبی

### جوانی بەشێکی ڕۆژانەی ژیان بوو

لەم کتێبەدا جنێفەر سکێرس وەسفی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەکۆتایی سەدەکانی ناوەراست و سەرەتای سەدەی نوێ و لە ماوەی نێوان سەدەی ١٦ تا سەدەی١٧ی زاینی، دەکات. واتە لەنێوان چڵەپۆپەی گەشەسەندنی کولتووری ئەم کۆمەڵگەیانەو سەرەتای هاتن و لە ناوچوونی ئەم کولتوورە لەگەڵ زیادبوونی کاریگەری هزری و هونەری ئەورووپیدا. جیهانی ئیسلامی لەوسەردەمەدا بەسەر سێ ئیمپراتۆرییەتی زەبەلاحدا دابەشکرابوو، هەرێمەکانی رۆژهەڵات لە نیمچە کیشوەری هیندی کەوتبوە ژێر نفوزی دەسەڵاتداری مەغۆلە موسوڵمانەکان، بەڵام وڵاتی فارس بنەماڵەی سەفەوی و پاشان قاچاری فەرمانڕەواییان دەکرد، لە کاتێکدا هەرێمەکانی باکور لەتورکیاو چەند بەشێکی ئەورووپای رۆژهەڵات و یۆنان، هەروەها دەوروبەری دەریای ناوەڕاست و نیمچە دورگەی عەرەبی لە جیهانی عەرەبیدا هەمووی کەوتبووە ژێرکۆنترۆڵی خەلافەتی عوسمانییەوە. ئەو باروودۆخە جێگیرەی جیهانی ئیسلامی ژێردەسەڵاتی ئەم ئیمپراتۆریەتانە بۆ بەردەوامبوونی نەریتە هونەری و کولتوورییە بۆماوەییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلام، یارمەتی دەربوون.

لەگەڵ ئەوەی ئەم کتێبە بۆ خوێنەری رۆژئاوایی نووسراوە وەك چۆن نووسەر ئاماژەی پێکردووە، کە هەوڵێکە بۆ ڕوونکردنەوەی ئامانج لە نمایشکردنی کارە هونەرییە ئیسلامییەکان لە مۆزەخانەی سکۆتلەندای نەتەوەیی، ئەوا ئێمە پێمان وایە بۆخوێنەری ئێمەش گرنگی خۆی هەیە.

سەبارەت بەزۆرێکمان ئـەم کتێبــە وێنەیــەکی خۆشـیبەخش و لەهــەمان کـات ناخۆشمان دەخاتە پێش چاو کـە ئێمـە لـەو ژیانـەدا پـێش ئـەوەی ئـەو گۆڕانـە خێرایانەی کە لە نیوەی سەدەی ڕابردودا بەسەرماندااهاتوە، ژیاوین. هـەروەها هەندێ لەوشتانەی کە خانمە نووسەر لـەبارەی ژیـانی ڕۆژانـە لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی ناوەڕاسـتوو سـەرەتاکانی سـەدەی نـوێ وەسـفیاندەکات، تائێسـتاش واقیعێکی ڕۆژانەی چەندین گوندی دوردەستن، بـەجۆرێك بەشـێکی گـەورە لـە گەلانی عەرەبیلەهەمان بارودۆخی ژیانی ئەم کۆمەڵگەیانەدا دەژین.

بەڵام ئەم وێنەیە ڕۆژ بەڕۆژو بەشێوەیەکی زۆر خێرا لەگەڵ بڵاوبونـەوەی خوێندنی نوێ و دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن و پەیوەنـدی هاوچـەرخ وون دەبێـت. سەبارەت بە ئێمە زۆر گرنگـە لایەنـەکانی ژیـانی ڕۆژانـەی ئـەم شـارانە بـە دۆکیومێنت بکەین، ئەو ڕووکارانەی کە پێمان وایە شتی ئاسـایین و ڕۆژانـە تاکی رۆژهەلاتی چەندین بارەیان دەکاتەوە ولەلای هەموو کەسـێ زانـراون و پێویستیان بە باسکردن نییە، هەندێك لـەم ڕووکارانـەی ژیـان بـەلاوە نـراون وبەشێکی دیکەشیان خەریکن لە ناودەچن و، ئامانج وبوونی ئـەو کولتـووورە تەنها لەلای کەمینەیەکی بەساڵاچوو و کەسی ئەکادیمی و توێژەران زانیاریان لەسەرماوە. هەروەها گرنگی ئەم بە دیکۆمێنتکردنە تەنها لە تۆمـارکردنی سەرچـاوەی شوناسـی کولتووریدانییــە، بـەڵکو گرنگیەکـەی لـە پاراسـتنی مێژووی گەشەسەندنی ئەم جۆرە جیاوازییە کولتوورییانەشدایە. تۆمـارکردن و بـەدیکۆمێنتکردن هـەردووکیان هـەنگاوی سـەرەکینلە بەرامبـەر هـەر هەوڵـدانێك بـۆ پاراسـتنی جیـاوازی کولتـووری ئـەو شـارانە کەڕووبـەڕوی هەڕەشەی لەناوچوونی ڕەسەنایەتی خۆیان لە بەرامبەر کولتـووری هاوچـەرخ دەبنــەوە، ئەمــەش هــەنگاوێکی بنچـینەییە بـۆ دامەزرانـدنی بنکەیــەکی مەعریفی نوێ بۆ هەر هزرێکی هاوچەرخ کە حەزدەکات تیـۆرێکی نـوێ بـۆ شوناسێکی کولتووری عەرەبی هاوچەرخ پێشکەش بکات.

## چوارچێوەی گشتی ژیانی شارنشینی لە شارەکانی ڕۆژهەڵات

لە بەشی یەکەمدا خانمە نووسەر دەروازەیەك لەبارەی ژیانی شارنشینی، بەکێشانی چوارچێوەیەکی گشتی ژیانکردن لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەماوەی نێوان سەدەی ١٦ و ١٩ دەکاتەوە. خانمە نووسەر بەشیوەیەکی خێرا بەسەر سروشتی جوگرافی وجیاوازییە هەرێمییەکاندا دەپرژێت، وەسفەکانی لەسەر سێ گەورە شار چڕدەکاتەوە ئەوانیشقاهیرە، ئەستەنبوڵ و تارانن. خانمە نووسەر هەوڵدەدات بارودۆخی جوگرافی ئەم شارانە، هەروەها زۆر بەکورتی باسی گەشەسەندنی مێژوویی ئەم شارە دێرینانە، کە ڕەگووڕیشەی دروستبوونیان بۆ پێش ئیسلام دەگەڕێتەوە، بکات، هەروەها چۆنیەتی پەرەسەندن و گەشەسەندنی لەگەڵ هاتنو بڵاوبوونەوەی ئیسلام و پێشکەوتنی ئەم هەرێمانە لەڕووی بازرگانییەوە بخاتە ڕوو. پاشان باسی بارودۆخی ژیانی ڕۆژهەڵات لەچوارچێوەی گشتی شار لەڕووی شوێن و هەبوونی ئاوو ئاوەدانییەکانی دەوروبەری شار و بازاڕو بەرهەم و ئەو چاکسازییە نوێیانەی لە شێوەو هەندێ وەزیفەی شارەکان ئەنجامدراون، دەکات. خانمە نووسەر ئاماژە بە ڕۆڵی ئیسلام لە پێناسی گشتی و تایبەتی بۆ شار، هەروەها پلانی ڕێکخستنی ئەم شارانە[1] ئینجا دامەزراوەو خزمەتگوزارییە گشتیەکانی ئەم شارانە، وەك مزگوت، بازاڕ، ڕێگاوبان و حەمام وپەیوەندی ئەمانە بە دیزاینی گشتی شارو سیستەمی ژیان بەسەربردن تێیدا دەکات.

بەڵام خانمە نووسەر باسێکی تێرو تەسەل لەبارەی توێژەکانی کۆمەڵگەی ئەم شارانە ناخاتە ڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا زانیاری ئاماری تەواوو وورد لەبارەی ئەم ماوە زەمەنییە بەدەستەوەنییە، ئەوەیشی لەبەر دەستماندایە بریتییە لەدابەشکردنێکی گشتی گروپە ئەتنی و مەزهەبییەکان. دانیشتوانی ئەم شارانە تێکەڵێك لە ڕەگەزی فارسی، عەرەبی و تورکی

بـوون. کـە زۆرینــەیان ئیسـلام بـوون و کریسـتیان و جولەکـەیان لـەناو دا هەبوون. گەڕیدەی ئەڵمانی (کارستن نیبـۆر) (١٧٣٣-١٨١٥) - شانشـینی دانیمارك لە میانەی شاندێك لە نیوەی دووەمی سـەدەی ١٨. واتـە لـەنێوان ساڵانی (١٧٦١-١٧٦٧) بۆ ڕۆژهەڵاتی ناردبوو- لە کتێبەکەیدا (گەشـتێك بۆ میسر ١٧٦١-١٧٦٢) باس لەسـەختی سـەرژمێرکردنی دانیشـتوان لـەم شـارانەدا دەکـات و دەڵێـت: لـە توانـای مرۆڤدانییـە شـتێکی ووردوتـەواو سـەبارەت بـە ژمـارەی دانیشـتوانی شـارەکانی ڕۆژهـەڵات بزانێـت، چـونکە وڵاتانی ڕۆژهـەڵات هێشـتا تۆمـاری ڕۆژی لـەدایکبوون و مردنیـان ئامـادە نـەکردووە، بۆیـە گەڕیـدە گەربیـەوێت لـەم ڕووەوە بـەووردی سـەرژمێرییان بزانێت، ئەوا دوای دیاریکردنی ڕووبەری شار دڵنیا دەبن لەوەی هەموو ئـەو ڕووبەرانە خەڵکی لەسەر دەژێت... [٢]

تـەنها لێکۆڵینەوەیـەکی تێروتەسـەل کـە لـەم سـەردەمەدا ناسـرابێت، ئەویش بە یەکێ لە گرنگترین ئەو سەرچاوانە دادەنرێت کە باس لـە ڕەوش و داب و نەریتی چینە جیاوازەکانی ئـەم کۆمەڵگەیانـە دەکـات، ئـەویش ئـەو لێکۆڵینەوەیەیە کە زانا فەرەنسیەکان لە کاتی داگیرکردنـی میسـر لەلایـەن فەرەنسـیەکان لــە کۆتــایی ســەدەی (١٨) و ســەرەتای ســەدەی (١٩)[٣] ئەنجامیانداوە، ئەم لێکۆڵینەوەیە بـۆ یەکـەم جـار چوارچێوەیەکی نـوێی بـۆ سەرژمێریکردنی دانیشتوان لە هەریەك لە شارەکانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت خستە ڕوو. لەگەڵ ئەوەی سەرژمێرییەکە بەو مانایـەی ئێسـتای بەتایبـەتی لەو ڕووەوە کە باسی هیچ پێوەرێکی بـەکارهاتوو بـۆ پێوانـەکردنی ژمـارەی دانیشتوان ناکات، زۆر وورد نەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی بیرۆکەیـەکی گشـتی لـە بارەی توێژەکانی کۆمەڵگەی شارە ئیسلامیەکان بخاتە ڕوو، یارمەتی دەرە.

کۆمەڵگەی میسری لـە سـەرەتای داگیرکردنـی لەلایـەن فەرەنسـاوە لـە چینی جیاوازی ئـەتنی، ئـاینی و پیشـەیی پێکـدەهات. زانایـانی فەرەنسـی

سەرژمێریی دانیشتوانیقاهیرەیان لە ساڵی ١٧٩٨ تەنها بۆ پێگەیشتوانی بە نزیکەی ٣٠٠هەزار کەس دانا و، بەسەر چەند توێژێکی جیاواز لەسەر قوچەکی کۆمەڵگەی قاهیرە لەسەرەتای سەدەی ١٩ دابەشدەبن. ئەم قوچەکە لە چینێکی بەرفراوانی کوڕان پێکهاتووە ئەوانەی کاری ئاست نزمیان دەکرد وەك (سواس) خزمەتکار، ئاوگێر، کۆڵهەڵگرو کرێکار،کۆی گشتی ئەمانە بە پێی بۆچوونی فەرەنسیەکان یەکسان بوو بە٤٥ هەزار کەس. واتە ڕێژەی ٤٥٪ یکۆمەڵگەیان پێکدەهێنا، دوای ئەمان دروستکارو ئەوانەی کاری دەستی ئەنجام دەدەن، ژمارەیان نزیکەی ٢٥هەزار کەس دەبوو. واتە بەڕێژە ٢٥٪ ی کۆمەڵگەیقاهیرەیان پێکدەهێنا، پاشان مەمالیکەکان دێن کە ئەمانە پاشماوەی چینی فەرمانڕەوا بوون و دوای هاتنی عوسانیەکان لەناوچوون کە ڕێژەیان ١٥٪ بوو. پاشان چینی خاوەن زەوی و زارەکانن کە نزیکەی ٦ هەزار کەس دەبوون. واتە بەڕێژەی ٦٪. لە کۆتاییشدا بازرگانەکان دێن کە ٤ هەزارن. واتە ڕێژەی ٤٪ یان پێکدەهێنا، ئەمانە دوای فرۆشتنی بەرهەمەکانیان دووبارە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونیان لە قوستەنتینیە، ئەزمیر، بەغدا، حەلەب، جەدە و یەنبەع دەگەڕانەوە.

بەڵام سەبارەت بە ژمارەی ژنان، ئەوا بە ١٢٦ هەزار کەس مەزەندە کراون و، ژمارەی منداڵان بە نزیکەی ٣٠٠ هەزار کەس هەژمارکراون.

ئەم شارانە پێشترو ئێستاش بە جەنجاڵترین شار لە ڕووی دانیشتوانەوە حسێبدەکرێن، هەروەها لە هەموو شارەکانی دیکەی جیهان لە ڕووی فرەرەگەزی و ئایینەوە زۆر ڕەنگ و جیاوازترن، چونکە ئەم شوێنانە پایتەختی کۆنن و ناوەندی چالاکی بازرگانی بوون. بازرگانی ئاورێشم و داودەرمانی بۆندار ئاسیا بە ڕۆژئاواوە دەبەستێتەوە. هەروەها سەرژمێری خەڵکی ناموسڵمان لە شارە ئیسلامیەکاندا لە شارێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاواز بوو و بەپێی سروشتی مێژوویی شارەکان دەگۆڕان، بەڵام ئەم توێژانە

لەگەڵ دەستە موسڵمانەکانی دیکە بە ئاشتیانە دەژیان و زۆر جـار لـەبواری کـارگێری و فەرمانڕەواییـدا بەشـداریان دەکـرد و ژمارەیـەکیان لـە کـارە دەستیەکان کاریان دەکرد. هـەروەها لـەو پیشـانەی کـە لـە بـاوو باپیرانیـان مابۆوە و بوو بوو بە نەریتێك و هەمیشە پارێزگارییان لە نهێنی پیشەکەیان دەکرد تا سەرەتاکانی سەدەی ٢٠ لەسەری بەردەوام بوونە.

بۆ نموونە دەتوانرێت هەست بەو فرە رەنگیە ڕەگەزیەو، ژمارەی ئەوانەی دەکەونە نێو توێژە ناموسلمانەکان لە قوستەنتینیە بکرێت -لـەژێر سـایەی دەسەڵاتی موسڵمانە سونەکان- بۆ نمونە لەژمارەی کڵێسـەی کریسـتیانەکان وپەرستگای جولەکەکان لەچارێکی کۆتایی سەدەی ١٨ تێبینی دەکرێت.

"... تـا ئـەمڕۆ یۆنانیـەکان ٢٣ کڵێسـایان هەیـەو، ئەرمەنـەکانیش ٣کڵێسا. سەرباری ئەو کڵێسایانەی کە لـە قوسـتەنتینیە هەیانـە، کڵێسـای تریش لە (غەڵاتە) و دەوروبەری هەیە. هەروەها لە (پیرا) یـەکێ لـە گـەورە پیاوە ئاینییەکان دەژێت کە پاپا ناوی (ئەسقف) ی لێناوە. هـەرەوها ڕۆمـە کاتۆلیکەکانیش سێ تایەفە بوون، هەر تایەفەیەکیان کڵێسای خۆی هـەبوو، لەژێرسایەی ئەم نوێنەرونەو نوێنەری رۆژئاواییدا بوون. هەریەك لە بـالیۆزی ئینگلیزی و هۆڵەندیی کڵێسایەکی بچووکیان هـەبوو و، نوێنـەری سـویدیش کڵێسایەکی بچووکی تایبەت بەخۆی هەبوو.

جولەکەکانی قوستەنتینیە و شارو گوندەکانی تر چەند پەرسـتگایەکیان هـەبوو، کـە زۆربـەیان تـەلمودیبوون، بـەڵام تایەفـەی قورائـەکان پەرستگای (غسکۆف)یان هەبوو. هـەروەها ئـەو تایەفـە جیاوازانـەی کـە ناموسـڵمانن یانیش تایەفەی تری بتپەرست، ڕێگایان پێنادرێت تا پەرستگای تایبەت بـە خۆیان دروستبکەن، بەڵام تایەفە جیاوازەکان بێ ئـەوەی دەسـەڵات ئەوەنـدە گرنگیان پێبدات، کۆبوونەوەی خۆیان دەکرد... [٤].

لێکۆڵینـەوەی "وەسـفی میسـر" توێـژە ئاینییـە جیاوازەکـانی میسـر دابەشـدەکات و، ئاماژەدەکـات بـەوەی موسـڵمانان ٤مەزهـەبن، ئەمـە

دەیسەلمێنێت کە زانایانی فەرەنسی شارەزایی تەواویان لە بارەی مەزهەبە ئیسلامیەکانی تر نەبووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە دەریدەخات، کە سەرەرای ئەوەی سەرکردەی فەرمانڕەوایی و دەستەی قەزای هەرێمەکان سەر بە مەزهەبی حەنەفی بوون و پاشکەوتەی دەسەڵاتی قوستەنتینیەیە، ئەوا زۆربەی دانیشتوانەکەی لەلایەنگرانی مەزهەبی شافعی بوون، هەروەها هەندێ لەلایەنگرانی مەزهەبی مالیکی و ژمارەیەکی کەم لە لایەنگرانی مەزهەبی حەنبەلییان تێدابوو، بەڵام تایەفە کریستیانەکان لە میسر بریتیبوون لە قبتی، ئەرۆمی، ئەرمەنی و مارۆنی. ئەمانە لە نێوان تایەفەی کاتۆلیکیی کەلایەنگری پاپا بوون لە رۆما و تایەفەی هراتقەی مەستوریەکان، کە سروشتی دوالیزمی حەزرەتی مەسیح رەتدەکەنەوە، دابەشدەبوو. ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاماژەدەکات بەوەی جولەکەکانی میسر لە دوو تایەفە پێکهاتوون:

((... گرنگترینیان تایەفەی قورائەکان بوون، ئەم دوو تایەفە گیانی لێبوردەیی لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام تایەفەکانی تری ئەم ئاینە کە نیبۆر لە کتێبەکەیدا (وەسفی نیمچە دورگەی عەرەبی ) لە میسرو هەموو دەشتی نیل روونی کردووەتەوە کە بوونیان نیە... ) [٥].

بەڵام دەسەڵاتی سیاسی لە وڵاتی فارس زۆرینەی دانیشتوانی لەو ماوەیەدا لەسەر مەزهەبی شیعی دوانزە ئیمام بوون، توێژە موسڵمانە سونەکان لە کەناری کەنداو دوور لە پایتەختی شیعە مەزهەب جێگیربوو بوون. هەرێمە رۆژهەڵاتیەکان لە ئێران و هند سەرەرای بوونی کرستیانە رۆژهەڵاتیەکان، ئەوا نێردراوە ئەوروپییەکان (الارساليات الاوروبية) هەبوو بە تایبەتی لە راهیبە یەسوعییەکان. ئەمانە لە تاران نفوزو توانەیەکی زۆریان لە بەرێوەبردنی کاروباری لایەنگرە کریستیانەکانیان لە خەڵکی رۆژهەڵات و ئەوروپیەکان، هەروەها لە پارێزگاریکردن لە بازرگان و گەرێدە

ئەورووپییەکان لەکاتی تێپەربوونیان بەو ناوچانە هەبوو. هەروەها جوولەکەکانیش نفوزێکی بەهێزیان لەناو شارە فارسییەکان بە تایبەت لەشیراز هەبوو.

ئینجا لە لادێ دوور دەستەکان، زەردەشتی و ئەوانەی لایەنگری ئاینە زەمینییەکان بوون دەژیان، بەجۆرێك شاخ و چیاکان ببوونە شوێنی گیرسانەوەی تایەفە نامسولمانەکان.

### ژیان لە ماڵە دەوڵەمەندەکانی رۆژهەڵات

بەشەکانی ئەم کتێبە باس لە ناو ماڵی چینی باڵاو چۆنیەتی ژیانی رۆژانەیان لە کۆمەڵگەدا دەکات، کە دەکرێ باشترین ئەو شتانەی کە کولتووری لۆکاڵی بەرهەمی دەهێنێت و، گران بەهاترین ئەو شتانەی کە بازارەکان لە کولتووری دوورەکانەوە هاوردەی دەکەن، لەم ماڵانەدا بەرچاوبکەون. خانمە نووسەر لە سەرسامبوونی بە رۆژهەڵات، وێنەی دەوڵەمەندی و زەنگینی ئەو ناوچەیە دەکێشێت، ئەم وێنانەش زۆر لە راستییەوە دووربوون، چونکە تەنها لە کۆشك و تەلاری پاشایەتی و دەسەڵاتدارو میرو ماڵی هەندێ لە کەسە زۆر دەوڵەمەندەکان دەبینران، تەنانەت بنەماڵە دەست رۆیشتوەکانیش نەیان دەتوانی ئەم دەست بڵاوییە بکەن و، کەنیز لە ژێر پێی گەورەو خانمەکانیان رێز بن و چاوەڕێی بچووکترین ئاماژە یا بچووکترین جوولەبن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکان و ئارەزووەکانیان (وێنەی١).

لەکاتێکدا چینە دەوڵەمەندەکان رۆژگاری خۆیان لە خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی بەسەردەبرد، وەك جگەرەکێشان و قاوەخواردنەوە و گوێگرتن لە چیرۆك و خەندەی ژنانیان و مۆسیقاو گۆرانی، ئەوا چینە هەژارەکان لە پێناو پەیداکردنی نانی رۆژانەیان هەوڵیاندەدا و زەحمەتییان دەکێشا. مانەوەی پیاو

لە سەر کارکردنی قورس و بەردەوام دەوەستا، وەك ڕاکێشانی چوارچەرخە گەورەکان لە ژێر خۆرەتاوی سوتێنەر کە دەیدا بە تەپلی سەری ڕاکێشەرەکەی بێ ئەوەی ماندوویەتی یان جاڕسبوونی خۆی دەربخات. هەروەها جووتیارەکان لە ژێر ئەو کەش و هەوا گەرمەی کە هەیە، زەوی دەکێڵن.

هەروەها ژنی ماڵە دەوڵەمەندەکان زۆر داپۆشراو بوون و خزمەتکارەکانیان لە جێی ئەوان کارەکانی ئەوانیان ئەنجامدەدا (وێنەی٢). ژنی ماڵە هەژارەکان سەرقاڵی ئیش وکارەکانی ناو ماڵ و یارمەتیدانی پیاوەکانیان بوون لە کێڵگە، ڕەنگە ئەمان لە پیاوەکانیان ماندووتربن (وێنەی٣) ئێدوارد ویلیام لین — کە لە نێوان ساڵانی ١٨٣٣-١٨٣٥ سەردانی میسری کردووە — وەسفی ژیانی قورسی ژنانی ئەم چینە هەژارە دەکات:

((... ژنانی چینی خوارەوە زۆر بەکەمی ڕێك دەکەوت کە ژیانێکی بێ ماندوو بوون بەسەر بەرن، بگرە هەندێکیان وا مەحکوم کرابوون کە لە پیاوان کاری زیاتر بکەن. کاری سەرەکیان ئامادەکردنی خواردنە بۆ هاوسەرەکانیان و ئاو کێشان بە گۆزە (وێنەی٤) و ڕستنی خوری، لۆکەو کەتان، هەروەها ئامادەکردنی سووتەمەنی کە بە (الجلة) ناودەبرێت-واتە تەپاڵە- ئەمەش لە پاشماوەی مەروماڵات و تێکەڵێکی شێلراو لەگەڵ توتن، ئینجا لەسەر شێوەی تۆپەڵی بازنەیی تۆپەڵدەکرێت و بە دیوار یا سەربانی خانوەکانیانەوە سواغ دەدرێن، یانیش لە سەر زەوی دادەنرێت بۆ ئەوەی لە ژێر خۆر ووشك ببێتەوە و بۆ ئاگرکردنەوە لە ناوئاگردانەکان، جاری واش هەبوو بۆ شتی تر بەکاردەهات، هەروەها ژنانی ئەم چینە لەچاو ژنانی چینە باڵاکان زیاتر گوێڕایەڵی پیاوەکانیان دەکرد... ))[٦].

بەڵام منداڵی چینە هەژارەکان هەر لەسەرەتای شەش ساڵی یا حەوت ساڵییەوە وا پەروەردەدەکرێن، کە بۆ خێزانەکانیان بە کەڵك بن (وێنەی٥).

منداڵی ئەم چینە شوانکارەییان دەکرد و لەگەڵ مەڕو وماڵاتەکانیاندا دەچوونە دەرودەشت. دوای ئەوەی کەمێك گەورەدەبن و ژیانی هاوسەری پێکدەهێنن لە چاندن یا ئەو کارە دەستیە سادانەی کە باوانیان پێوەی خەریکن، یارمەتییان دەدەن.

بەڵام لێرەدا خانمە نووسەر لە باسەکانیدا جەختی لەسەر ماڵە دەوڵەمەندەکان کردوەتەوە، ئەویش لەبەر دوو هۆکار: یەکەمیان ئامانج لە نووسینی ئەم جۆرە کتێبەیە، ئەویش ئامادەکردنی چوارچێوەیەکە بۆ ئەو شتانەی کەلە مۆزەخانەی سکۆتلەندی نیشتمانی تایبەت بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نمایشکراون. هەریەکێ لەو ماڵە زەنگینانە دەتوانێت بۆ هەموو ئەو هونەرە جوانانە پێشانگایەك بێت، هەر لە هونەرە بچووکەکانەوە کە لە قاپ و قاچاخی فەخفوری، زەخرەفەی دروستکراو، ئاوێنە، قۆری، قاپی کانزایی، شانە، عەتر و گوڵاو ڕێژی شوشەیی، چنراوی جل و بەرگ و لاکێش، تا دەگاتە پارچەی بیناسازی و ئەو زەخرەفانەی کە تێیدا بەکارهاتوون و جۆرەکانی دیوەخان و ئەو دارو زەخرەفە گەچی و شوشە ئاوێزە ڕەنگاورەنگانەی تێیدا بەکارهاتوون تا هونەری بیناسازی.

بەڵام هۆکاری دووەم، کەمی سەرچاوەی نووسراوە، بۆئەوەی ببێتە بەڵگە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆتاییەکانی سەدە ناوەڕاستەکان و سەرەتای سەردەمی نوێ. لەگەڵ ئەوەی بەشێوەیەکی تێرو تەسەل باسکردن لەبارەی ژیانی کۆمەڵایەتی هەموو چینەکانی کۆمەڵگە لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕێگەی نووسینەکانی مێژوو نووسە موسڵمانەکانەوە بەدەستمان گەیشتووە، وەك ئیبن تەغری بەرەدی، مقریزی و قلقشەندی، ئەوا سەرچاوەیەکی زۆر کە هەموولایەنەکانی ژیان وێنا بکات، ئەو ژیانەی خەریکە گۆڕانی ڕیشەیی بەخۆوە دەبینێت سەبارەت بەو ماوەیەی کە خانمە نووسەر باسی لەبارەوە دەکات، بەتایبەتیش لەلای چینە هەژارەکان، بەدەستەوە نییە. زۆریەی ئەو

سەرچاوانەی باس لەو ماوەیەی کە لێکۆڵینەوەکە خستوویەتیە ڕوو، دەکەن. لە نووسینەکانی ئەو گەڕیدە ئەوروپایانەوە وەرگیراون کە زۆربەیان لەبنەماڵەی دەوڵەمەندەوە هاتبوون و لە ڕۆژهەڵات بە ئامانجی گەڕان و تەماشاکردن یا بۆ بازرگانی دەهاتن، یا وەکو باڵیۆزی وولاتەکانیان دەنێردرانە ڕۆژهەلات. هەروەها جاری وا هەیە سەرچاوەکان لە سەریاداشتەکانی ئەو بەخێوکارە ئەوروپیانەوە وەرگیراون، کە بۆ سەرپەرشتیکردن و فێرکردنی کچانی کۆشك دەهاتن، یانیش لە یاداشتەکانی ئەو کچانەوە وەرگیراون، کە بە پلەی خوێندنی بالاّ گەیشتوون، ئەم پلەیە بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە لەو سەردەمە فەراهەم نەدەبوو. بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە زۆربەی مامەڵەکانی ئەم گەڕیدەو نووسەرانە لەگەڵ چینە باڵاکانی کۆمەڵگە بووبێت، بەمەش زۆربەی سەرگوزشتە و نووسینەکانیان لەسەر بنچینەی ئەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ ئەم چینانە کردوویانە بووە. هەروەها زۆربەی ئەو شتانەی کە بەدەستمان گەیشتوون لە ماڵ و خانووو کەل وپەل، تایبەتن بە ماڵە دەوڵەمەندەکان کەلە باشترین وچاکترین و بەهێزترین مادەو کەلوپەلی بیناسازی و بەدەستی باشترین کارساز دروست کراون،بۆیە ئەم کەل و پەلانە توانیویانە بۆماوەیەکی زۆر و تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بمێننەوە.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە دابەشکردنی ڕووبەری ناوەوەی ئەم ماڵە شارنشینانە دەخاتە ڕوو تێیدا باس لە دابەشکردنی ئەم ڕووبەرانە دەکات، هەر ڕووبەرێك کە زیاتر لە وەزیفەیەکی هەیە، وەك شوێنی دانیشتن و بژێوی، دیوەخان و ژووری نووستن، هەروەها ئەو ڕووبەرانەی وەزیفەی دیاریکراوی خۆیان هەیە، کە پاشکۆی خانووەکانن، وەك چێشتخانەو ژووری عەمبارکردن وتەویلەکان. هەروەها ئاماژە بە ماددەی بیناسازی جیاواز دەکات، کە لە باڵەخانەو زەخرەفەی ماڵەکان وەکو بەردو دارو شووشەی ڕەنگاو ڕەنگ، بەکاردێن.

لێرەدا خانمە نووسەر مێژووی پێشکەوتنی ئـەم دابەشـکردنەی رووبـەری ناوەوەی خانوو لە چەند دێڕێکی کورتدا باسدەکات. خانمە نووسەر باسی ئەو دابەشکردنەی ئیسلام لە جیاکرنەوەی ڕووبەری تایبەتی لە گشـتی پـەیڕەوی دەکات، دەکات، هەروەها ئاماژەیـەکی بچـووك لـە بـارەی داکـۆکی کردنـی ئیسـلام لەسـەر چاوپۆشـین وداوێـن پـاکی دەکـات. ئـەم سـنووردارکردن و جیاکردنەوەیەی لە نێوان تایبەت و گشتی کراوە،بەدرێـژایی مێـژووی فقهـی لەو رێساویاسـاو تەشـریعاتانەوە هـاتوون کـە قازییـەکان لەسـەر کۆمەڵگـە پراکتیزەیان کردووە، ئەمەش ووردە ووردە کاریگـەری لەسـەر داب ونـەریت دروسـتکردوە و بـووە بـە مـۆرکێکی گشـتی نـاو ماڵـەکان. شـەرعیەتی ئیسلامی بەرامبەر خۆخزاندنە ناو حەرەمی ماڵەکان لێبوردنی نیە، جا ئـەو کارە لەلایەن ئەوانەوەبێت کە هاموشۆی سەر رێگـا گشـتیەکان دەکـەن، یـا ئـەو دراوسـێیانەی دیواریـان بەیەکترەوەیـە (وێنـەی٦)، تەنانـەت ئەمـە مزگەوتەکانیش دەگرێتەوە... سمهۆدی لە ((خلاصة الوفا بأخبار مصطفى)) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

((... عومـەر کـوری عەبدولعـەزیز چـوار منـارەی لـە چوارگۆشـەی جیاجیای مزگەوتەکە کرد و کەبیری کوری جەعفەر دەڵێت: منـارەی چـوارەم بەسەر ماڵی مەروانەوە دەیڕوانی، بۆیە فەرمانی دەرکـرد ئـەوە بووتـانیوەرۆ مزگەوتەکە لەگەڵ دەرگاکانی رووخێنرا، ئینجا خانووەکەی مـەروان کـە لـە پێش مزگەوتەکە دێت... [٧]

زۆر گێرانەوە و بڕیار لە بـارەی پارێزگـاریکردن لـە مـاڵ وحـاڵ وحـەیاو حەرەمی خێزان لە چاوی کەسانی کەم هەیە، هەروەها ئـەو رێسـاو بڕیارانـە رەچاوی هـەموو شـتێکی، وەك دابەشـکردنی دەرگاکـانی خـانوو، پەنجـەرەو بڵندی دیوارەکان، دروستکردنی دوکان لە نێو ماڵەکان کردوە. ئەمانـە هـەر لە سەرەتای مێژووی ئیسلامییەوە حیسابیان بۆ دەکرا.

پاش ئەمە لە بەشی سێ یەمی ئەم کتێبە خانمە نووسەر ماڵ و تایبەتی ناو ماڵی دەوڵەمەندەکان و ئەو ئامرازانەی ڕۆژانە بەکاریدەهێنن، هەروەها چۆنیەتی ڕازاندنەوەو زەخرەفەی قەد دیوارەکان دەخاتە روو.

خانمە نووسەر ئاماژە بە رۆڵی ڕستن وچنین لە ڕایەخکردن وڕازاندنەوەی ناو ماڵەکان دەکات و، باس لە زەوق وسەلیقەی گشتی ئەو سەردەمە لە ڕازاندنەوەی بنمیچ و زەوی ژوورەکان بە تەختەدارو زەخرەفەی گەچی و بەرگرتنی پەنجەرەکان بە پێشگر (مشربية) -دوو لایەکی لە داردروستکراو لەسەر شێوەی دەرگایەو بەدیوی دەرەوەی پەنجەرەکانەوە دادەنران بۆ پارێزگاریکردن لەحەرەمی خێزان ولەبەر کەش و هەوای گەرم، بەرپەنجەرە زیاتر لە میسر باوبوو-دەکات.

ئەمە مانای وانییە کە ناو ماڵی هەژاران بە زەخرەفەو شتی جوان نەڕازێنراوەتەوەو زەخرەفەو جوانکاری تەنها تایبەت بوویێت بە خانووی دەوڵەمەندەکان وکۆشکی پاشاکان، بەڵکو جوانی بەشێکی ڕۆژانە بوو لە ژیانی تاکەکان و حەزێکی ڕاستەقینە بۆ هەڵبژاردن و وەرگرتنی شتە دروستکراوە جوانەکان هەبوو، بە چاوپۆشی لەو وەزیفەیەی کە ئەنجامیدەدات، تەنانەت قاپ و قاچاخی فەخفوری لە هەرێم و گوندەکانیش لە دەست ڕەنگینی و جوانی لە شێوەی گشتی ئەوانە بەدوور نەبوون، کە سادەییەکی دڵڕفێن لە زەخرەفەو نەخشەکانیدا بەدیدەکرێت.

بازاڕەکان بە ئەندازەی جیا جیا جۆرەها نەخش ونیگاری تێدا دەفرۆشران، بۆ نموونە گەر رووناککەرەوەکان لە شارەکانی رۆژهەڵات وەرگرین دەبینین جۆرەها چرا هەبوون، چرای ڕوونی فەخاری کە شووشە نەبوو،هەروەها چرای ڕوونی، کە لە شووشەی ئاوزێرکراو دروستکرابوو. لە نێوان ئەم دوو جۆرەشدا چرای ڕوونی قوڕین و شووشەی سادەو ڕووپۆشراو بە مینا، جۆرێکی تری چرا بوون.

گرنگە لێرەدا بە تێروتەسەلی ئاماژە بە جۆری روناککەرەوەکان لە ناومالّی شارە رۆژهەلاّتیەکان پێش هاتنی کارەبا بۆ ناوچەکە، بکەین. پێمان وایە خانمە نووسەر زۆر بەسەر ئەم بابەتە ناپرژێت تا مافی تەواوی خۆی پێبدات.

رووناکی بە شێوەیەکی گشتی پشتی بە چرای ڕوون و مۆم دەبەست. ئەم شارانە فانۆسی لەو جۆرەی ناسیوە کە دەپێچرێت، ئەم فانۆسە بریتیە لە قوماشێکی بەمۆم کراو و بە دەوری تالّێکی کانزاییەوە لوولدەدرێت. فانۆس سەرێك و بنکەیەکی ڕەقی مسیبوو، کە خەلّکی لە کاتی گەڕانی شەوانەیاندا بە دەستیانەوە دەگرت. بەلاّم چرا باوتر بوو، بە قندیل دەناسرێت و بریتیە لە قودویەکی شوشەیی و بنکەیەکی عەمبار ئاسا کە فتیلێکی لە پەمۆ دروستکراوی تێدایە، ئەم فتیلە بە دەوری چوکلّەیەکەوە دەئالّێنرێت. یەکەم جار ئاو دەکرێتە ناو عەمباری قودوەکە، پاشان ڕوونی بەسەردا دەکرێت. هەمیشە قندیلەکان لەسەر دەروازەی خانوو و مزگەوتەکان بە زنجیری کانزایی هەلّدەواسران، بەلاّم دیوی ناوەوەی مالّەکان، ئەوا بە مۆمی گەورە رووناك دەکرانەوە، کە لەسەر زەوی یا لەسەر هەلّگری دارین دادەنران، بەلاّم بۆ پاراستنی مەشخەلّەکە لە کوژانەوە بەهۆی ئەو شنە بایەی جارجارە لە مەشرەبیە دارینەکانی حەوشە کراوەکانەوە دەهاتنە مالّەو، قندیلێکی شوشەیی بەکاردەهات. شاردان وەسفی ژووری رووناك وبۆن ڕێژکراوی تاران لە کۆتایی سەدەی ١٧ دا دەکات:

... خەلّکی تاران زۆر کەم مۆم بەکاردەهێنن، بەلاّم بۆ چرا، لە جیاتی زەیت بەز (شحم) پاك وبێگەرد بەکاردێت وەك مۆم هیچ بۆنێکی نیە. جاری واش هەیە مۆم بەکاردەهێنن، لەنێوانیشیاندا مۆمی بۆندار، کە لە مۆم یا لە تێکەلّەیەك لەمۆم و ڕوونی قرفە و دەنکە قەنەفلّ، یانیش لە ڕوونی بۆنداری تر دروستکراون.. ))[٨]

ئـەو وەسـفانەی خانمـە نووسـەر لەبەشـی چـوارەمدا لـەبارەی ژیـانی خێزانیەوە کردویەتی، ئینجا ئەگەر ئـەو وەسـفە بـۆ خێزانـی دەوڵەمەنـد یـا هەژار بێت، یانیش بۆ خێزانی درێژەوە بوو لەرووی جیاکردنەوەی ژوورەکانی بەشی بژێوی، کە ژنان تێیدا دەژین و ژوورەکانی بەشیپێشوازی کە تایبەتـە بـە پیـاوان، ئـەوا ژیـانی رۆژانـەی خێـزان لـەناو ئـەم ماڵانـەدا وێکدەچـن. کاتەکانی نوێژکردن ئیشوکارەکانی رۆژانەی هـەموو چینەکانی کۆمەڵگـەی رێکخستوە، هەروەها نوێژی سپێدە سەرەتای بەیانی، بانگێکە بۆ سـەرەتای رۆژێکی نوێ و، نوێژی عیشا ئاگادارییەکە بۆ نزیکبوونەوە لە کۆتـایی ئـەو رۆژەو هاتنی کاتی خەوتن.

پاشان خانمە نووسەر لەم بەشەدا دەپرژێتـە سـەر کولتـووری گشـتی وئـەو فێرکردنانــەی کــەبۆ ئــەو کەســانەی لــە چــینە باڵاکـانی کۆمەڵگــەن، فەراهەمکراوە. هەروەها باسی ئەوە دەکات، کە چۆن کولتـووری ئـەم چینانە لە بـەردەوام لـە گۆڕاندایـە. لێـرەدا خانمـە نووسـەر پێـی وایـە ئـەم کولتـووره هاوڵاتیەکی نەرم ونیان لە هـەڵس وکـەوت و بـە ئـەخلاق بەرهـەم دەهێنێـت، بـەجۆرێك ئیسـلام دەروونـی پـەروەردە کـردوە و چوارچـێوەیەکی گشـتی بـە ئەخلاقی خەڵکی بەخشیوە، ئەمەش وایکـردوە کۆمەڵگـەی ئیسـلامی ببێتـە جێگای سەرسامبوون لەلایەن تەنانەت ئەو لێکۆڵەرانەش کە دژی دەوەستان:

((... میسـرییەکان بـەوە دەناسـرێنەوە کـە رێـزی گـەورەیان دەگـرن، هەروەها خۆشەویستی مندااڵەکان لەلایەن دایك و باوکەکانیانەوە یەکێکە لە فەزیلەتە سەرەکیەکانیان. کوڕان بـە پـیرۆزی ئاینییـەوە تەماشـای باوانیـان دەکەن و هەرگیز زات ناکەن لەبەردەمیان جگەرەبکێشـن و، رێگـا بـەخۆیان نادەن ئەو هەڵس وکەوتە بکەن، تەنیا دوای ژن هێنانیان نەبێت. لەدوای ئەم پرۆسەیە، ئینجا خۆیان بە پیاو دەزانن، لەگەڵ ئەمەشدا باوانیان سەرپەرشت و بەبەردەوامی جێگای خۆشەویستی وسۆزیانن... ))[٩]

بەڵام سەبارەت بە پرۆسەیفێربوون، ئەوا خانمە نووسەر باسی ئەوە دەکات، کە منداڵی چینە باڵاکان بەکوڕ و کچیانەوە بە ئەندازەیەکی باش دەیانخوێند و فێردەکران، بەڵام لەو ماوەیەدا خوێندن و فێرکردن بە شێوەیەکی گشتی و لەناو چینە هەژارەکان بەشێوەیەکی تایبەتی تا ڕادەیەکی زۆر بوونی نەبوو. کچان هەر ئەوەتە شتێکی زۆر کەم فێردەکران، بەڵام کوڕان هەندێ نووسین و خوێندنەوە فێردەکران، ئەویش لە ژێردەستی مامۆستایەك کە توانایەکی زانستی دیاریکراوی هەبوو. ئەو زانایانەی لەگەڵ داگیرکەری میسر هاتبوون ئەو وێنەیەمان بۆ دەگەڕێنەوە، بەڵام خانمە نووسەر چۆنیەتی خوێندن و فێرکردن لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا چارەگی یەکەمی سەدەی٢٠ کە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، دەخاتە ڕوو، وێنەکەش ئەوەیە کە لەم کتێبەدا باسیدەکات. وێنەی کچێکە کە فێرکردنێکی سەرەتایی لەخوێندنەوەی قورئان و شتێکی کەمیش لە بیرکاری وەردەگرێت.

((... هیچ شتێك دەنگە دەنگی لەو قوتابخانە گشتیەی کە لە میسر هەیە زیاتر نیە، بەجۆرێك منداڵان فێری نووسینی ئەلفوبێ و ووشەکان دەکرێن، لەهەمانکاتدا فێردەکرێن چۆن ئەو وشەو پیتانە دەربڕن. ئەمانە تەنیا خوێندنەوەو نووسین و لەبەرکردنی هەندێ بەشی قورئان فێردەبن. لەم سنوورە سادەیەی فێربووندا خوێندنی سەرەتاییان دەخوێند. قوتابییەکان بەدەنگێکی بەرز لەناو هەمان حەوشدا ئەو وانەیە دەڵێنەوە کە پێشتر وەریانگرتووە. لێرەوە دەتوانین بیرۆکەیەك لای خۆمان سەبارەت بەو دەنگە دەنگەی لەپۆل گوێ بیستی دەبین، دروستبکەین. لەم ڕووەوە مامۆستا دەبێت لەگەڵ ئەو دەنگە دەنگە ڕاهاتبێت تابتوانێت دان بەخۆیدا بگرێت، ئەمەو هەروەها لەگەڵ ئەو خووە باوەی هەر منداڵێك هەیەتی، وەك گۆڕانی ووتن لەکاتی وانە خوێندن یان لەکاتی خوێندنەوە، منداڵانی میسر لە کاتی ووتنەوەی وانەکان ڕاهاتبوون بەشێوەیەکی بەردەوام بەشی سەرەوەی لەشیان بجولێنن... ))[١٠].

لەگەڵ ئەوەی چەندین کتێبخانەی گشتی وەك پاشکۆی مزگەوت و تەکیەکانی ناو شار هەبوون، کەچی ژمارەی کتێب فرۆشان زۆر کەمبوو. بۆ نموونە ئێدواردلین باس دەکات گوایە هەواڵیان بۆ هێناوە بەبوونی تەنها شەش کتێب فرۆش لەقاهیرە، کە چەند ناونیشانێکی دیاریکراو لە کتێب دەفرۆشن، بەڵام گەر یەکێکیان کتێبێکی دانسقی دەست بکەوتابا، ئەوا بەناو ئەو کڕیارانەیدا دەسوڕێتەوە کە هەست دەکات گرنگی بە بابەتەکانی کتێبەکە دەدەن و زۆری پێناچێت دەیفرۆشێت.

لێرەدا گرنگە ئاماژە بکرێت بەوەی خوێندنی زانستە سروشتییەکان لەم سەردەمانەدا داتەپینی بەخۆیەوە بینیبوو، بایەخیان ئەوەندە نەبوو، ئەفسانەکان باڵی بەسەر بیروباوەڕی خەڵکی دا کێشابوو، بۆ نموونە لەو سەردەمەدا باوەڕێك لەبارەی گیانەوەری ئەفسانەیی وەك دێوەزمە بوونی هەبوو، ئەفسانەکە وا باسیدەکات، کە ئەو دێوەزمەیە جنۆکەیەکی خراپە و لەسەرشێوەی چەند ئاژەڵێکە و جارجارە شێوەی چەندین دێوی ترسناك وەردەگرێت، کە لەناو گۆرستان و کەلاوەکاندا دەژین و، خواردنیان تەرمی مردو و ئەو مرۆڤانەن کە بەهۆی بەدبەختیانەوە ڕێگایان دەکەوێتە سەر ڕێی ئەو دێوەزمانە، ئەوانیش دەیانکوژێن وگۆشتەکەیان دەخۆن.

بڕوابوون بە فاڵچیەتی و جادوویی پەرەی سەندبوو، تەنانەت وایلێهاتبوو جادوویی بە زانستێکی رۆحانی دادەنرا. ئینجا خەڵکی زۆر بەتوندی پەنایان بۆ ئەو فاڵ و فەرەجانە دەبرد، کە لەنێو خەڵکدا بە نووشتە و قەزمەنووشتە ناودەبرا. بۆیە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و، ناوی جنۆکە و فریشتەکان لەسەر کاغەزێك دەنووسراو لەسەرشێوەی سێگۆشە قەد دەکرا، پاشان لەناو قەزمەیەکی سەوز دەدورا و ژنان بە تاقی ژوورسەری منداڵەکانیانەوە هەڵدەواسی، خۆشیان لە باخەڵی خۆیان و پیاوانیش لەنێو جل و بەرگەکانیان و قۆڵی ڕاستیان هەڵیاندەگرت، یان دەیان شاردەوە، تەنانەت مەڕوماڵاتەکانیشیان

بەم شێوەیە چاودێریان لێدەکردن. شاردان لەبارەی ئەو شتانەی لە ئێران لە چارەگی کۆتایی سەدەی حەڤدە بینیویەتی،نووسیوویەتی:

((... لەبەشی باشووری کۆشک، ئاژەڵی درندە کە بۆ ڕاوکردن دانراون دەبینی، وەك شێرو پڵنگ و بەچکە شێرو ئاژەڵی تر، لە بەشێکی تری کۆشک چوارچەرخەی هندی تایبەت بەڕاو دەبینران، کە بەهۆی گای سپی سەرنج ڕاکێشەوە، ڕادەکێشران. هەروەها ئاژەڵی تری تایبەت بە شەڕکردن وەك، گامێش وگاو گورگ و بارهەڵگر هەبوون. هەریەکێك لەم ئاژەڵانە مل بەستێك بە ملیانەوە بەسترابوو، ئەم ملبەستە فاڵ و کاغەزی نووسراوی تێدابوو بۆ ئەوەی ئەو ئاژەڵانە بپارێزێت. موسڵمانەکان ئەم فاڵ و کاغەزە نووسراوانە نەك تەنها بە ملی ئاژەڵەکانیان، بەڵکو بە هەمان ئەندازە بەملی هاوسەرو منداڵەکانیشیانەوە دەکەن و لەسەر شتی بێ گیانیش هەڵیدەواسن... ))[11].

باشترین نووشتە لای ئەو تورکانەی لە چینی باڵابوون، کۆپیەکی بچووککراوەی قورئانی پیرۆز بوو، کە لەناو قەزمەیەکی بچووك و دووراو لەناو پارچەیەکی دروستکراو لە پێست یان مەخمەل و لەلایڕاستی لەش و، بە تاڵی ئاورێشمی لەسەر شانی ڕاست لوولدەدرێت و قایم دەکرێت. هەروەها ئێدوارد لین دەگێڕێتەوە، کە زۆر بەکەمی دەبینرا سەربازێکی تورکی پلە بەرز ئەو جۆرە نوشتەیەی بەقەدەوە نەبێت.

بەڵام ڕاڤەی کولتووری لەم جۆرە کۆمەڵگە شارنشینانەدا کارێکی ئاسان نیە. ئەوەتا چینی کۆمەڵایەتی یەك بەدوای یەك و پێکەوە بەستراو هەیە و، بە پێی ئەو یەك بەدوای یەکییەوە، کولتووری یەك بەدوای یەکیش دروست دەبن، ئەوەتا کولتووری خەڵکی عەوام، کولتووری بازرگانەکان، کولتووری کارمەندە بەرزەکانی سوڵتان، کولتووری زانایان و کولتووری چینی دەسەڵاتدار کە لەلایەن زانا سەربڕاردەکانەوە دانراوە، بوونیان هەیە. ئەم وردە کولتوورانە لە بۆشاییدا وەزیفەی خۆیان جێبەجێ ناکەن، بەڵکو بەو

شتانەی کە لە سەرەوە یان خوارەوەیان هەیە یان هاوشانیانن، کاریگەر دەبن. بە درێژایی هەموو سەدەکانی ئیسلام ڕەخنە و نارەزاییەك لەلایەن زانایانەوە هەیە تا دەگەیشتە ڕادەی یاخیبوون لە بەرامبەر کولتووری (بەبێیی) (الدونیة) نەك نارازیبوون سەبارەت بە چین، بەڵکو نارازیبوون بە کولتوورو بیروباوەرو و چۆنیەتی گوزارشت لێکردنی، بۆ نموونە وەکو چۆن لە نووسینەکانی هزرڤانەکانی سەردەمی ڕێنسانسی عەرەبی نوێ و بزوتنەوەی وەهابییەکان دەبینرێت.

## جل و بەرگ و خۆرازاندنەوەی کەسی

دوای ئەوە لەهەمان بەشدا خانمە نووسەر دەچێتە سەر باسی ئەو بابەتەی کە خۆی حەزی پێیەتی، ئەویش جل و بەرگ و جۆرەکانی پۆشاکە لە شارە جیاوازەکان و لای موسڵمانانی چینی باڵا، ئینجا زیاتر وەسفی جل وبەرگی ژنان دەکات. بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە دەتوانین زۆر بەئاسانی وێنەی جل و بەرگی هەر چینێك لە چینە کۆمەڵایەتیەکان و هەر شارستانیەتێك کە لەو ماوە زەمەنیەدا هەبووبێت، بکێشین. ئەویش بەهۆی ئەو وەسفە وورد و تێروتەسەلەی کە لەبارەی پۆشاك وجل وبەرگ لەشارە جیاوازەکانی ڕۆژهەڵات کراوە، ئەمە جگە لەو وێنەو شێوانەی لەلایەن گەڕیدەکانەوە بۆ ڕوونکردنەوە کێشراون، کە لەو قۆناغەدا بەو ناوچانەدا تێپەڕبوون.

خەڵکی ڕۆژهەڵات بەگشتی لەحەزی پۆشینی جل وبەرگی پان وپۆڕو درێژ هاوبەشن، ئینجا خەڵکی عەرەبی یان تورك یان فارس بن. ئەگەرچی شار و هەرێمە جیاجیاکانی ڕۆژهەڵات مۆرکی خۆجێیی خۆیان هەیە و لەوانیتر جیایان دەکاتەوە، هەروەك چۆن پایتەختەکان بە درێژایی چاخە جیاوازەکان سەلیقەی شمەك و جل و بەرگیان گۆڕاوە، بەهەمان شێوە تاکەکانی شارە گەورەکان و ئەو هەرێمانەی کە سورن لەسەر پەیڕەوکردنی سەلیقەی نەجیب زادەکانی پایتەخت،

لەم بارەوە گۆڕاون. هەروەها سەلیقەی گشتی ناوچەکە بەدرێژایی چاخەکان ڕقیان لە ڕەنگی ڕەش دەبێتەوە، کە بە ڕەنگی تازیەباری دادەنرێت و خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ڕەنگی ڕەش بە تایبەت فارسەکان نایپۆشن، چونکە پێیان وایە ڕەنگی بەدبەختیەو خەڵکی ڕقیان لێدەبێتەوە و حەز بە پۆشینی ناکەن.

((... بە ڕەنگی شەیتان ناوی دەبەن. هەموو ڕەنگێك لە هەموو تەمەنەکان بەبێ جیاوازی دەپۆشن، جگە لە ڕەش. وێنەیەکی دڵخۆشکارە کاتێك بە شەقام و شوێنە گشتیەکاندا تێپەردەبی خەڵکێکی زۆر بە جل وبەرگی ئاهەنگەوە دەردەکەون (وێنەی٧) و پۆشاکی بریسکەداری ئالتونی یان بریقە یان ڕەنگی ئاڵ و واڵا لەبەردەکەن... ))[١٢].

لەکاتێکدا چینی ناوداری کۆمەڵگە بەوە دەناسران کەجل وبەرگی قاد قاد و لەسەریەکیان لە بەردەکرد (وێنەی٨)، ئەوا خەڵکە عەوامەکە توانای ئەو هەموو خەرجە ماددییەیان نەبوو، یانیش لەبەر ئەوەبوو قەدە شمەکی زۆر دەبوە ڕێگر لەکاتی ڕاپەراندنی ئیش و کارەکانیان، بۆیە تەنیا بە شەرواڵ و قەمیسێك ئیکتفایان دەکرد، هەمیشە بۆ پارێزگاریکردن لە ماسولکەکانی پشت لەکاتی ڕاپەراندنی کارە قورسەکان پشتێنێکی پانیان لە پشتیان دەبەست (وێنەی٩). هەروەها ئەم پشتێنە بۆ هەڵگرتنی چەك و پارەو شتی لەم بابەتەش بەکاردەهات. لە تۆمارگەی داگیرکارە فەرەنسیەکانی سەر میسر دەخوێنینەوە:

((... پیاوان حەزدەکەن لەبەری پشتێنەکانیان خەنجەری گران بەهاو ڕازاوە بەگەوهەر هەڵگرن. پێگەو باڵا دەستی و خانەدانی مەمالیکەکان بە دانسقی کیفی خەنجەرەکانیاندا دەردەکەوت و دەوڵەمەندەکان حەزیان بە سبیلی جوان دەکرد. هەموو چینەکان بەبێ جیاوازی حەزیان دەکرد پەنجەکەڵەی دەستیان پڕ بکەن لە گوستیلەو، هەریەکەیان نرخی خۆی هەبوو و بەپێی چین و دەوڵەمەندی کەسەکە دەگۆڕا. ئەم گوستیلانە بە بەردی

بەهادار و گەوهەر جواندەکران. گوستیلەی زیوی پیاوان، ئالتونیش ژنان لەبەریان دەکرد. زۆر گرنگە سەرنجی خوێنەر ڕابکێشین بۆ ئەو لایەنەی کە جل و بەرگی پۆشتە (ئەوەی لەمەو پێش ووردەکاری تەواومان لەسەر هەریەشێکی خستە ڕوو) جل و بەرگی گەورە پیاوە دەوڵەمەندەکانە. کەچی چینی ڕەشۆك ئەم هەموو دەردەسەرییە ناکێشێت و شوێنی هەڵگرتنی جل وبەرگەکانیان لە سێ یان چوار پارچە جل تێپەر ناکات، ئەویش ئەو کاتە دەگۆڕدرێن کاتێك لەبەر کۆنبوون شمەکەکان دەدڕێن. جووتیاران چ پیاو چ ژن، کاتێك دەچنە کێڵگە نیمچە ڕووتن، بەڵام خزمەتکارەکان لە چینی هەژارو خەڵکی ڕەشوڕوتی ناوشار، ئەوا لەشیان بەهەندێ قوماشی کۆن و پارچەی پینەکراو دادەپۆشن... ))[١٣].

ڕەنگە مێزەر (کڵاو) لە نێوان هەرێم و پایتەختەکان زۆر ترین جیاوازی لە بەکارهێنانی بەدیبکرێت وبەپێی سەلیقەی گشتی و بە درێژایی چاخ و سەدە یەك لەدوای یەکەکان، زۆر ترین گۆڕانی بەسەردا بێت. مێزەر دەستنیشانی ئەو چینەی کە تاك ئینتیمای بۆ هەیە، دەکات. یان وەزیفەی گشتی تاك دەردەخات. (نیبۆر) لە کتێبەکەیدا گەشتێك بۆ میسر (١٧٦١-١٧٦٢) وەسف و وێنەی زۆر بەووردەکاری لەبارەی کڵاوی سەری پیاوان و سەرپۆشی ژنانی رۆژهەڵات لەنیوەی دووەمی سەدەی ١٨ دەخاتە ڕوو. لە وێدا ئاماژە بە کڵاوی جۆراو جۆر، وەزیفە، چینی کۆمەڵایەتی و توێژە ئایینییە جیاوازەکانی تورکیا، میسر و وڵاتی شام دەکات:

((... ئەم کڵاوە بۆ وەرگێڕەکان لە قوستەنتینە کاتێك بۆ سڵاوکردن لەسەری دەکەنەوە، نیشانەیەکی جیاکەرەوەیە، هەروەك چۆن ئەورووپییەکان بەکڵاوەکانیان سڵاو دەکەن. ئەم نەریتەش بەلای رۆژهەڵاتییەکانەوە جێگای سەرسوڕمانە، کە ئەوان تەنانەت لەبەردەم پاشا یان سوڵتانەکانیشیان سەری خۆیان ڕووت ناکەن))[١٤].

نیبۆر لە نووسینەکانیدا بەردەوام دەبێت و وەسفی دەکات کە چۆن پۆلیس و گەورە فەرمانبەرەکان لە قاهیرە جۆرێك لە کڵاو (قاوق) لەسەردەکرد کە لە کڵاوێکی گەورە دەچوو، ئینجا لێواری ئەو قاوقە پارچە تیلێکی باریکی تێدا ئاخێنراوە (وێنەی ١١). قاوق ووشەیەکی تورکییەو ئاماژەیە بەجۆرێك لە کڵاو. لە کاتێکدا فەرماندە ئنکشارییەکان[*] (وێنەی ١٢) جۆرێکی جیاوازی قاوقیان لەسەرکرد، بەڵام هەموو ئنکشارییەکان لە میسر مێزەری ڕەشیان لەسەر دەکرد، کەچی مێزەری سەربازە ئنکشارییەکان لە قوستەنتینییە ((... لەکاتی ئاهەنگەکان و کاتێك سوڵتان بەسوار ئەسپەکەی بۆ مزگەوت و لەکاتی ڕێو ڕەسمە فەرمییەکانی تردا، بەرێدەکەوێت، ئەوا فەرماندە ئنکشارییەکان لەم بۆنانەدا جۆرێك کڵاویان لەسەر دەکرد کە پەڕەموچێکی گەورەو جوان لە پێشەوە و لە دواوە پێیدا شۆڕ دەبێتە... ))[١٥].

دوای ئەوە نیبۆر وەسفی کڵاوی سەربازی بەشەکانی تر دەکات. دەریاوانەکانی هێزی دەریایی سوڵتان مێزەرەکانیان بەشێوەیەکی زۆر ڕێك و سەرنج ڕاکێش دەبەستن. جل وبەرگی کورت لەبەردەکەن وەك ڕەشۆکە یۆنانییەکانی دوورگەی ئەرخەبیل. بەڵام باخەوانەکان، ئەمانە پاسەوانی (بابولعالی)ن و سەرپەرشتی هاوینە هەوار و باخی تایبەت بە سوڵتان دەکەن، کڵاوی باخەوانی لەسەردەنێن کە بریتییە لە مێزەرێکی داپۆشراو بە قوماشێکی ئەستوری سوور (وێنەی ١٣). چێشت لێنەرانی سوڵتان پێشتر ئەم جۆرە کڵاوانەیان لەسەر دەکرد، پاشان مێزەری لە لباد دروستکراویان پێدان،

---

*- ئینکشاری واتە سوپای نوێ، دەستەیەکی سەربازی پیادەڕەوی عوسمانییەکانبوون، کە سەربازگە، ڕێکخستن، نیشانە و پێگەیەکی تایبەتییان هەبوو. گەورەترین، بەهێزترین و دڕندەترین سوپای پیادەڕەوی عوسمانییەکانبوون. مێژوونووسان سەرەتای دروستکردنی سوپای ئینکشاری بۆ سەردەمی ئورخانی دووەم لە (٧٢٤ك/١٣٢٤ز) دەگەڕێننەوە. و. کوردی

که لەوەی پێشتر بچووکتر بوو. هەروەها خزمەتکاری ئەفەندییەکان کڵاوی تایبەتیان لەسەردەکرد، کە بریتیە لە مێزەرێکی داپۆشراو بە پێستی مەڕ.

پاشان نیبۆر چۆنیەتی ناسینەوەی چینە کۆمەڵایەتیەکان لە ڕێگەی ڕەنگی کڵاوەکانیانەوە ڕووندەکاتەوە. لە ئەستەنبۆل پیاو ماقولانی تورك قوماشێکی زەردیان بە کڵاوەکانیانەوە دەئاڵاند، بەڵام خەڵکی ڕەشۆك دەستەسرێکی ڕەنگ سپیان بە مێزەرەکانیانەوە دەئاڵاند، هەرچی نەجیب زادەکانن کە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (د. خ) دەتوانرێت هەمیشە بەهۆی ئەو دەستەسرە سەوزەی کە لە سەریانی دەئاڵێنن، بناسرێنەوە، جا دەشێ ئەوەی لەسەریدەنێن قاوق یان کڵاو بێت. هەروەها زانایانی ئاینی لە هەر شارێك مێزەری جیاوازیان لەسەر دەکرد، لە شارە تورکیەکان موفتی شارەکە مێزەری لەسەردەکرد، لەکاتێکدا چاوساغانی پیاوە ئاینیەکان لە تورکیا جل و بەرگی هاوشێوەی جل و بەرگی خەڵکە ڕەشو ڕوتەکەیان لەبەردەکرد، تەنها ئەوە نەبێت کە لەسەر ئەو جل وبەرگەیانەوە- وەك پیاوە ئاینییە عەرەبیەکان- کەوایەکی باڵاپۆشیان لەبەر دەکرد. لەقاهیرە زانایان مێزەری شێوە جیاوازیان لەسەردەکرد، بەڵام دەروێشەکان لە تایەفە جیاجیاکان کڵاوی دروستکراو لە جۆخی خۆڵەمێشییان لەسەر دەکرد. ئەوانەش کە لە تەکیەکان بوون لە دەورەی ئەو کڵاوە دەستەسرێکیان دەئاڵاند[١٦].

بەڵام خەڵکە ناموسڵمانەکانی وەك جوولەکە و کرستیانەکان، هەمان جل وبەرگی موسڵمانەکانیان لەبەردەکرد، هیچ ڕەنگێکیان لێ قەدەغە نەدەکرا کە لە بەریکەن تەنها سەوز نەبێت، کە تایبەتبوو بە نەجیب زادەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی. بەڵام جوولەکە و کریستیانەکانی قوستەنتینیە ڕێیان پێنەدەدرا ڕەنگە زۆر زەقەکان بۆ جل وبەرگ و بۆیەی خانووەکانیان بەکاربهێنن[١٧].

هەروەها کڵاوی ئەو ئەوروپیانەی لە هەرێمە ئیسلامیەکان پێش سەدەی ١٨ نیشتەجێبوون، لەو کڵاوە دەچوو کە موسوڵمانەکان لەسەریان دەنا، تەنها بە بەستنی شریتێکی باریکی سوور جیادەکرانەوە کە ئەوروپین. ئەم ئەوروپییانە لەناو ماڵەکانیاندا کڵاوێکی (طربوش) گەورەیان لەسەردەناو دەستەسرێکی گەورە، یان پارچە شاشێکیان لە دەور دەئاڵاند یانیش هەر کڵاوێکی ئاساییان لەسەردەنا. هەندێ لە ئیتاڵییەکان، ئەوانەی ماوەیەکی زۆریان لە میسر بەسەر بردبوو کڵاوی مۆدە کۆنیان لەسەر دەنا کە ڕەنگی خاکی بوو و لەسەر شێوەی بەلەم لوولدەدراو هەر بە بەلەمیش ناودەبرا، ئینجا ئەم کڵاوانەیان لە شەقام و ناو ماڵەکانیشدا لەسەردەنا.[١٨]

کریستیانەکان لە (قەیسەری) نیشانەیەکی شینیان بە کڵاوەکانیانەوە دەکرد تاکو کارمەندی باج وەرگر کاتێك باج وەردەگرن بیانناسنەوە. لە میسر کرستیانەکان هەر هەموویان ـ ئەقباتەکانیش ـ کڵاو یان قاوقای دروستکراو لە قوماشی تێلی شین کە خەتی سپی پێدا هاتووە لەسەردەنا. بەهەمان شێوە یەسوعیەکانیش لە میسر ئەو قاوقەو، هەمان جل وبەرگی کرستیانەکانی وولات لەبەردەکەن. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەرمەنە فارسەکانی دانیشتوی ئەنادۆڵ مێزەری قوماش سوور لەسەر دەکەن، کە لێوارێکی ڕەشی هەیە و بە نیشانەیەکی جیاکەرەوەی خۆیانی دادەنێن. بەڵام کرستیانەکانی حەلەب و دیمەشق قاوقی داپۆشراو بە قوماشی سوور لەسەر دەکەن و، لێواری خوارەوەی بە شریتێکی خەت خەتی دروستکراو لە قوماشی تێل دەئاڵێنن.[١٩]

پیاوە ئاینییە کریستیانە یۆنانیەکان کڵاوێك کە زۆربەی جار لە جۆخی ڕەش دروستدەکرێت، لەسەردەنێن. ئەمانە قژیان دەهێڵنەوەو درێژی دەکەن. بەڵام قەشەکانی ئەرمەنە ڕۆژهەڵاتیەکان سەریان دەتاشن. زۆر زەحمەتبوو شێوەی قاوقی جوولەکەی میسری لە قاوقی کرستیانی میسری جیابکرێتەوە. تەنیا جیاوازی نێوانیان ئەوەبوو، کرستیانەکان لە قوماشی

تێلی شینی خەت سپی دروستیاندەکرد، لە بەرامبەردا جوولەکەکان بەشێوەیەکی گشتی لە قوماشی تێلی ڕەنگ تێر دروستیاندەکرد. هەروەها جوولەکەکان ڕاهاتبوون لەسەرئەوەی ڕیشیان بێڵنەوە، بەوپێیەی کە ئەوان لەنەوەی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) ن. [٢٠]

ئەوەی شایانی باسە پیاوە ئاینییە موسوڵمانەکان لە وولاتی فارس، ڕیشوو سمێڵیان لەسەر هەموو دەموو چاویان دەهێشتەوە و گەڕیدە (شاردان) تێبینیکردووە کە نەیاندەهێشت زۆر درێژ بێت:

((... موی دەموچاویان تەنها پێستەکەی دادەپۆشی، بەڵام پیاوە ئاینییەکان لێدەگەڕان تا درێژتر بێت. نەریت وابوو کە ڕیشیان لەسەر چەناگە لەدەست گیربێت و، ئەوەی لەو دەستگیرە درێژتر بایە دەیانبڕی... )). بەڵام سەرباز و سوارچاکان، ئەوا لێدەگەڕان سمێڵیان درێژ بێت تا ئەو ئەندازەیەی بتوانرێت لەپشت گوێیەکانیانەوە بەیەکەوە بگەیەنرێت (وێنەی١٤). شاردان دەڵێت: ((... شا عەباسی مەزن سمێڵ درێژکردنی بەجوانی دەمووچاو دادەنا، هەروەها پێگەی سەربازەکانی بەپێی درێژی سمێڵەکانیان کەم و زیاد دەکرد... )). [٢١] سەلیقەی باوی نێو فارسەکان وابوو کە حەزیان بە ڕیشی درێژ نەدەکرد وەك ئەوەی تورکەکان لە قوستەنتینیە دەیانکرد. [٢٢]

بەهەمان شێوە سەرپۆشی ژنە ڕۆژهەڵاتیەکانیش لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەبوو. لە دیاربەکر ژنە کریستیان و جوولەکەکان تاس ـ شێوەی بازنەیەکی دروستکراو لە زیو یان زێڕ لە تەوقی سەر دادەنرێت ـ یان لەسەر دەنا کە لە مسی زەرد یان زیوی نەخشێنراو پێکدەهات، بەڵام ژنی ناوچەی دروز تاسی سەرنج ڕاکێشی دروستکراو لە مسی زەرد یان زیوی نەخشێنراویان لەسەر دەکرد. هەروەها

کچی جووتیارەکانیش بەهەمان شێوە تاسیان لەسەردەکرد، بەڵام لە پارچەی مقەبا دروستکرا بوو.[٢٣] ڕێکخستن و جوانکاری سەرو شێوەی ژنان لە وڵاتی فارس لەناو هەموو شارەکانی ڕۆژهەڵات جیاوازییان هەبوو. سەرو شێوەیان دەڕازاندەوە:

((... بە ئەڵقەیەك لەسەر شێوەی زەنگوڵ زەنگوڵی دروستکراو لە گەوهەر، کە لە نێو لۆچی چەفتە دادەنران و تا سەر نێو چاوان شۆڕدەبوونەوە، یان لە بری زێڕو گەوهەر سەرو شێوەیان بە قەفەی گرێدراو یانیش بە گوڵ و گوڵزار کە لە چەفتەکەیانەوە دەهاتە خوارەوە تا دەگەیشتە نێوان چاوانیان، یان بە ـ ژێر چەنە ـ تاڵە گەوهەریان لە بناگوێ بە قولاب چەسپدەکرد و ڕایەڵیاندەکرد بە ژێر چەناگەیانەوە (وێنەی١٥)...[٢٤]

هەروەها لەناو فارسەکاندا قژی ڕەشی عەرەبی و بڕۆی پان و درێژی پێکەوە بەستراو لە نێوان چاوەکان حەز پێکراو بوو (وێنەی١٦)، تەنانەت ئەگەر ژنەکان ئەو سیفاتە جوانکارییانەیان نەبوایە ئەوا برۆکانیان بە خەنەو کوتان پان و درێژ دەکردەوە.

### لیستی خواردەمەنی

خانمە نووسەر لە دوایین بەشدا جۆرەکانی خواردن هەژمار دەکات و، جیاوازی ژمارەی ژەمەکان و خستنە ڕووی جۆرەکانی خواردەمەنیە باوەکان لای چینە باڵاکان لە شارەکانی ڕۆژهەڵات باس دەکات. بەڵام ژمارەی ژەمەکان بەپێیی کەش و هەوای ناوچەکە جیاوازی هەبوو، بە جۆرێك لەو ناوچانەی بەشێوەیەکی ڕێژەیی ساردن، وەك تورکیا و وڵاتی فارس، ئەوا دانیشتوان سێ ژەمەخواردنی کوڵاو و گەرمیان دەخوارد، لەکاتێکدا لە

ناوچە گەرمەکان تەنها دوو ژەم خواردن دەخورا. ژەمی بەیانیان زۆربەی جار لە خواردنەوەی هەندێ قاوەو پارچە نانێك لەگەڵ کێشانی جگەرە تێنەدەپەڕی. ئەم وێنەیە لە ڕێگەی خوێندنەوەی تێبینیەکانی هەریەك لەگەڕیدە شاردان لە ئێران و تورکیا و لین لە میسر دەردەکەوێت. شاردان لەبارەی هۆکاری دروستبوونی ئەم دیاردەیە دەڵێت:

((... سەرما، گەرمی سروشتی لە ناوەوەی لەش دەهێڵێتەوە و گەدەیەکی باش ئامادە دەکات، وادەکات کەسەکە خواردنی زیاتر بخوات. ئالێرەوەیە دەبینین تورکەکان ڕێژەیەکی زۆر گۆشت دەخۆن، زێتر لەوەش تورکەکان بەهۆی ئەو کەش و هەوایەی کە هەیانە جموجۆڵیان زیاترەو لە وەرزشدا خۆیان ماندوو دەکەن، جا وەرزشەکە بە پێ یان بەهۆی سوار چاکییەوە بێت. ئەمە سەبارەت بە فارسەکان جیاوازە گەرمی و وشکی هەواکەیان وای لێکردوون سست بن... )). [٢٥]

بەلام ژەمەخواردنی نیوەڕۆ لای فارسەکان، لە نێوان کاتژمێر ١٠-١٢دەخورێت و بە (حازری) ناو دەبرێت، ئەم دەربڕینە عەرەبیە، ئاماژەیە بە ژەمەخواردنی نیوەڕۆ و لەو شتانەی کە لە چێشتخانەی ماڵ دەستدەکەون و پێویستی بە ئامادەکردن و خەریك بوونی زۆر نییە، پێکدێت. هەمیشە لە میوەجاتی وەرزیی وەك شوتی (شفتی)، کە بە درێژایی ساڵ هەیە، یان ترێ کە بۆ ماوەی ٦ مانگ لە ساڵێکدا دەستدەکەوێت، لەگەڵ ئەمانەشدا شیرو بەرهەمەکانی و شیرنەمەنییەکان (المکسرات) پێکدێت (وێنەی ١٧):

((... بەیانیان کە لەخەو هەڵدەستن، قاوەکەیان دەخۆنەوەو هەندێکیان چەند پارچە نانێك لەگەڵیدا دەخوات. ئینجا کە ڕۆژەکانیان لە درێژیدا جیاوازیان نییە وەکو لای خۆمان، ئەوا بەهەمان کات و سات بەردەوامدەبن، بەجۆرێك بە درێژایی ساڵ لە کاتژمێر ٩ یان ١٠ی شەو دەخەون و لەگەڵ گزنگی هەتاو هەڵدەستن... )). [٢٦]

شـاردان جۆرەكـانی گۆشـت كـە لـەلای خـەڵكی وولآتـی فـارس حـەزی پێدەكرێت، دەژمێرێت، لەم بارەیەوە دەڵێت:

((... ئەو گۆشتەی هەمیشە لە خواردەمەنیـدا بەكاریـدەهێنن گۆشـتی ئاژەڵ ـمەڕو بزنـ مریشكە. هەروەها گۆشتی كۆترو ماسـیش بـەكاردەهێنن. هـەژارەكان لـە ناوچـە زۆر سـاردەكان و لـە زسـتاندا گۆشـتی ڕەشـە وولآخ دەخۆن، بەڵام بەشێكی زۆر كەمی لێ بەكاردەهێنن تا ئەو ڕادەیەی پێویست ناكات ئاماژەی پێبكرێت. هەروەها دەوڵەمەندەكان لە وولآتی فارس زۆر بە دەگمـەن نـاو سـك و سـەروپێ یئـاژەڵ لێـدەنێن كـە لەگـەڵ سـەلیقەیاندا ناگونجێـت. بـەڵام خـەڵكی ڕەشـو ڕووت تـەنیا ئەوانـە دەخـۆن و، لـەو چێشتخانانە دەیكڕن كە تەنیا ئەو خواردنانە دەفرۆشن... ))[٢٧].

ئـەم سـادەییە لـە ئامـادەكردنی خواردەمـەنی، بەهـەمان شـێوە لـە خـواردنی چـینی كرێكـارانی میسـر تێبینـی دەكـەین، لەگـەڵ ئـەوەی میسرییەكان حەز بە گۆشـتی ئـاژەڵ دەكـەن، بـەڵام چـینی هـەژار ناتوانێت هەمیشە ئەم حەزەی دەستەبەرببێت، تەنیا ڕۆژی بۆنە تایبەتییەكان نەبێت، كەچی ڕۆژەكانی تری ساڵ لەسەر سەوزەی تـازەو ماسـی سـوێركراو و ڕەگـی ڕووەك و پاقلەمـەنی و میوەجـات دەژێت. لـە كتێبـی (وەسـفی میسـر)دا، وەسفی ئەو جۆرە خواردنانەی كـە خـەڵكی ڕەشـۆك دەیخۆن و، ئامـاژە بـە ڕازیبوون و ئیكتفاكردنیان بە بەشێكی كەم، دەكات. ئەگەرچی كێڵگەكانیان خێرو بەرەكەتێكی زۆر بەرهەم دەهێنێت:

((... لەگـەڵ ئـەوەی خـاكی میسـر گـەنم بـە ئەندازەیـەكی زۆر بەرهەمدەهێنێت و جۆری گەنمەكەی لە جۆرە زۆر باشەكانە و نرخی زۆر لە و نرخەی كە لـە ئـەوروپا هەیـە كـەمترە، كەچـی گـەنم خـواردنێكی سـەرەكی زۆربەی دانیشتوان پێكناهێنێت، هەروەك چۆن لە ناوچـەیتردا بەدیـدەكرێت. جوتیارو خەڵكە كەم دەرامەتەكە هەر لە بنەڕەتەوە ـ كە دەشـێ پاڵنـەرێكی

ئـابووریش بێـت  ـ لـە ژەمەکانـدا نـان بەخواردنـەوە نـاخۆن. لـە لای دەوڵەمەنـدەکان خـواردنی نـان، یەکێکـە لـە مەسـەلەکانی خۆشـگوزەرانی، کەچی هەژارەکان بۆ ئەوەی ژەمێکی تایبەت بخۆن سـەوزەو میـوە، کـە لـە هەموو وەرزەکانی ساڵ دەچێنرێت بۆ خۆیان ئامادەدەکەن. لە بری نان چینی هەژار ئەمانە دەخۆن:

(گێزەر، بامیە، باینجان، خەیار، شـەمامە و شـوتی. هـەروەها لەگـەڵ ئەمانەشدا گەنمەشامی و نۆك دەخۆن. لە قرچە گـەرمای هاوینیشـدا خـەڵکی زۆر بە پەرۆشەوە خەیارو پیازی لە سرکەکراو و چەوەندەر دەخـۆن. ئـەم جـۆرە خواردنە هەرزانانە، دەست فرۆشەکان لە سەر شەقام و نـاو گۆڕەپانـەکان و لـە شـوێنە گشـتیەکانی ڕۆژانـی جـەژن دەیـان فرۆشـن. پێویسـتدەکات لـەبارەی چـۆنیەتی ئامـادەکردنی ئـەم خواردەمەنیانـە چـەند قسـەیەك بکـەین، کـە ڕێگایەکی زۆر ئاسـانە و تێچـوونی زۆر کەمـە. چێشـت لێنـەرە میللیـەکان ـ ئەگەر ئەم نـاو لێنانـەمان بۆیـان لـە جێگـای خـۆی بێـت ـ مەنجـەڵ و قـازانی فەخفوری قەبارە گەورەیان هەیە و سێ چارەگی ئەو قازانە پڕ دەکەن لە ڕووەکە پاقلەییەکان، کە لە ناو ئاودا خوسێنراون، ئەم مەنجەڵانـە بـە زمـانی خـەڵکی وولاتەکە بە مـەنجەڵ یان قازانی چێشت لێنان ناو دەبرێت. ئینجا دوای ئـەوەی قازانەکە بەم شێوەیە پڕدەکرێت، سەرەکەی یـان دەرکەکـەی تـەواو دادەخرێـت بەهۆی لیمۆی نیلی و گڵە سەر، پاشان لەناو پشکۆی حەمامە گشتیەکان نغرۆ دەکرێت تا ٥ ـ ٦ کاتژمێر ئاوا دەمێنێتەوە، دواتر کە خواردنەکە تەواو کـولاّ ئامادەدەبێت بۆ فرۆشتن و خەڵکەکەش دەیکڕن... ))[٢٨]. ئێـدوارد ولیـام لـین [٢٩] وەسفێکی تێرو تەسەل لەبارەی ئەدەبی باو لە ڕێکخستنی خوانی ناخواردن و باوبوونی جگەرەکێشان لەناو چینی بالاّ، هەروەها چۆن زۆربەی میسرییـەکان مەیلیان لەوەیە کە پێش نیوەڕۆ هیچ شتێك نەخۆن تەنها قاوەی تاڵ و جگـەرە نەبێت، دەخاتە ڕوو (وێنەی ١٨).

هــەروەها ئــەوەش باســدەكات كــە خێزانــە هــەژارەكان ئەوانــەی كەمدەرامەتن (دەقە) دەخۆن، كە هەمیشە لە بیبەر، زەعتـەر، پونگـە یـان زەردەچۆ و هەندێك تۆی كەرەوز، دارچین، كونجی و نۆك پێكهاتووە و، پاشان پارچە نانی تێ دەگوشرێت.

لــە سەرگوزەشــتەی گەڕیدەكانــدا تێبینــی بــەربلاوی جگەرەكێشــان (وێنــەی١٩) لــەنێو پیــاوان، ژنــان و لــەناو هــەموو چــینەكانی كۆمەڵگــە دەكرێت. ئەم شتە لەگەڵ دۆزینەوەی جیهانی نوێدا خۆی خزاندە نێو جیهانی كۆن، بەخێراییەكی زۆر بڵاوبۆوەو بـوو بـە نـەریتێكی حـەز لێكـراو لەلایـەن پیاوان و ژنانی جیهانی كۆن، بە تایبەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی دوور. جگەرە لەگەڵ سەرەتاكانی سەدەی ١٧ هاتە نـاو ڕۆژهەڵاتـەوە. واتـە دوای چەند ساڵێكی كەم، پاش ئەوەی ئەوروپا وەك كاڵایـەكی بازرگـانی لـە هەردوو ئەمریكاوە وەبەریهێنا. مـوحبی لـە كتێبەكەیـدا (خلاصـة الاثـر في أعيان القرن الحادي عشر ١١):

((... ووتم دەركــەوتنی (تنبــاك) كـە لـە ڕۆژئــاوا، حیجـاز، یەمــەن و حەزرەمەوت، بە جگەرە و توتن دەوترێت. لە ساڵی دوانزە هەزار بوو (واتـە ١٦٠٣ــ ١٦٠٤ ). هـەروەها لـە دەسـت نووسـی هەنـدێ لـە مەكییـەكان بینیوومە. بەڵام سەبارەت بە دەركەوتنی لە وولاتی شام تەواو نایزانم، بـەڵام لەم مێژووە نزیكە... ))[٣٠].

هەروەها ئەوەش باسدەكات كە خێزانە هەژارەكان ئەوانەی كـەم دەرامــەتن (دەقە) دەخۆن كە هەمیشــە لـە بیبـەر، زەعتــەر، پونگـە، زەردەچـۆ و هەنـدێك كەرەوز، دارچین، قەیسی و نۆك پێكهاتووە و پاشان پارچە نانی تێ دەگوشرێت.

لەگەڵ ئەوەی زانایانی ئیسـلام مشـتوومڕێكی زۆریـان لەسـەر ڕەوایـی بەكارهێنانی جگەرە كردوە، ئەوا بەشێوەیەكی زۆر خێرا لە نێو هەموو چین و ڕەگـەزەكانی كۆمەڵگـە بڵاوبـۆوە. جگـەرە بـەهۆی (گلیـۆن)، كـە بـە دار

جگەرە (وێنەی٢٠) یان نەرگیلە یان شیشە ناودەبرا، دەکێشرا (وێنەی٢١). توتنی حەزلێکراو، توتنی ئەسفەهانی یان هی لازقیە بوو، بەتایبەتی ئەوەی لە چیاکان دەچێنرێت.

## نەریتەکان لە رۆژهەڵات بە ئاسانی لەناو ناچن

بەشی پێنجەم و کۆتایی باس لە رێو رەسمی میوانداری وپێشوازی و کات بەسەربردن لە حەمامە گشتیەکان، باخەکان، مەزارگە ئاینییەکان، پاشان باس لە رێورەسمەکانی ئاهەنگ گێران بە بۆنەی لە دایکبوون، سونەتکردن و ژن و ژنخوازی دەکات. ئینجا بە رێورەسمی تەرم ناشتن و چوونە دنیای دوایی و جەژنە ئیسلامیەکان کۆتایی پێدێنێت. تێبینیدەکرێت کە داب و نەریتەکان بەرگەی لەناو چوون دەگرن، تەنانەت وا دەردەکەوێت کە کات لە رۆژهەڵات وەستاوە. بۆ نمونە هەرێمەکان پارێزگاریان لە زۆرێك لە جەژنەکانی بت پەرستی کردووە، ئەوەتا لە میسر پارێزگاری لە ئاهەنگگێران بە بۆنەی جەژنی وەفاداری بۆ نیل کراوە. ئەم کۆمەڵگەیانە لە پاش ئیسلامبونیان ئەو بۆنانەیان بە رەنگی ئیسلامی رەنگ کردووە و،ئەو رێورەسمانە هەروەکو خۆیان بە درێژایی سەدە ناوەراستەکان تا سەرەتای سەدەی نوێش ماون و نەگۆراون. مقریزی (کە لە ٨٤٥ ك. کۆچی دوایی کردوە/ ١٤٤١ز) لە پلانەکانیقاهیرە وەسفێکی زۆر سەرنج راکێش دەربارەی رێورەسمەکانی ئاهەنگگێرانی خەڵکیقاهیرە بە بۆنەی جەژنی وەفاداری بۆ نیل لە سەدەی ٦ی ك /١٢ی ز و لەسەردەمی فاتمییەکان دەکات، تەنانەت چەند لاپەرەیەك بۆ ئەم وەسفە تەرخان دەکات. تێیدا ئەم چەند شتە وەردەگرین کە دەڵێت:

((... کوری مەئمون لەساڵی ٥١٦ك گوتی: لەو کاتەی دەریای نیل بۆ بەرزایی ١٦ باڵ بەرز بۆوە (خەلیفە) فەرمانی دەرکرد بە دەرکردنی کەژاوە و

ڕەشماڵی گەورە، کە بە قاتول ناودەبرێت و زۆرگەورەیە لە ٤ ڕاڕەو و ٤ هۆڵی دەرەکی کە لە هۆڵی گەورە جیادەبوونەوە، پێکدێت. گوتی: ئامرازو کەرەستەکانی وەرزی کردنەوەی کەنداو گەیشتن، ئەمانە ئەو شتانەن کە تایبەتن بە خەلیفەو براکەی و هەندێ لە نەجیب زادەکان و وەزیرەکانی. ئەو ڕۆژە (١٠٠٠) بەلەم ـ قرقورـ لەناو دەریا دەبن و پڕن لە خەڵك، کە بە وەفاداری نیل و تەماشاکردنی خەلیفە خۆشحاڵن. دیمەنێك هەیە پێی دەڵێن (سەکەرە) وێنەی دانیشتنی خەلیفەیە لەو ڕۆژە بۆ کردنەوەی کەنداو، سەرکارەکان و میرەکانی دەریاوانی لە دەوری ئەو ڕەشماڵە گەورەیە ڕەشماڵی تر دادەمەزرێنن، ئینجا ـ وەزیرەکان ـ بە پێی پێگەیان، ڕەشماڵەکانیان لە ڕەشماڵی خەلیفە نزیك دەکەنەوە. ئەگەر ڕوویدات و خەلیفە سووربێت لەسەر سواربوون، لە سێیەم ڕۆژ، ڕۆژی خولقاندن یان ڕۆژی چوارەم هەموو ئەوانەی لەوێدا کاردەکەن ئامێری ڕێوڕەسمەکانیان دەردەهێنن، بە پێی نەریتیان (٤٠) زووڕنایان دەرهێنا: کە (١٠) دانەیان لە زێڕو (٣٠) دانەیان لە زیو بوون. سەرنشینی کەشتیەکان زوڕنا زێڕینەکان و خاوەن زوڕنا زیوینەکان کە لە پیادەکان بوون، دەیانژەنی. هەروەها تەپڵی گەورە هەبوون، کە شوێنی دارەکەی زیوی و (١٠) دانە بوون. کە وەزیر هاتە بەر دەروازەی کۆشك، خەلیفە بەشێوەیەکی شکۆدارو ڕێزەوە هاتە دەرەوە. لەو ڕۆژەدا سەربازەکان سوارچاك و پیادەڕەوەکانیان دوو ئەوەندە کرد، شمەکی خەلیفە لە ژێر سەیوانەکە لەگەڵ شیر و تیر و قەڵغانیا دەردەکەوێت. کەشتیە گەورەو زەبەلاحەکە بەرەو قاهیرە بەرێدەکەوێت، لەوێدا قازی قەزاوەت و دەم ڕاست و گەواهیدەرەکان لە بەردەم دەروازەی مزگەوت دانیشتوون (مزگەوتی ئیبن تۆلۆن)، کاتێك گەیشت و ئەوانیش دەچنە ناو کەشتیەکان، ئەوا خەلیفە دەوەستێت و سڵاو لە قازی دەکات. وەکو نەریت وەزیر پێش (خەلیفە) ئامادەیە بۆ ئەوەی خزمەتی بکات و لە ژێر دەستەکانیەوە ئەو بە پیادە بەرەو دەروازەی ڕەشماڵەکە دەچێت ـ

خەلیفە ـ بەرەو جێگای پاشا دەچێت و، دادەبەزێت و لە شوێنی خۆی کە بۆی دیاریکراوە دادەنیشێت و مامۆستا و میرەکان لە دەوری دادەنیشن. هەر ئەو کورسیە بۆ وەزیر تەرخاندەکرێت کە پێوەی هەڵگیراوەو هاتووەتە ژوورەوە، جا ئەوانەی پێگەی ئیدارییان هەیە لەلای شوێنی خەوتنی پاشاوە ڕادەوەستن. قورئان خوێنەکانیش قورئان بۆ ماوەی کاتژمێرێك دەخوێنن، کە خوێندنەوەکەیان تەواو کرد دەرگاوان ڕێگا بە شاعیرەکان دەدات کە لە ڕێگەی شیعرەکانیانەوە بۆ خزمەتکردنی ئەو ڕۆژە خۆیان ئامادە بکەن، ئینجا فەرمانیان بەسەردادەکرێت کە یەك یەك بێنەپێشەوە. ژەمە خواردەمەنیەکی تایبەت بۆ قازی قەزاوەت و گەواهیدەرەکان دەبرێت بێ ئەوەی پەیکەریان بۆ بنێردرێت، کە ئەمە لە ڕووی شەرعەوە ڕێگای پێ نادرێت. هەروەها بۆ هەر میرێك و لە ڕەشماڵەکەیدا ژەمە خواردنێك و سینیەك پەیکەریان بۆ دەبرێت. ئینجا بەو هۆیەوە خواردەمەنیەکی زۆر دەچێت بۆ خەڵکەکە. ئەم حاڵەتە ئاوا دەمێنێتەوە تا بانگی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر، ئەگەر بانگی دا ئەوە خەلیفە نوێژدەکات و سەردەکەوێتە کەشتیەکە و هەموو سەرنشینەکان ئامادە دەبن و چاوەڕێی سەرکەوتنی خەلیفە دەکەن تا ئەوانیش لەدوایەوە سەرکەون). [31]

ڕێوڕەسمی ئاهەنگ بە بۆنەی ئەم جەژنە، وەکو جەژنەکانی تر جێگیرەو هەروەك لە سەدەکانی ناوەڕاست پەیڕەو دەکرا هەمان شێوازی هەیە. لە کۆتاییەکانی سەدەی ۱۸ و سەرەتای ۱۹ زانایانی فەرەنسی، کە لەگەڵ داگیرکاری فەرەنسی هاتبوون، وەسفێکی وێکچوو لەگەڵ ئەوەی کە لە سەردەمی مقریزی هەبوو، دەکەن، وەك ئەوە وایە زەمەن ئەوەندە سەدەیە پێشنەکەوتبێت:

((... سەرەتای ئاهەنگێڕان بە بۆنەی جەژنی کەنداو، لە پاشا و گەورە پیاوانی حکومەتەوە، وەك شێخی شار، قازی، دەفتەردار، کوێخا، پۆلیسەکان و تیپی ئنکشارییەکانەوە دەست پێدەکات. سەر لە بەیانی پاشا لەگەڵ دارو دەستەکەی، واتە فەرماندە، بەگ و مەمالیکەکانیان و،

لەگەڵیاندا جەماوەرێکی زۆر لە مۆسیقاژەن هاوەڵیاندەکەن و بەشێك لە گۆرەپان داگیردەکەن، دەردەچێت، لە کاتێکدا ئەو بەلەمانەی سەرەکانیان گیراوە دەگەنە جێ. بەلەمی ئافرەتان بەوە جیادەکرێتەوە کە ڕازێنراوەو هەموو شتێکی تێدایەو هەڵگرێکی هەیە کە گومبەزێکی بەسەرەوەیە و لەبەر دڵ پیسی خاوەنەکانیان بە سەریاندا دادەخرێت، پاشان ئەو کرێکارانەی بۆ ئەم کارە دانراون، پەیکەرێك یان ستونێکی درێژی لە قوڕ دروستکراو لە نێوبەندی ئەو دەنگە دەنگەی هوتافخوێن و ئامرازە مۆسیقاییەکانەوە دێنەدەرێ، دەهاوێژن. پاشان دەربەندەکە دەشکێنرێت و ئاوی نیل بەرەو شەقامەکانی شار هەڵدەقوڵێت و شەپۆلدەدات، هەر لە دەریاچەی بچووك دەچن. پێش ئەوەی پاشا ئەو شوێنە جێبهێڵێت، مشتێك پارەی زێرین و زیوین هەڵدەداتە ناو ئاوەکەو مەلەوانچیە لێزانەکان لە دۆزینەوەیان پێشبڕکێ دەکەن. ئەو کاتانەی ڕۆژیش کە ماوە بەخۆشی و شادی بەردەوامدەبێت تا شەوی دواتر... ))[٣٢].

بەڵام لین وەسفی ڕێورەسمی میوانداری لە کۆمەڵگەی قاهیرە دەکات. لەو شتە خۆشانەی لەسەر نەریتی خەڵکی قاهیرە دەگێردرێتەوە، ڕشاندنی میوانە بە ئاوی گوڵ یان گوڵزار و بۆنخۆشکردنی بە بخور پێش ڕۆیشتنی، ئەمەش لە نێو چینی باڵا باوە، بۆ ئەمەش خزمەتکارەکە قودوی بخورەکە دێنێت و خاوەن ماڵەکە پێشکەشی میوانەکەی دەکات، لە ڕێگەی باوەشێنکردنەوە بۆنەکەی بە دەستی ڕاست بە ئاراستەی میوانەکە دەبات، بەمەش جل و بەرگ و ریشی بۆنخۆشدەکات[٣٣]. تا ئێستاش ئەم نەریتە لە وڵاتانی کەنداو بەردەوامە، کە ڕێگە پێدانێکی ئەدەب ئامێزە بۆ کۆتایی هێنان بە میوانداریەکە، ئەگەرچی بەشێکی زۆر لە نەوەی نوێ دەرك بە مەبەستی شاراوەی پشت ئەم نەریتە ناکات و، پێی وایە تەنها زیادە رەوییەکە لە ڕێزگرتنی میوان.

هەروەها جارێکی تر میسر وێنەیەکی ناوازە بۆ نەریتێك کە زەمەن لە بەردەمیا وەستاوەو، هیرۆدۆت لە مێژووەکەیدا وەسفی کردووە و تا رۆژگاری ئەمرۆشمان هەر بەردەوامە، دەخاتە روو، ئەویش نەریتی شیوەنکردن و پیاهەڵدانە بە سەر تەرمی مردوو. قاهیرە بە تایبەت جیاواز لە شارەکانی تری رۆژهەڵات بە نەریتی بەکرێگرتنی شیوەنکار ناسراوە. ئەمانە ئەو ژنانەن کە لە گریان و پیاهەڵدان و قیژو قاژو خوێندنی سەر دولکە بە سەر مردوو و هاواری وا کە هونەرێکی خەماوی هەیە، لێزان و بەهرەمەندن. ئەمە نەریتێکی کۆنەو هیرۆدۆت لە سەدەی پێنجی پێش زایەن وەسفی کردووە:

((... کاتێك پیاوێکی ناودار کۆچی دوایی دەکات، هەموو ژنەکانی ناو ماڵەکە سەرو دەموو چاویان لە قوڕ دەگرن و ماڵی مردووەکە جێدەهێڵن، ناو قەدیان دەبەستن، سنگیان بە دەردەخەن، بەناو شاردا دەڕۆن و لە سنگی خۆیان دەکوتن، بۆ ئەمەش خزم و کەسەکانیان هاوشانیان دەکەن... ))[٣٤].

خانمە نووسەر لەم بەشەدا پوختەیەکی گشتی لەبارەی گرنگترین بۆنە، جەژن، ئاهەنگ و وێنەکردنی کات بە سەربردن لەناو ماڵەکان، دەخاتە ڕوو. بەڵام دیسانەوە دەبینین جەخت لەسەر یەك شێوەی ئاهەنگ گێڕان دەکاتەوە، ئەویش رێورەسمەکانی ئاهەنگ گێڕانە لە ناوچەی چینە باڵاکانی کۆمەڵگە، هەرچەندە بابەتێکی هاوشێوە هەیە کە وەسفی ئەو رووداوانە لە چینە جیاوازەکان دەکات، بۆ نموونە خاتوو لین ـ کە خانمە نووسەر لە زیاتر لە شوێنێك ئاماژە بە نووسینەکانی دەکات- وەسفی رێورەسمی حەمامکردنی بووك لە چینە باڵاکان دەکات، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر لەو وێنەیەی کە تا ئێستا لە سینەمای میسری نمایشدەکرێت دەربارەی ئاهەنگی ژن گواستنەوە لە لادێکان دەچێت و، لەگەڵ ژن گواستنەوە لەو چینانەی چانسی کەمتریان هەیە و لەگەڵ توێژی نەجیب زادەکان، بەراوردییان پێ دەکات:

((... بووك كە دەگوازرێتەوە، بە كشمیرێكی سوور لە تەوقی سەریەوە تا پاژنەی بالآپۆش دەكرێت و لە تەوقی سەریشی تاجێك دادەنرێت، پاشان بۆ داپۆشینی و پاراستنی لە چاوی هاموشۆكاران (المارە) شاڵەكە دادەنرێت. خزم و كەسانی بووك كە شوویان كردوە پۆشاكێكی عەبا ئاسای رەشیان لە بەردایەودەورەی بووك دەدەن، بووكیش لە كەژاوەكەیدایە كە لە لایەن چوار پیاوەوە هەڵگیراوە. گەر كەش و هەوا گەرم بوو، ئەوا یەكێك لە نزیكەكانی لەدواوەی دەڕوات و بە باوەشێنە باوەشێنی دەكات. هەروەها بۆ چوونە حەمام كەژاوەكە بە رێگایەكی دووردا دەڕوات بۆ نمایشكردنی بووك، لەكاتی گەڕانەوەشدا راستەوخۆ دەچێتەوە ماڵ كە دەستەیەك لە مۆسیقاژەن یان تەپڵ لێدەر هاوشانی دەكەن. بەرێكردنی بووك لە نێو چینە هەژارەكان بە هەمان شێوەی پێشووە، تەنها ئەوە نەبێت كە ژنان هەڵهەڵە لێدەدەن. بەلآم زاوا سەڵتەی سوری خەت خەت و كەوایەكی سوری لە بەردایە، مێزەرەكەی شاڵێكی كشمیری سورەو لە نێوان دوو برادەری كە جل وبەرگی هاوشێوەیان لە بەردایەدا، دەڕواتە رێوە. لە پێشیەوە خزمەتكارەكان كە مۆمیان بەدەستەوە گرتوە لەگەڵ مۆسیقاژەنەكان رێگا دەكەن. پاشان رێوڕەسمێكی تایبەت هەیە ئەویش (بە رێكردنی ساداتی)یە. واتە بەرێكردنی نەجیب زادە. رێوڕەسمەكە هەر هەمان شێوەی پێشترە تەنیا ئەوە نەبێت كە مۆسیقای لەگەڵ دانیە و لەجێی ئەوان ٦ یان ٨ مەولودخوێن كە بە ((كوڕی شەوانە)) ناودەبرێن، شیعرو پیا هەڵدان بەسەر پێغەمبەر (د. خ) دەخوێنن و دەیلێنەوە... ))[٣٤].

هەروەها خانمە نووسەر باسی ئەو كاتە خۆشانەی كە لە حەمامە گشتیەكان بەسەردەبرێن، دەكات. هێرشەكەی فەرەنسا لە كۆتاییەكانی سەدەی ١٨ سەر ژمێری حەمامە گشتیكانی كردوە بەوەی ١٠٠ دانە لە قاهیرە هەیە و بۆ سەردانكردنی بە تایبەت لە وەرزی زستاندا، هانی

دانیشتوان دەدات. لێرەدا خانمە نووسەر پێداگیری لەسەر سروتی چوونە حەمامی ژنان دەکات (وێنەی ٢٢) و سروتی چوونە حەمامی پیاوان دەپەڕێنێت، تا شتەکە وادەرکەوێت کە پیاوان زۆر سەرگەرم نابن و لەکاتی چوونە حەمام کاتی خۆش بەسەر نابەن. حەمامکردن بۆ سەرحالبوون و هەلڕشتنی خەمو خەفەت، نەریتێکی کۆنی عەرەبیە و یادەوەرییەکانی کولتووری رۆژهەلاتی لە چیرۆکەکانی هەزار شەوە تۆماریکردووە و لە شەوی چل و سێ ی دوای نۆسەد هاتووە کە هارون رەشید:

((... هارون رەشید شەوێکیان بێ خەوییەکی بێ ئەندازەی تووشهات، بانگی مەسروری کرد، کە هات پێی ووت: بە خێرایی جەعفەرم بۆ بهێنە، رۆیشت و هێنای، کە هات لە بەردەمیا وەستاو پێی ووت: ئەی جەعفەر ئەم شەو بێخەوییەکم تووشهاتووە و خەوم لێناکەوێت و نازانم چشتێك لای دەبات. ووتی: ئەی ئەمیری موسولمانان زانایان ووتویانە: تەماشاکردنی ئاوێنە، حەمامکردن و گۆرانی خەم وخەفەت لا دەبەن... ))[٣٦].

هەروەها خانمە نووسەر بە چەند ووشەیەکی کەم باس لە سەرگەرمی قاوەخانەکان دەکات، لەگەل ئەوەی قاوەخانەکان لە هەموو چینەکانی کۆمەلگەی شارنشینی، هەروەك چۆن (نیبۆر) لە کتێبەکەیدا گەشتێك بۆ میسر ١٧٦١- ١٧٦٢ تێبینی کردووە، بوو بوونە سەرچاوەیەك بۆ سەگەرمی پیاوان:

((... لە گەورەترین سەرگەرمیەکان کە میسری، سوری و عەرەبەکان دەیزانن، دانیشتنی شەوانەیە لە قاوەخانەکان و جگەرەو نەرگیلەکێشان و گوێگرتنە لە گێڕەر و مۆسیقا و ئەو گۆرانی بێژانەی دێنە ئەو شوێنە بۆ دەسکەوتنی پارووی رۆژانەیان... ))[٣٧].

لەگەل سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم ئاماژە بە بوونی قاوەخانەکان دەکرێت. لە کتێبی گەڕیدەکان ئەوانەی بە شارەکانی رۆژهەلات لە

ئەستەنبوڵ، شام و بەغداد تێپەڕبون، ئاماژەدەکەن بەوەی کەقاوەخانەکان لە دەم باخ و کەناری دەریاکـان دروسـتدەکران و، کـەش و هەوایـەکی خـۆش و فێنك بۆ ئەوانەی کە سەردانی ئەو شوێنانە دەکەن، دەرەخسێنێت. هەروەها گەڕیدەکان یاری زارو مێزو شەترەنجیان لە قاوەخانـەکانیقاهیرە کـردوە، کـە تێیدا هـاتووە شـاریقاهیرە نزیکـەی ۱۲۰۰ قاوەخانـەی تێدایـە، ئەمـە بـە جیـاوازی لەگـەڵ میسـری کـۆن و بـۆلاق، بـەجۆرێك میسـری کـۆن ۵۰ قاوەخانەی تێدا بووە، بەڵام بۆلاق سەر ژمێری قاوەخانـەکانی دەگاتـە ۱۰۰ قاوەخانە. بەڵام لەرووی کەل و پەلەوە ئەوا قاوەخانەکان:

((... بە هیچ جۆرێك رایەخ و کەل و پەلی ناو ماڵی تێدا نیە، هەروەها ئاوێنە یان دیکۆری ناوەوە یـان دەرەوەی تێـدا بـەدی ناکرێـت، تـەنیا چـەند جێدانیشێکی لە دار دروستکراو نـەبێت، کە جۆرێـك لـە کورسـی بازنـەیی بەدرێژایی دیواری باڵەخانە یان دوکانەکە پێکدەهێنێت، ئەمە لەگەڵ هەندێ حەسـیر کـە لـە دارخورمـا دروسـتکراون یـان رایـەخی زبـر سـەلیقە لـەو قاوەخانانەی کە شکۆمەندن و پیاوە گەورەکانی بۆ دەچێت، راخراون. لەوێدا کەسەکان لە سـەر ئـەو حەسـیرەی کـە لـە سـەر سەکۆ دارینـەکان راخـراون دادەنیشن... ))[۳۸].

هەموو تاکەکانی چینە جیاوازەکان سەردانی قاوەخانەکانیان دەکرد. لـە ئێران چیرۆك گێڕەرەوەکان (وێنەی۲۳) شانامەیان دەگێڕاوە، بەڵام لە شـام و میسر باسی ژیانی ئەبی زەید هلالی و عـەنتەر کوڕی شەدادو زاهر بیبرسیان دەکـرد. هـەروەها ئـەرەگۆزو بووکەڵـەی سـێبەر و موهـەرج (وێنـەی۲٤) سەردانی ئەو شوێنانەیان دەکرد:

((... ئەوانەن کە بە پاڵەوان دەناسران و بە هـەڵس و کـەوت و گاڵتـەکانیان جـەماوەریان خۆشـحاڵ دەکـرد. لـە شـەقامەکانیقاهیرە چـەندین جـار پیاومـان دەبینی رۆڵی بووکەڵـەی سـێبەریان دەنوانـد. ئـەم نمایشـە بـەلای خەڵکـەوە زۆر

حەزلێکراو بوو. ئەو شانۆیەی بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهات زۆر سادەو بچووك بوو کە تەنها کەسێك دەتوانێت هەڵیگرێت و بە ئاسانی بیگوازێتەوە.

ئەکتەرەکە لە نێو چوارچێوە دارینەکە رادەوەستێت و بە جۆرێك دایدەنێت تا بتوانێت لە رێگەی چەند کون و کەلەبەرێکەوە کە بۆ ئەو مەبەستە دروستکراون و بێ ئەوەی تەماشاکاران بیبینن، ئەوسەکۆی نمایشەکە و تەماشاکاران لەو کونانەوە دەبینێت. بووکەڵەکانی دەخاتە سەر شانۆ بچووکەکە و لە رێگەی چەند داوێکەوە لە سەرەوە کە لە کون و کە لەبەری تایبەتەوە رایەڵیان دەکات، جووڵە بە بوکەڵەکانی دەکات. هەروەها شتێکی نەگونجاو بوو کە ئەو دەنگەی لە بوکەڵەکانەوە دەردەچوو هەمان دەنگی ئەکتەرەکە بێت، بۆیە دەنگی خۆی هەندێ توند دەکرد تا جیاواز بێت، ئەمەش لە رێگەی ئامرازێکی بچووکەوە بوو کە دەیخستە دەمیەوە. ئەم ئامرازە وای لە دەنگی دەکرد زۆر ناسك بێت و هاوکات بێت لەگەڵ مۆسیقای شمشاڵ لە کاتی گفتوگۆکردنی بە زمانی بووکەڵە بچووکەکان... ))[٣٩].

لە نووسینەکانی خاتوو لین هاتووە، قاوەخانەکانپێشوازی لە خەڵکەکە لە کاتی عەسرو ئێوارە کە دەهاتنە ئەوێ، دەکرد و، کەسەکان توتن و جگەرەی خۆیان لەگەڵ دەستیان دەهێنا:

((... قاوە لە لایەن قاوەچییەوە پێشکەش دەکرێت (یان خزمەتکاری دوکان)، لە بری پێنج پارچە زیو بۆ فنجانێك یان دە پارچە بۆ تاسێك کە ٣ یان ٤ فنجان دەگرێت، وەردەگیرا. هەروەها قاوەچییەکە ٢ یان٣ نەرگیلەی کە بۆ کێشانی تمباك (یان جگەرەی فارسی) بەکاردێت، لەگەڵحەشیش (قەنب)ی هەبوو. حەشیش تەنیا لە هەندێ قاوەخانە دەفرۆشرا. مۆسیقاژەن و چیرۆك گێڕەرەوەکان بە تایبەتی لە شەوانی ئاهەنگە ئاینییەکان سەردانی قاوەخانەکانیان دەکرد... ))[٤٠].

زەحمەتـە بتوانرێـت مێـژووی بڵاوبوونـەوەی بـەکارهێنانی قـاوە لـە ڕۆژهەڵات دیاری بکرێت، بەڵام وا پێدەچێت لە نیوەی سەدەی ١٥ی ز بێت. مێـژوو نووسـە عەرەبـە نوێکـان ئامـاژە بـە نـەبوونی زانیارییـان دەربـارەی مێژووی دیاریکراو بۆ بڵاوبوونەوەی قاوە دەکەن. ئـەو تێکسـتە یەکەمانـەی باس لە مێژووی قـاوە دەکـات ئەوەیـە کـە لـە کتێبـی عەبـدولقادر جزیـری (عمدة الصفوة في حل القهوة) کە لە ١٥٥٨ ز کۆچـی دوایـی کـردوە، تێیـدا ئاماژە دەکات کە قاوە لە یەمەنەوە هاتووە:

((... ووتمان جگە لەوە شتێکی تر نییە، چـونکە دەرکـەوتنی قـاوە لـە ناوچەی ئیبن سەعدەدین و وولاتی حەبەشە و جەبرەت ـ ئەتیوبیا ـ و ناوچەی تری عەجەم هاتووە و سەرەتاو هۆی هاتنی نەزانراوە... ))[٤١].

گێڕانەوەکان باس لەوە دەکەن، قاوە بەهۆی حەزو ئارەزووی سـۆفیەکانی یەمـەن (وێنـەی٢٥) بڵاوبۆتـەوە، گوایـە ئـەمان دەیـاخواردەوە تـا بـۆ شەوارەگرتن و زکرکردن یارمەتیان بدات. لەوێشەوە گەیشتە حجاز و، پاشان میسـر و ناوچـەکانی تـری ڕۆژهـەڵات. بڵاوبوونـەوەی قـاوە هـەروەك بڵاوبوونەوەی توتن و جگەرە تووشی دژایەتیکردن لە لایەن پیاوە ئاینیـەکان سەبارەت بە حەڵاڵی یان حەرامی خواردنەوەی بووەوە.

**کورتە باسێك لە بارەی گەشەسەندنی هونەری ئیسلامی:**

خانمە نووسەر هەوڵیداوە شێوە و فۆرمێك بە سـەلیقەی هونـەری جیـاواز یان مژدەی باو لە پایتە گـەورەکانی ڕۆژهـەڵات لـە جیهـانی ئیسـلامی و لـە ماوەی نێوان سەدەی ١٦ و ١٩ بدات، ئەویش لە ڕێگەی نمایشـکردنی کـەل و پەل و بەرهەمە هونەرییەکان لە سەر شـێوەی قـاپ و قاچـاغ و شـتی چـنراوو رایەخەکانی ناوماڵ، هەروەها لە ڕێگەی نموونە و توخمی زەخرەفەی بیناسـازی و جوانکاری و ڕازاندنەوە کەسییەکان. بـەڵام خانمـە نووسـەر ڕاڤـەی مێـژوویی

گەشەسەندنی ئەم هونەرە، سەرهەڵدانی سەلیقەی رۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئەو هۆکارانەی کە ئەم جۆرە سەلیقەیان دروستکردوە، ناکات. هەروەها بەرچاو روونی لەبارەی لایەنێکی مێژووی گشتی بە خوێنەر نادات، کەچۆن بووەتە هۆی گەشەسەندنی ئەم جۆرە سەلیقانەو جۆراوجۆری تەئویلی کەسایەتی و سەلیقەکان لەسەردەمێکەوە بۆ یەکی تر. بەهەمان شێوە خانمە نووسەر چۆنیەتی مانەوەی ئەم خەسڵەتە هونەرییە ئیسلامییانەی، کە لە جەوهەریاندا روون و ئاشکران، راڤە نەکردوە. لەگەڵ ئەوەی کە لایەنەکانی جیهانی ئیسلامی چەندین رووداویان تێدا رووداوە، کەچی لە درێژەی ئەو ماوە زەمەنیەی کە خانمە نووسەر لە سەری دەدوێت، تەنها بە راڤەی هەندێك شت و بە چەند دەستەواژەیەکی گشتی و لێرەو لەوێ ئاماژە بە نەریتی رۆژهەڵاتی دانسق و دابی ئیسلامی پاك و بێگەرد دەکات، ئەو نەریتەی کە پارێزگاری لە مۆرکی گشتی و دروستکردنی سەلیقەیەکی هونەری کردووە.

وەڵامی ئەوە تەنیا لە رێگەی بەدواداچوونی قۆناغە یەك لە دوای یەکەکانی گەشەسەندنی هونەری ئیسلام و، هۆکارە جیاوازەکانی کە بوونەتە هۆی دروستبوونی ئەم هونەرانە، دەدرێتەوە. ئەوەتا لە سەرەتای ئیسلام ـ واتە لە سەرەتای بانگەشەکردن بۆ ئیسلامەتی تا سەدەی سێیەمی کۆچی/ سەدەی ٩ ی زایەنی ـ هونەرو پیشەسازییەکان لە هەرێمە ئیسلامەکان بەو داب و نەریتە باوەی لە هەر هەرێمێکدا هەبوون زۆر کاریگەر بوون. کاری هونەری هونەرمەندی موسوڵمان جیاوازی لەگەڵ هونەری کۆن نەبوو تەنیا لەو دوو سەدەیەی دواییدا نەبێت، ئەگەرچی پارێزگاری لە هەندێ لە خەسڵەت و کاریگەرییە لۆکاڵییەکانی دەکرد. پاشان ئەم هونەرو پیشەسازییانە لە سەدەی ٩ ی ك / ١٣ ز پێگەیشتن و کولتوورێکی هونەری روونی پێشکەشکرد، کە مۆرکی تاکی موسوڵمانی پێوە دیار بوو، لە سەدەی ١٠ ك/ ١٦ی ز و تا نیوەی یەکەمی سەدەی ١٣ك / ١٩ی ز گەیشتە چڵە پۆپەی گەشەسەندنی،

ئەوەیش ئەو قۆناغەیە کە ئەم کتێبە خستویەتیە ڕوو و ئاماژە بە هونەرو پیشەسازییەکانی دەکات، بەڵام هەمان ئەم قۆناغە سەرەتای لە ناوچوونی کەسایەتی هونەرمەندی موسوڵمانی بە خۆیەوە بینی. هەر لە سەدەی ١٩ هەندێ شێوازی هونەری لە ئەوروپای ڕۆژئاواوە ـ کە پێشکەوتوتر بوو، کۆنترۆڵی جیهانی کردبوو ـ هێواش هێواش بۆ چەندین لایەنی ژیانی ڕۆژهەلاتی گوازرایەوە و، خزییە نێو پێکهاتەی بنکەی مەعریفی، تا وایلێهات چەندین لایەنی داب ونەریتی هونەری چەسپاوی سڕییەوەو سیستەمی کۆمەڵایەتی باوی گۆڕی. هەروەها تێکچونی سیستەمی سیاسی و لەناوچوونی خەلافەتی ئیسلامی بۆ هێنانە خوارەوەی پەردە لەسەر بەشی کۆتایی کولتووری هزری و هونەری کە خەریکبوو هەر لە سەدەی ٣ ك / ٩ی زایەنییەوە لە کولتوورەکانی تر جیاکراوە بێت، یارمەتیدەر بوو.

لەگەڵ هاتنی ئیسلام، پیشەسازو کاردەست سازەکانی ناوچەی ڕۆژئاوای دەوڵەتی ئیسلامی ـ بە سروستی حاڵەتەکە ـ بە هونەری کلاسیکی یۆنان و ڕۆمەکان کاریگەر بوون. هونەری ئەمانە بەوە جیادەکرایەوە کە وێنەی زیندەوەری زیندو لە دارو درەخت و ئاژەڵ و شێوەی ئادەمیزادی لە سەر مۆدی سروشتی دەکێشن، هەروەها شێوەی کلاسیکی بۆ قاپ و قاچاخ و ڕازاندنەوە بە بەکارهێنانی یەکەی زەخرەفەیی پێچخواردوو لە کرۆم و لەبلاب ـ بەکاردەهێنن. هەروەها جیهانی ئیسلامی لەهەمان کاتدا بەشی ڕۆژهەلاتی دەوڵەتەکەشی کاریگەربوونی بەخۆیەوە بینی، بە جۆرێك داب و نەریتەکانی هونەری وولاتی رافیدەین و ئێرانی فارسی ساسانی بە میرات وەرگرت. ئەم جۆرە هونەرە بە ئەندازەیەکی زۆر فەرمی و جۆرییەوە، یەکە زەخرەفییەکانی دوبارە دەکاتەوە، وەك نەخشی ساسانی کە لە دار خورما دەچێت و لە مێژووی هونەریدا بە ((پەروانەی دارخورمایی) ناودەبرێت، جا چ بە تەواوی بێت یا بۆ دوو بەش بەشکرابێت. هەروەها پۆلە سوار چاك و جووت باڵی، کە هێمایەکە بۆ

دەسـەڵاتی خاوەنـدارێتی و درەختـی ژیـان کـە لـە هـەردوو لایـەوە دوو شـێوەی ئاژەڵی یان ئادەمیزادی، یانیش زیندەوەری ئەفسانەیی چاودێریدەکەن.

پاشان هونەرمەندە موسوڵمانەکان وردە وردە قوتابخانـەی رۆژهـەڵاتییان تێکەڵ بە قوتابخانەی رۆژئـاوایی کـرد کـە هـەر جـارەو یـەکێکیانیان قۆنـاغ قۆناغ و لە نێوان پایتەختە ئیسلامیە جیاوازەکان پەرەپێـدەدا. بـۆ نموونـە لـە رۆژهەڵات بە ئەنقەست یەکەی دووبارەبۆوەی پەروانەی دارخورمایی تەواو یان لـەتکراو بـۆ دوو بەشـیان بـەکاردەهێنا. پاشـان وایانلێهـات کـە پەروانـەی دارخورمایی لەتکراو بەکاربهێنن، وازیان لە نەخشـی پەروانـە دارخورمـایی تـەواو لـەت نـەکراو هێنـا (وێنـەی ٢٦). دواتـر بـۆ نەخشـی پەروانـەی دارخورمایی لەتکراو، هەندێ خەسڵەتی کرۆم و لەبلابیان لـە ڕووی گەشـەی بەردەوام و درێژ بوونەوەی، زیادکرد، تا وایلێهات لقێکیـان لـە چـەقی هـەر پەروانە دارخورماییەك زیاد دەکردو وەکو کۆڵەگەیەك بۆ زیاترکردنی پەروانە دارخورمـایی زیـاتر بەکاریانـدەهێنن، بەمـەش شـێوەیەك لـە پەروانـە دارخورمـایی لـەتکراو و بەدوایکـدا هـاتوو کـە هەریەکـەیان لەگـەڵ ئـەویتر زنجیرەی درێـژەوەبوو یـان پێکـەوە گرێـدراوی پێکـدەهێنا، دەکێشـرا. بـەڵام کرۆکی گریکی و ڕۆمانی کە لە هەرێمـەکانی دەریـای ناوەڕاسـت بـاو بـوو، وایلێهات بە دەوری یەکەی نیمچە بازنەیی دەخولێنرایەوە، کـە هەریەکـەیان لە کاغـەزێکی لولـدراو بـە دەوری بۆڵـە ترێیەکـەوە پێکهـاتووە. پاشـان لـە ڕێگەی ئەم لقانەوە دارسنەوبەرو پەلکی لاکێشەیی کـە هـیچ پەیوەندییـەکی بە کرۆمەوە نیە، گەشەی سەند. دوای ئەمەو بە تایبـەتی لـە سـەدەی ١١ی زایەنیـەوە پەروانـەی دارخورمـایی لەسـەری گەشـەیکرد، ئینجـا یەکـە رۆژهەڵاتی و رۆژئاواییەکان وردە وردە لەگەڵ هەوڵدانی هەر یەکەیەکیان بـۆ دروسـتکردنی داهێنانکـاری زەخرەفـی نـوێ لـە ڕووی دەرەوەی فـەخفوری و شتی چنراوو کانزاکاریدا کە لە یەکەکەی تردوە بۆی دەهات، تێکەڵاوبوون.

هــەروەها خۆشنوســی موســوڵمان، خــەتی عــەرەبی پەرەپێـداو کــردی بــە ئامرازێکی جوانکاری زەخرەفەیی بەهادار. بۆ ئەمەش چەند خەسڵەتێکی خەتی عــەرەبی کــە لــە خەتــەکانی تــر جیایدەکاتــەوە، یارمەتیــدەری بــوون. لــەو خەســڵەتانەش: خەســڵەتی پێکــەوە بەســتران و توانــایی لــە درێژکردنــەوەی لــە لایەکەوە بۆ لایەکی تر بە بـێ پچـڕان، دەتوانرێـت بـە شـێوازی زەخرەفـەیی بـێ هاوتا بنووسرێت، لە هەمانکاتدا بخوێنرێتەوە بێ ئەوەی ڕوونیی خـۆی لەدەسـت بدات. لەگەڵ ئەوەی ماوەیەکی زۆر نەبوو دەوڵەتی ئیسـلامی خـەتی کـوفی بـە گۆشە چوارییەکانی و خەتی نەسخی بەگۆشەبازنەییەکانی ناسـی، کەچـی خـەتی کوفی (وێنــەی ٢٧ ) لــەلای خۆشنوســان حــەزی پێـدەکرا، لەبــەر ئــەوەی باریـك دەنوسراو ڕەهەندێکی ئاینی وەرگرتبوو، چونکە قورئانی پیرۆز سەرەتا بەم خەتــە دەنوسرا. بەڵام زۆربەی جار دەبینین ئەم دوو خەتە لە هەمان پارچەو بــە یەکــەوە لــە نووســینەکاندا بــەکارهاتوون. قــاپ و قاچــاخی ســەمەرقەندی لــە ســەرەتای سەردەمی عەباسیەکان خەتی کوفی زۆرجـوانی تێـدا بـەکاردەهات. ئینجـا ئـەو قاپوو قاچاخە سەمەرقەندییە نەخشێنراوانە بــە پەنـدی عـەرەبی و دێـرە شـعر، جوانیەکی هونەری لەڕادەبەدەری پێ دەبەخشی. بەڵام دروستکاری کانزاکـان لـە خوراســان، ئــەوا خــەتی عــەرەبی و وێنــەی ئــادەمیزادو ئاژەڵیــان لــە کــارە هونەرییەکانیاندا تێکەڵاو دەکرد،ئەمەش سەر بەقوتابخانەیەکی ناوازەیــە کــە بــە "خەتی جوولاو" ناسراوە (وێنەی ٢٨). لــەم خەتــەدا کۆتـایی پیتــەکانیان درێـژ دەکردەوەو لایەکانیان بەسەرو جەستەی ئادەمیزادی یان ئاژەڵی دەڕازاندەوە، کـە هەریەکەیان کارلێکی لەگەڵ ئەویتریان دەکـرد و تێیـدا ڕووداوەکـانی ڕاوکـردن و تیر هاوێشتن و نێچیرگرتن،یان کۆڕی گۆرانی و سەماو دەف لێـدان و هــەڵگرتنی پێکی شەراب دەکێشرا.

مێژوو نووســانی مێـژووی هونــەر ئــەم یەکگرتنــەی هونــەری ئیســلامی لەگەڵ بوونی جیاوازییە هەرێمیەکان بـۆ تێکـەڵاوی و کـارلێکی بــەردەوامی

نێوان توخمەکانی هەرێمە جیاجیاکان دەگەڕێننەوە، جا یان لە ڕێگەی گواستنەوەی کارە هونەرییەدەستی و پیشەسازییەکان بە هۆی قافڵە بازرگانیەکانەوە بێت، یانیش کۆچکردنی پیشەکارو پیشەدەستیەکان و جێگۆڕکێیان و نیشتەجێبوونیان لە نێوان شارە ڕۆژهەڵاتیەکان،ئەمەش بازرگانی ئاڵوگۆڕی کاڵاو بەرهەمەکانی، کە قافڵەکان لە نێوان پانتاییە فراوانەکانی وڵاتی ئیسلامی ئاڵوگۆڕییان پێدەکەن، ئاسانکردوە، کە دەکاتە ڕووبەرەکانی پشت رافدەین و ڕۆژهەڵاتی دەریای ئەندەلوس لە ڕێگەی ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئاسیا، کە بە میسرو باکوری ئەفریقیا تا دەگاتە نیمچە کیشوەری سیبریا تێپەڕ دەبێت، بەمەش دەوڵەتی ئیسلامی لە درێژبوونەوەیدا زیاتر لەوەی کە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما هەیبوو لە بەهێزترین سەردەمەکانیدا، پەلی هاوێشتووە. ئیسلام ناوچە هەرێمیەکانی دەریای ناوەڕاستی لە ژێر دەستی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی لە قوستەنتینییە دەرهێنا و کۆتایی بە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی هێنا.

هەروەها ئاڵۆزی ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم دەوڵەتە، هەلی زۆری لە بەردەم کارسازو پیشە دەستکارەکان ڕەخساند، بە تایبەتی تێکچونی دەسەڵاتی سیاسی ناوەندی لەسەر هەرێمەکان و، دروستبوونی ئاراستەی جیاواز لە ناوەڕاستی ئاسیا بەرەو هەرێمە ناوەندییەکان و، داماڵینی هەموو جیاوازییەکانی سەرچاوە کارگێڕییەکانی سوڵتان لە هەرێمەکان، لەگەڵ دەربڕینی وەفاداری ڕووکەش بۆ خەلیفە لە ووتاری ڕۆژی هەینیدا. ئەم میرنشین و سەڵتەنەتانە لە کاتی گەشەسەندن و پێشکەوتنی هەریەکێکیاندا ئەدیبناس و کاردەست سازیان بۆ خۆیان کێشدەکرد و، لەکاتی ڕووخانیشیاندا ئەمانە لێیان هەڵدەهاتن و لەگەڵ ئەم کۆچکردنەیاندا قوتابخانەی هونەری گەشەسەندویان لەگەڵ خۆ دەبرد. وا دەردەکەوت کە لە ناکاو ئەم هونەرە لەو زەویە تازەیەو لەژێر چاودێری بنەماڵەی دەسەڵاتی

نوێ دروستبووبێت. سەردەمانی ئەم هونەرانە بەو چینەی کە دەست ڕەنگینییان تێدادەکرد، تایبەتبوون و بۆ کەسی تر نەبوو کە ئەنجامیانبدات. تەنها کۆچکردن و گەشتکردنی ئەو کارسازانە لە پایتەختێکەوە بۆ یەکی تر سەبارەت بە سەرهەڵدانی ئەم هونەرە لە ناکاو پێگەییوە لە هەرێمەکان، ڕاڤەیەك دەکات.

ئاسان نییە هەر یەکێ لەو هۆکارانەی سەرەوە بە تەنیا وەرگرین، چونکە هەردووکیان بە درێژای شارستانییە مرۆییەکان تەواوکەری یەکترو پێکەوە بەستراون. ئەوەی کە بارەکە ئاڵوزتر دەکات، ڕەگەزی سێیەمە کە لە پێکهێنانی سەلیقەی باوو دروستکردنی شوناسی هونەرە ئیسلامیەکان بەشداریکردووە، ئەویش چاودێری دەسەڵاتی سوڵتان و سەلیقەو مۆدیلی حەزپێکراوە لە لایەن بنەماڵەی دەسەڵاتدارەوە کە سەرچاوەی جیاوازی هەیە. ڕەنگە باشترین نمونەیەك کە دەربارەی پەیوەندی تێکەڵاوی ئەم هۆکارانەبێت وزۆر پشتی پێببەسترێت، مێژووی فەخفوری سازییە لە سەدە ناوەڕاستەکانی ئیسلامی. فەخفوری ساز لە سەرەتای ئیسلامەوە هونەر و داب و کولتووری باوی ناوچەکەی بە میرات بۆ ماوەتەوە کە پێش هاتنی ئیسلام بوونی هەبووە، ئەویش درێژکراوەیەکی سروشتییە بۆ کولتووری ڕۆژهەڵاتی خوارو و وڵاتی رافدەین. بەڵام قاپ و قاچاخی فەخفوری سەرنج و بایەخپێدانی دیوانی خەلیفە ئەمەوییەکانی ڕانەکێشاوە، کە بە کولتووری گریکی و ساسانیەکان لە ڕووی بەکارهێنانی قورئانی لە زێرو زیو دروستکراو، کاریگەربوون. لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا ڕۆڵی فەخفوری سازی تەنیا لە کارە سادەکاندا بەدەردەکەوت، ئەویش لە چێشتخانەکان. بەڵام چینە هەژارەکان زیاتر حەزیان بە بەکارهێنانی قاپ و قاچاخی لە دار و کانزا دروستکراو دەکرد، چونکە ئەمانە بەرگەی شکانیان لە فەخفوری زیاتر دەگرت.

هەروەها لەو ناوچەیەدا وایلێهات ئەوەنـدە بایـەخیان بـە زەخرەفەسـازی باڵەخانەکان نەدەدا، کە بەهۆی قرمیـدی رەنگـاو رەنـگ و هونەرەکانییـەوە دەنەخشێنرا. ئەم هونەرە لە سـەدەی ١٢ تـا ١٥ ی پـێش زایـەن لـە وڵاتـی رافدەین پەرەی سەند. کاتێك کە پاشاکانی بابـل، ئاشـوری و ئەخمینییـەکان دیواری کۆشکەکانیان هـەمووی بـە قرمیـدی زەخرەفـەیی، وێنـەی ئـاژەڵ و شێوەی ئادەمیزادی رەنگاو رەنگ، بە قـەبارەی سروشـتی لـە ژێـر چـینێکی بریسکەدار دەنەخشاند. پاشان ئەم هونەرە لەگەڵ هاتنی سەردەمی دەوڵەتی ساسانی لە ناوچوو. هەروەها لەگەڵ هاتنی ئیسـلام ئـەو هونـەری فـەخفوری سازییەی کە لە ناوچەکە باو بوو، ئەویانبوو کـە لـە دەوری حـەوزی دەریـای ناوەڕاست باوبووە، ئەم هونەرە لە فەخفوری سورکراوە لە ناو فرنـی تایبـەتی و لـە زەخرەفـەی زەق و سـادەی نەخشـێنراو پێکهـاتوە. هونـەری فـەخفوری سـازی لـە جیهـانی ئیسـلامی تـا سـەدەی ٩ی زایـەنی ئـاوا بـە سـنورداری مایەوە. عەلی کوری عیسا والی خۆراسان دیارییـەکی لـە فـەخفوری چـینی بەنرخی بۆ هارون رەشید نارد بریتیبوو لە — قاپێك کە ڕۆمانی بیهقـی تیـا نووسرابوو (٤٧٠ك-١٠٧٨ز) لە "مێژووەکەیدا" -٢٠ پارچە لـە فـەخفوری چینی کە هاوشێوەی ئەوە لـە دیـوانی خەلیفـە، بینرابـوو، ئەمـەو هـەروەها لەگەڵیدا (٢٠٠٠) پارچەی جۆراو جۆری چینی لە گەڵدا بوو. [٤٢] ئا لێـرەوە شۆرشـێك لـە بـارەی شـێوازو هونـەرێك هاتـە مەیـدان، وەك هـەوڵێك بـۆ تێگەیشتن لەو شتە جۆراو جۆرە هاوردەنییانەی لە چینەوە دەهێنران، پاشـان بەرهەمهێنانی هونەر و شێوازی هونەری نوێ و گشتی پەیدا بوون.

بەڵام فەخفوری سازە میسرییەکان لە سـەردەمی فاتمییـەکان، بەڵگەیـەکی ئاشکرا سەبارەت بە کۆچکردنی پیشەسازە دەستییەکان بـەرەوقاهیرە پایتـەختی نوێ، دەدەن بە دەستەوە، کـە خـەریکبوو ئەسـتێرەی داهێنـانی بـەرەو بـەرزایی دەرۆشت. ئەو پیشەسازانە لە بەغداوە هاتبوون، کە ئەوکات بەغـدا خەریکـەبوو

ئەستێرەی بەرەو ئاوا بـوون دەچـوو. ئەمانـە نهێنـی پیشـەکانیان لەگـەڵ خۆیـان بۆقاهیرە هێنابوو، ئەمەش لەو گۆڕانە لە ناکاوەوە کە بەسـەر هونـەری لۆکاڵیـدا هات، دەردەکەوێت و، هونەرێکی پێشکەوتووی بەغدا لـە ناکـاو، وەك دووبـارە دۆزینـەوەی هونـەرێکی فـەخفوری گڕنـی گڕنـی و بریسـکەدارکراو بـە کـانزا، هەروەها فەخفوری نەخشێنراو بە زەخرەفەی نوێ لەقاهیرە دەرکەوت.

دەکرێ هەمان ئەو هۆکارانە بووبنە هۆی گەشەسەندنی هـەموو هونـەرە بچووکە ئیسلامیەکانی تری وەك پیشەسازی کانزا، خشڵ و گەوهەر، چنین و شوشە نەخشاندن، یان گەشەسەندنی هونەری بیناسازی گەورە، بەڵام ناکرێت هەر هەمووی لێرەدا باس بکرێت.

## وێنەکێشان

خانمە نووسەر لە هەنـدێ شـوێنی کتێبەکەیـدا وەسـفی چـەندین وێنـەی ئادەمیزادی و ئاژەڵی، کـە قـاپ و قاچـاخ و شـتی چنراوو دیوارەکـانی پـێ ڕازێنراوەتەوە، دەکات. کتێبە مێژووییـەکانی قوتابخانـەکان، هەنـدێ بابـەتی خوێنـدنی زانکـۆیی گشـتی، هەنـدێ نووسـینی گشـتی و چـەند کتێبێکـی تایبەت کە بـاس لـە مێـژووی هونـەری ئیسـلامی دەکـات، جـەخت لەسـەر خاڵیبوونی هونەری ئیسلامی لە وێنەی ئاژەڵی و ئادەمیزادی دەکاتەوە. جا خانمە نووسەر هۆکاری پێشکەوتنی هونەری خۆشنوسـی کـە تاکـە هونـەری ڕەسەنی عـەرەبیە، هەروەها شۆرشی گەورە لە بواری زەخرەفـەی ئەنـدازیاری بۆ ئەو حەرامکردنە ڕەهایە سەبارەت بە ڕك و کینەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە وێنەو شێوەی ئادەمیزادو ئاژەڵ، دەگەڕێنێتەوە.

بـەڵام ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە، ڕای جیـاواز لـە هـزری فقهـی ئیسـلامی سەبارەت بە وێنەو شێوەیئادەمیزاد و ئاژەڵ هەیە، لێرەدا سـێ هەڵوێسـتی فقهـی هەیـە: یەکـەمیان ئـەم بابەتـە بەشـێوەیەکی بـن بـڕ ڕەتدەکاتـەوە.

دووەمیان دیمەنی سروشت و میوەجات حەڵاڵ دەکات و، سێیەمیان هەموو وێنەیەك حەڵاڵ دەکات لەوەوە کە ڕەسەنی حەڵاڵکردنی شتەکانەو تەنها ئەگەر بە مەبەستی پەرەستن بەکارهات ئەوا حەرامدەکرێت.

هەر لە سەرەتاوە هزری تەشریعی ئیسلامی ڕەوتێکی دژی وێنەکردن ناسیوە، هەروەك چۆن لە ئاینی جوولەکە و کرستیانیشدا بوونیان هەبووە. ئەم ئایدیۆلۆژیا چاکسازییە لە سەردەمی ڕۆشنگەری عەرەبی ئیسلامی هاوچەرخ دووبارە ژیانرایەوە، بە تایبەتی لەگەڵ بەرەو پێشچوونی فەلسەفەی ڕۆشنگەری ئیسلامی هاوچەرخ وەکو فەلسەفەکانی سەدەی ١٩ کە بەرەو ئایدیالیزمی زیاتر و دابەزین بەرەو کامڵبوونی مرۆیی و پاکسازی ئاین ڕۆیشتوە.

کەچی فقهییەکان لە بارەی بڕیاردان لەسەر ئەو وێنانەی ڕۆحی مرۆڤ یان ئاژەڵی تێدایە جیاواز بوون و، سێ بۆچوونی جیاوازیان هەبوو: گروپی یەکەم پێی وایە: وێنەکێشان و شێوەی تر جگە لە مرۆڤ و ڕوح لەبەر بە هەموو شێوەکانیانەوە حەرام نین، تەنها ئەوانە حەرامدەکرێن کە لە شێوەی پەیکەرن و بۆ پەرەستن دوور لە (اللە) دروستدەکرێن، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: "قال اتعبدون ما تنحتون واللە خلقکم وما تعملون"(سورة الصافات: ٩٥ و ٩٦). مەبەستی ئەم ئایەتەیان بە فەرمودەی پێغەمبەر (د. خ) ڕاڤە کردوە "لە نێوان ئەو خەڵکانەی کە لە ڕۆژی قیامەت زۆر سزا دەخۆن وێنەکێشەکانن" بەو پێیەی کە لێرەدا حەرامکراو، دروستکردنی پەیکەرە بۆ پەرەستن، چونکە ئەگەر مەبەستی ئەو وێنەکێشانە ئاسایی بوایە، ئەوا کێشەی بۆ ڕێساکانی شەریعەت دروست نەدەکرد. لێرەدا دەبێت لادانەکەی زۆر گەورە بێت کە لە دروستکردنی هاوتا، کوشتنی گیان و داوێن پیسی گەورەتر نییە، ئەوکاتە وێنەکێشەکە لە هەموو خەڵکی سزای زیاتر دەبێت گەر ئەو پەیکەرەی بە مەبەستی پەرەستن دروستکردبێت. [٤٣]

بەڵام مالکیەکان و هەندێ لە سەلەفی و حەنبەلییەکان، ئەوا وێنەی ئادەمیزادی و ئاژەڵی حەرامدەکەن، ئەگەر سێبەری هەبێت. واتە ئەگەر پەیکەرێك بێت کە دووری هەبێت، جا ئەگەر ئاوا نەبوو، ئەوا حەرام نییە. بۆ نمونە وەك ئەوەی لەسەر دارو دیوار دەکێشرێت یان لەسەر کاغەز یان قوماش، ئەمانە حەرام نین بەڵام حەزپێنەکراون. لە کاتێکدا کە حەنەفی و شافعی و جەماوەری حەنبەلییەکان ئەو وێنانە حەرامدەکەن کە ڕۆحی تێدایە، جا ئەگەر وێنەکە سێبەری هەبێت یا نە. [٤٤]

مشتومڕ لە بارەی حەرامکردنی وێنەو پەیکەرەکان لە کۆتایی سەردەمی ئەمەوی و سەرەتای سەردەمی عەباسی توند بوو. بەڵگەی زۆر ڕوون و ئاشکرا لە بارەی لێبووردەیی موسوڵمانان لەگەڵ وێنەو پەیکەر لە شارە کراوەکاندا هەیە، بە جۆرێك موسوڵمانە یەکەمیەکان ئەوانەی لەسەرەتای ئیسلام موسوڵمان بوون لە بیرو باوەڕی خۆیان لە شارە کراوەکان نەدەترسان، لەگەڵ ئەوەی خەڵکی تازە لە پەرەستنی پەیکەرەکان دەستیان هەڵگرتبوو. تەنها بە بەڵگەی کردەیی، کە ئاسەوارەکان بەو حاڵەتە باشەیان ماونەتەوە، وەك پەیکەری بوزا - چەند ساڵێك پێش ئێستا لە ئەفغانستان تەقێنرایەوە - لە هندو ئەفغانستان، تا دەگاتە ئەو ریزە سوپایەی کە لەسەر دیوارەکانی جەمشید لە ئێران کێشراون و، ئەبو هۆل و ئەو پەیکەرە زەبەلاحانەی لە میسرو سودان هەن، ئیکتفا ناکەین، بەڵکو پشتگیری لە ڕۆحی لێبوردەیی ئیسلامی بۆ ئەم وێنەو پەیکەرانە دەکەین، لە ڕێگەی یەکێ لە گرنگترین سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامی کە (تبریی)ە. تبری بە جۆرێك باسدەکات، کە چۆن سەعدی کوڕی وەقاس کاتێك شاری مەدائن، کە پایتەختی ئیمپراتورییەتی فارس بوو، ڕزگارکرد و نوێژی فەتحی لە هەیوانی کیسرا کرد:((لەناویدا پەیکەری لە گەچ دروستکراوی پیاوو ئەسپ هەبوون، ئەوو موسوڵمانان ڕێگری نەبوون و وەکو خۆی هێشتیانەوە. پاشان

فەرمانی بەسەر خەڵکداکردو بۆ جەژنەکان کردی بـە مزگـەوت، منبـەرێکی تێدا دانا و نوێژی هەینی -کە پەیکەرەکانیشی تێدا بوو- تێدا دەکرد...[٤٥]

کاریگەری ئەم بیرورا فقهیانە سەبارەت بە رازاندنەوە، لە ڕێگەی وێنـەو کێشـانی شـێوەی جۆراوجـۆر و دروسـتکردنی خەسـڵەتە هونەرییـەکانی لـە هەرێمێکەوە بۆ یەکی تـر و لـە سـەردەمێکەوە بـۆ یـەکی تـر جیـاواز بـوو. مەغریبی عـەرەبی کاریگـەری ئـەو خۆپاراسـتنەی زۆر بەسـەرەوە بـوو، بـە جۆرێك زۆر بە کەمی وێنەی ئـاژەڵ و ئـادەمیزاد لـە سـەر دارو دیوارەکـانی دەکێشران. بەڵام لە وڵاتی فارس و هەرێمە رۆژهەڵاتییـە هاوسـێکانی، ئـەو راڤە فقهیانە پشت گوێخرابوون. بەو پێیەی کە وێنە کێشان لە ڕووی فقهەوە حەزپێنەکراوە، ئـەوا لـە کۆمەڵگـە ئیسـلامیەکاندا وایلێهـاتبوو کـە لـەنێو بازنەیەکی دیاریکراودا بهێڵرێتەوە، بە تایبەتی لە دیوەخانی سوڵتان و ماڵی چـینە باڵاکـان، تـەواو وەکـو دانیشـتنەکانی سـەما و گـۆرانی و شـەراب خواردنەوە، لەگەڵ ئەوەی شەرع زۆر بە توندی ناحەزی ئەم جـۆرە دانیشـتن و شەراب خواردنەوەیەی حەرامکردوە، کەچی لـەم جـۆرە کـەش و هەوایانـەدا بەرێوە دەچوون.

ئەم جیاکردنەوەیەی نێوان پانتایی تایبەت و گشتی- نێو ماڵ، کۆشـکو و مزگەوتەکان- لەبارەی کێشـانی وێنـەی ئـادەمیزادی و ئـاژەڵی لـە سـەرەتای سـەردەمی ئەمەوییـەوە دروسـتبوو. لەگـەڵ ئـەوەی کـرۆم رەمزێکـی کـافری تێدایەو ئاماژەیە بە (باخوس) خوای شەراب، ئەوا مزگەوتەکان لـە دیمەشـق و مەدینەی منەوەرە بە نەخش و نیگاری دارو درەختی کرۆم دەڕازێنرانـەوە. لـە کاتێکدا خانوو و کۆشکە تایبەتیەکان بە پەیکەرو وێنـەی قـەد دیـوار کـە لـە گەچ دروستکرابوون و، بە جـوانترین هونـەری بـاوی ناوچـەی حـەوزی دەریـای ناوەڕاسـت نەخشـێنرابوون و، لەسـەر مـۆدێلی گریکـی- رۆمـانی و لەگـەڵ هەندێك هونەری ساسانی رازێنرابووەوە. هەروەك چۆن لە (خەربەت ئەلمفـەجر)

(وێنەی٢٩) و کۆشکی (ئەلخیر ئەلغەربی) (وێنەی٣٠) و کۆشکی بچووکی (عەمرە)دا بەدی دەکرێت. ئەم دوالیزمییە لە سەردەمی عەباسییەکانیشدا هەر بەردەوامبوو. سەرچاوە مێژووییەکان باسدەکەن (مالّی خەلیفە) ش لە سامەرا بە وێنەی ئادەمیزادی و ئاژەڵی رازێنراوەتەوە.

لە لایەکی ترەوە دەبینین ئارەزوو و حەزلێبوون لە کتێبی یۆنانی لە سەردەمی عەباسی یەکەم و لە لایەن زانا عێراقیەکانەوە، بووە هۆی هاوردنی دەستنوسی بێزەنتی وێنە تێدا کێشراو، کە ئەمە ئاسەواری ڕوون و ئاشکرای لە سەر وێنەو نووسینە عەرەبیەکان لە بارەی ئەو بابەتانەی دەکەونە نێوان گیادەرمانی پزیشکی (وێنەی٣١) و جۆرەکانی تلیاك (وێنەی٣٢) وەك پێوەدانی مارو دەرمانکردنی ئەسپ، جێهێشت. ئەم ئاراستەیە لە نووسیندا گەشەی سەند، تا گەیشتە یەکێ لە گرنگترین تێکستە عەرەبیە وێنەییەکانی سەدەی ٦-٧ك\١٢-١٣ز، ئەویش مەقامەکانی حەریرییە (وێنەی٣٣). ئامادەکارانی ئەم تێکستە بە ئەنقەست وێنەو مالّی جیاواز و جیاجیا و شێوەی دەمو چاوو، لایەنە جیاجیاکانی ژیانی عێراقیان تێدا کێشاوە. پاشان ئەوە بوو هونەری نووسین لە عێراق لە دوای داگیرکردنی مەغۆل لە ناوچوو، ئەگەرچی لە دیمەشق و میسرتا سەدەی (٨-٩ك\١٤-١٥ز) بەردەوامبوو.

بە پێچەوانەی هونەری هەرێمەکانی باکوری ئەفریقیا، کە تەواو وێنەی ئادەمیزادی و ئاژەڵی ڕەتدەکاتەوە. فارس و هندییەکان بە تایبەتی دوای داگیرکردنی مەغۆلەکان، کاتێك وێنەسازان لە دیوەخانی پاشایی چاودێرییەکی چاکیان دەکرا، زیاتر باوەشیان بۆ هونەری وێنەکێشان کردەوە. ئەم هەرێمانە بە درێژایی سەدە یەکەمەکانی ئیسلام پارێزگارییان لەو میراتەی کە لە بارەی داب و نەریتی وێنەکێشان و پەرەپێدانی بۆیان ماوەتەوە، کردوە. قوتابخانە هونەرییە گەورەکان لە خۆراسان و وڵاتی

رافدەین (ماورء النهرین)، ئەمانە ئەو ناوچانەن، کە کولتووری فارسی و هیلینستی لەسەردەمانی پێش ئیسلام تێیدا گەشەیان سەندوەو، بە بەشدارییەکانی لە کێشانی وێنەی ئادەمیزادی و ئاژەڵی لە قەد دارو دیوار و پەیکەرەکان دەناسرێت، جا چ لە پەرەستگا یان خانووە تایبەتیەکان بێت.

لە گرنگترین ئەو داب و نەریتانەی کە کولتووری ئیسلامی لە کولتووری سەفدی فارسی بۆی مابێتەوە،نەریتی گێڕانەوەی چیرۆك و نمایشکردنی وێنەیە، ئەمەش خەسڵەتێکە ڕەنگە لە هندەوە گوازرابێتەوە، بە جۆرێك کە گێڕەرەوەکان وێنەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرت و لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکەکانیاندا نمایشیان دەکردن.

بەم جۆرە دەبینین، هەندێ لە هەرێمە ئیسلامەکان لە پارێزگاریکردن لە هەندێ داب و نەریتی هونەری وێنەکێشانی ئاژەڵی و ئادەمی لە سەر هەموو شتێکی بەکارهاتوو لە فەخفوری و شوشە و کانزاو خشڵ و شتی چنراوو دارو دیواری کۆشك و ماڵەکان و لە سەر لاپەڕەی نووسینەکانیان بەردەوامبوونە، ئەم شتانەش لە دوو توێی ئەم کتێبەدا ڕووندەبنەوە.

**پەراوێزەکان**

(١) بۆ وورده‌كاری زیاتر بروانە: عثمان، محمد عبدالستار. المدینة الاسلامیة، ژمارە ١٢٨. الكویت: المجلس الوطني للثقافة والفنون والاداب، اغسطس. هەروەها: وزیری، یحیی محمد، العمارة الاسلامیة والبیئة، عالم المعرفة، عدد ٣٠٤، الكویت: المجلس الوطني للثقافة والفنون والاداب، یونیو ٢٠٠٤.

(٢) نیبور، كارستن: رحلة الی بلاد العرب وما حولها ١٧٦١- ١٧٦٧، الجزء الاول رحلة الی مصر ١٧٦١- ١٧٦٢، ترجمة: د. مصطفی ماهر، القاهرة: المطبعة العالمیة، ١٩٧٧، ص٧٧.

(٣) شابرول، ج. دی: وصف مصر: دراسة سكان مصر المحدثین، مطبعة الجبلاوی، القاهرة: ١٩٧٦. بەشێكە لەو گەشتەی كە تێبینی و توێژینەوەی زۆری لە خۆگرتوە سەبارەت بە سوپای فەرەنسی و ئەو زانایانەی هاوەڵییان كردبوون لەو داگیركردنەی بۆ سەر میسر كردبوویان لە چارەگی یەكەمی سەدەی (١٩)، لا٩.

(٤) نیبور، سەرچاوەی پێشوو، لا٩٢_٩٣.

(٥) شابرول، سەرچاوەی پێشوو، لا١١_١٣.

(6) Lane, E. W. An Account of the Manners and Customs of Modern Egyptians, Written in Egypt the years 1833-1835. East-West publications, The Hague and London, and Livres de France, Cairo, 1836, p 92- 93.

(٧) السمهودیی، ابو الحسن علیی: خلاصة الوفا باخبار دار المصطفی، تحقیق الشیخ حمد الجاسر، المدینة المنورة: المكتبة العلمیة، دمشق: مطبعة زید بن ثابت، ١٩٧٢، ص١٣٣.

(8) Chardain, John. Sir Chardain Sir Percy Skyes (Ed). Travels in Persia. Amsterdam; N. Israel, New York, Da Capo press, 1971.

(٩) شابرول، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥.

(١٠) شابرول، هەمان سەرچاوە، ل٦١.

Chardain ,Travels in Persia, p207. )11(

Chardain ,Travels in Persia, p215. )12(

(١٣) شابرول، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠_١٠١.

(١٤) نیبور، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٠.

(١٥) هەمان سەرچاوە ، ل٢٩١.

(١٦) هەمان سەرچاوە ، ل٢٩٢.

(١٧) هەمان سەرچاوە ، ل٢٩٢.

(١٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٩٠.

(١٩) هەمان سەرچاوە ل٢٩٢.

(٢٠) هەمان سەرچاوە ، ل٢٩٢.

Chardain ,Travels in Persia, p207. )21(

(٢٢) هەمان سەرچاوە ل٢٠٧.

(٢٣) نیبور، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٣.

P223. ، Chardain,Travels in Persia)24(

(٢٥) هەمان سەرچاوە، ل٢٢٤.

(٢٦) هەمان سەرچاوە، ل٢٣٢.

(٢٧) شابرول، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢_٩٧.

P139. ، Lane, Modern, Egyptians)28(

(٢٩) المحبى، محمد امين: كتاب خلاصة الاثر فى اعيان القرن الحادى عشر، بيروت: مكتبة خياط، ١٩٦٦، ص٢٦٥.

(٣٠) المقريزى: كتاب المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار، ج١، بغداد: مكتبة المثنى، د. ت. ص٤٧٠_٤٧٩.

(٣١) شابرول، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٣_١٥٤.

Lane, Modern Egyptians P205. )32(

The Histories. Chicago; University of Chicago, 1988, )33(
Herodotus, P501.

P167- 174. ، Lane, Modern Egyptians)34(

(٣٥) مؤلف مجهول: الف ليلة وليلة.

(٣٦) نیبور، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٣.

(٣٧) شابرول، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٥.

(٣٨) شابرول، هەمان سەرچاوە، ل١٥٤.

Lane,modern Egyptians, P335. )39(

(٤٠) الجزيرى، عبدالقادر: عمدة الصفوة فى حل القهوة. مخطوطة، مكتبة باريس الوطنية، رقم ٤٥٩٠.

(٤١) البيهقى: تاريخ البيهقى.

(٤٢) وزارة الاوقاف والشؤن الاسلامية. الموسوعة الفقهية. ط٢، ج١٢، مادة تصوير، كويت: وزارة الاوقاف والشؤن الاسلامية، ١٩٨٨، ص٩٢_١٣٠.

(٤٣) وزارة الاوقاف الشؤن الاسلامية، الموسوعة الفقهية، سەرچاوەی پێشوو.

(٤٤) الطبرى، ابو جعفر محمد: تاريخ الرسل والملوك، المعروف بتاريخ الطبرى. ط٢، ج٤، القاهرة: دار المعارف، د. ت، ص١٦- ٢٠.

## پێشەکی

**ماڵی ڕۆژهەڵاتی واتە خێزانی درێژەوە بوو و ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات، ئەم شێوازە بەشێوەیەکی جەوهەری نەگۆڕاوە... خانمە نووسەر**

"کولتووری شارنشینی لە شارەکانی ڕۆژهەڵات" کتێبێکە هانی خوێنەر دەدات بۆ ئەوەی سەردانی شوێنەوارە شارستانییە دەوڵەمەندەکان لە تورکیا، میسر و ئێران لەسەدەکانی ١٦-١٨ و، کاتێکی خۆش لەگەڵ ئەو دەوروبەرەیدا بەسەر بەرێت. ئەم سەردەمە لەگەڵ ئەوەی کە چاخی گۆڕانکارییەکان بووە، چاخی گەشەسەندن و پێشکەوتنی کولتووره نەریتیەکانیشە، بەجۆرێك کاریگەری هاوردەکان لە ئەورووپاوە بۆ ڕازاندنەوەو ڕێکخستنی ناوماڵ دەستی بەزیادبوونکردبوو، ئەمەش بوو بووە هۆی تێکەڵاوبوونێکی خێرا لە نێوان شێوە جیاوازەکان، بەڵام خانووی ڕۆژهەڵاتی، واتە خێزانی درێژەوەبوو و ئەوکەسەی کە سەرپەرشتی دەکات، بەشێوەیەکی جەوهەری نەگۆڕاوەو پارێزگاری لە بەردەوامبونی پەیوەندییە نەریتەکانی و، ژیانی ڕۆژانە و ئاهەنگە کۆمەڵایەتیەکانی کردووە.

ژیانی خێزانی لە ژینگەیەکی خێزانیدا بەڕێوە دەچوو، کە خۆشگوزەرانی ماددی و، ژیانێکی دابڕاوی لە پشت دیواری خانووە پێشگیراوەکان دروستدەکرد، بەجۆرێك شتە چنراو و ڕستراوەکان (وێنەی٣٤) ڕووی پەنجەرەکانی شاردبووەوە، ئەمانەو ئەو لاکێش، قالی، جل وبەرگانەی کە بەشەکانی ناوماڵ دەڕازێننەوە، ڕوویەکی زەنگین بە ناوماڵ دەبەخشن. ئەو چنراوانەی لە ناو ماڵ هەبوون گوزارشتیان لە دەسەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتی ئەو بنەماڵەیە دەکرد، ڕۆڵێکی ئابووری چالاکیشی لە پیشەسازی و بازرگانیدا هەبوو، هەروەها ئاڵووالایی و بەکارهێنانی ڕەنگی

کاڵ و دروستکردنی شێوەی خەیاڵی لە سەرچنراوو رستراوەکان، یەکێکە لەو شێوازە سەرنج راکێشانەی کە لە چنراوی رۆژهەڵاتیدا بەدی دەکرێت. ئەم خەسڵەتە جیاکراوانەش دیسانەوە کاریگەری خۆیان لەسەر زەخرەفەی بیناسازی لە رازاندنەوەی دەستنووسەکان بەهۆی جواننووسی و، رازاندنەوەی فەخفوری وکانزاکان و پێستەی خۆشەکراوو پارچە دار،جێهێشتووە.

ئەو شتە هەڵگیراوانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە لە مۆزەخانەی سکۆتلەندی نیشتیمانی (Musuem of Scotland) National خراونەتە ڕوو، سەبارەت بەسیمای ئەم ژیانە نێوخۆییەی ناو ماڵی رۆژهەڵاتی، نمونەی ناوازەن. بەجۆرێك ئەم فەرهەنگە دانسقە چەند شتێکی هەڵگیراو لەخۆدەگرێت، کە بریتین لە هونەری فەخفوری، شوشە، کانزا، وێنەو ئەوشتە بە نرخانەی بە بۆیەی (لەك) بۆیەکراون، کارەچنراوەکان، جل وبەرگ و خشڵ و زێڕی سەدەی ١٩ تا سەدەی٢٠. گروپی ئەم مۆزەخانەیە بەشێوەیەکی سادەو ساکار لە ١٨٥٨ دەستیانکردوە بە هەڵبژاردن وهەڵگرتنی جلوبەرگ و خشڵ لە میسر، پاشان بە خێراییەکی زۆر لە ژێر سەرپەرشتی سێر رۆبەرت مردۆخ سمیت کی. سی. م. گی[1] Smith (١٨٨٥-١٩٠٠) Major General sir Robert Murdoch گەشەیکردوە. ئەم ژەنەراڵە لەدوای مێژوویەکی پیشەیی کە وەك بەڕێوەبەر لە خزمەتگوزاری فاکسی فارسی کاری کردبوو،دەستیکرد بەکارکردن لەو مۆزەخانەیە Persian Telegraph Service (١٨٦٥-١٨٨٨)، هەروەها یەکێکە لەو پێشەنگانەی، کە هونەری فارسییان خوێندووە. لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییانەی کە هەیبوون، شارەزاییەکی قووڵی لەو بارییەوە پەیداکردووە. ئەو مۆزەخانەیە کۆمەڵێك شتی نایابی لە هونەری فارسی دەستکەوت بە تایبەتیش ئەو شتانەی کە مێژوەکەیان دەکەوێتە نێوان سەدەی ١٧تا١٩. پاش ئەوە، ئەو گروپە چوارچێوە جوگرافیەکەی فراوانتر

کرد، کە نیمچە دورگەی عەرەبی، میسر، باکوری ئەفریقا، ولاّتی شام، تورکیا، ناوەڕاستی ئاسیاو هندیشی گرتەوە.

ئەم بەدەسهاتووە هەڵبژێردراوانە لە هۆڵی هەمیشەیی لە ژێر ناونیشانی (لە نێوان بەشەکانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست Within the Middle East) لە مۆزەخانەی سکۆتلەندای پاشایی Royal Museum of Scotland لە شەقامی چامبرز، ئیدنبرە نمایشکراون. ئەمە لە چوارچێوەیەکی وێناییەوە نمونەی ڕایەخ و قاڵی، جل و بەرگ و ڕازاندنەوەی ناو ماڵی رۆژهەلاّتی دەخاتەڕوو. ئەم کتێبە بەشێوەیەکی قوڵ لەم بابەتانە دەکۆڵێتەوە و، بەسەر سێ لایەنی شارە رۆژهەلاّتییەکاندا دەپرژێت، کە ژیانی خێزانی، شێوازەکانی ژیانی کۆمەلاّیەتی و لایەنی ماددی شارستانییەتەکان کە گوزارشتی لەم بابەتانەکردووە، دەپشکنێت. هەروەها ئەم کتێبە لە ڕێگەی کولتوورە هاوسێکانیانەوە بەدوای ئەو سیما هونەرییە دیاریکراوانەدا دەگەڕێت، کە دەتوانرێت بەدواداچوونیان بۆ بکرێت، وەکو چۆن لە هند دا دەردەکەوێت، بەجۆرێك هونەری وێنەکێشانیان لەبەر گوزارشتکردنی لە سروتەکانی ئاهەنگگێران بە بۆنەی لەدایەکبون وگەشەو باڵقبوون، ڕێزێکی زۆری لێدەگیرێت.

## پەراوێز

(١) رۆبرت مردۆخ سمیت: ئەندازیارو شوێنەوارناس و بەڕێوەبەری مۆزەخانە بوو. لە ساڵی ١٨٣٥ لە شارۆچکەی کیلمارنۆك هاتووەتە دنیاوە، هەر لەوێ خوێندنی تەواوکردوەو لە زانکۆی گلاسکۆ درێژەی بەخوێندن داوە .لە سالی ١٨٥٦بووە بە سەرۆکی ئەندازیارانی وەفدی شارلز نیوتن بۆ هەڵکەندنی شوێنەوارە کۆنەکان لە ئاسیای بچووك دوای سەرکەوتنی پارەکەی لەو پێشبڕکێیەی ٢٨٠ هەڵبژێردراو بەژداریان تێداکردبوو.ئینجا سەلیقەو تواناکانی ڕۆلێکی زۆریان هەبوو لە سەرکەوتنی وەفدەکەی لە دۆزینەوەی گۆڕستانی هالی کارناسۆس پەیکەرە جوانەکان کە بەیەکێ لە گرنگترین پارچەکانی مۆزەخانەی بەریتانی دادەنرێت. لەساڵی ١٨٦٣پەیوەندی کردوە بەدەزگای فاکس لە ئێران، ئەودەزگایەی کەهندو ئوروپا بەیەکەوە دەبەستەوە. هەروەها لەساڵی ١٨٦٥ بوویە بەڕێوەبەری فاکس لەتاران ولەم پێگەیەی خۆی مایەوە تا بیست ساڵ دواتر لەو ماوەیەدا بەووردی لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر هونەرو شوێنەوارە کۆنەکانی فارسەکان و بوویە یەکێ لە گەورەزانایانی ئەم بوارە.ئینجا لە ساڵی ١٨٨٥بوو بە بەڕێوەبەری مۆزەخانەی ئیدنبێر بۆ زانست و هونەر کە ئێستا بەناوی مۆزەخانەی پاشایی سکۆتلەندی ناسراوە .پاشان بەشێوەیەکی ڕەسمی خانە نشینبوو لە سوپا واتە لە ساڵی ١٨٨٧ و دواتر هەر لە ئیدنبێر مایەوەو تواناکانی لە بەڕێوەبردنی مۆزەخانە سەلماند و بە شێوەیەکی کارا لە چەندین کۆمەڵە بەژداری کردوە و تا ساڵی ١٩٠٠کۆچی دوایی کردوە.

## بەشی یەکەم: شار

" بەر پەنجەرەی دارین ڕەنگاو ڕەنگی ڕوون وەك تیشکی ڕووناکی، کە سنووری تاریکی دەشکێنێت و پەرداخە بلوورییەکان پردەکاتەوە تا لێی دەرژێت و بە ئاوی گوڵ بۆنخۆشدەکرێت، ئەم پەرداخانە لەسەر ڕاخراوێکی ئالتونی دادەنرێن و پەرداخە زیوینەکان وەکو ئەڵقەی ئەستێرەکان دەبریسکانەوە"((شاعیر جامی))[*]

ئەم دێڕە هۆنراوە دڵڕفێنانە، چەپکێکە لە بەناو بانگترین و کاریگەرترین داستانە شیعرییە کلاسیکیە-ئێرانیەکان بەناوی (یوسف و زولیخا).

شاعیر جامی[1] لە ١٤٨٣ ئەم هۆنراوەیەی نووسیوە، باس لە بابەتێکی ئەخلاقی و ئەدەبی هاوبەشی نێوان ئاینی جوولەکە، کرستیان و ئاینی ئیسلامی دەکات. سەرگوزشتەی بەندکراوێکی جوولەکە کە پیغەمبەر یوسف (سڵاوی خوای لەسەربێ) و خێزانی عەزیزی میسر (بوتیفار)، کە بۆ یەکەم جار ئەم چیرۆکە لە تەورات و لە سفری تەکوینباسکراوە، دەگێڕێتەوە.

ئینجا دیسانەوە لە قورئان وەك چیرۆکی یوسف (سڵاوی خوای لێ بێت) و زولێخا باسکراوە. شاعیرانی سەدەکانی ناوەڕاست ئەم ڕۆمانە قورئانیەیان پەرەپێداوەو کردویانە بە چیرۆکێکی خۆشەویستی خەماوی، تێیدا سۆزی

---

* تێکستە ڕەسەنەکە بەزمانی فارسی ئەمەیە:

زشربتهای رنکارنك صافی
چو نور از عکس در ظلت شکافی
بلورین جامها لب ریز کرده
بماء الورد عطر أمیز کرده
ززرین خور زمینش مطرح حوز
ز سیمین کاسهای برجی پر اختر. (وەرگێڕی عەرەبی)

زەمینی لەگەڵ رزگارکارێکی رۆحی کۆدەکاتەوە. لەو هۆنراوەیەی سەرەوە، شاعیر وێنەی هەردووکەسایەتی سەرەکی (یوسف و زولێخا)، کە لە ژینگەیەکی زەنگین و لە خۆشگوزەرانیدا دەژین، دەکات. هەرچەندە وەرگێڕانێکی فکتۆری و(**) بێ دەستکاری ئەو هۆنراوانە کراوە، بەڵام دەکرێت لەم چیرۆکەدا وێنەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە رازاندنەوەی ناوماڵ بەهۆی زەخرەفەی زۆر ناوازەو نایابی لێهەڵێنجرێت، بەجۆرێك قاپ و قاچاغی بلوری و زیوی لەگەڵ خواردن و خواردنەوەکان لە ڕووی گرنگییەوە لە هەمان ئاستدان.

ئەم بەیتە شیعریانە لەو بەشەی رۆمانەکەدایە کە زۆر بە وورده‌کارییەکاندا رۆچووە، کاتێك زولێخا لەو ئاهەنگەی کە بۆ دەستە خوشکەکانی سازی کردوە، پێغەمبەر یوسف (سلاوی خوای لێبێت) یان پێ دەناسێنێت وەکو هەولێك و پاساوهێنانەوە بۆ سەرمەست بوونی خۆی بە یوسف. لێرەدا بەهۆی جوانیەکەی یوسفەوە پەرچەکرداری هەریەکەیان جیاوازو شانۆیی دەبێت، بە جۆرێك هەندێکیان لە هۆش خۆیان دەچن و هەندێکی تریان لە جیاتی ئەوەی پرتەقاڵی نێودەستیان لەت بکەن دەستی خۆیان دەبڕن. ئینجا ئەو وێنانەی لەم چیرۆکەوە وەرگیراون، دیکۆمێنتی تەواو واقیعین لەسەر لایەنی ماددیی شارستانییەتەکان وەکو کەل و پەلی ناو ماڵ، جل و بەرگ، خشڵ و زێر. لە یەکێك لەو وێنانەی کە تێیدا وێنەی حەزرەتی یوسف (سلاوی خوای لێبێت) و زولێخا لەسەر ئەو سینییە کێشراوە کە مێژووەکەی بۆ ساڵی (١٦٩٧ -١١٠٩ ) کۆچی دەگەڕێتەوە، بە هونەرێکی زۆر جوان و لەسەر کاغەزی مقەبای (Papier mache)[٣] زۆر تەنك دروستکراوە. ئەم هونەرە لە و ماوەیەدا کە لە رازاندنەوەی کەل و

**- ئاماژەیە بەو وەرگێڕانە ئینگلیزییەی کە وەرگێڕی عەرەبی پشتی پێبەستووە. و. کوردی.

پەلی بچووکی بەکارهاتوو لەلایەن چینی ناوەند یان چینی بالاو لە ماڵە ئێرانییەکان بەکاردەهات، بەکارهێنانی باویوو، وەکو ئاوێنە، یان قوودی شانە و خشڵ یانیش هەر قودویەکی بچووك. ڕووداوەکانی ئەم بەشە لە ناو باخێکی زۆر جوان و خزمەتکراو دەستپێدەکات کە بە درەختی سەروو پەرژین کراوە، بەجۆرێك گوڵ وگوڵزاری جوان دەورەی نافورەیەکی داوە کە شوێنەکەی ڕازاندۆتەوە.

زولێخا لەسەر لاکێشێك و لە ژێر سەیوانێك کە بە قوماش پەردە پۆشکراوە دادەنیشێت، ئینجا خۆی و دەستەخوشکەکانی بە بەرگی زۆر جوان خۆیان پۆشتەکردوە کە لە چەند قەدێکی تەسك پێکهاتوون. ئەم جل و بەرگانە لە قوماشی خەت خەت و دەستە گوڵی بچووك لەسەر چنراوە، پێکدێن، ئەوەش بەپێی سەلیقەی جل و بەرگی شارنشینی سەدەی ١٧ ی ئەو سای ئێران مۆدێکی باو بوو. بەڵام قژیان لەسەر شێوەی کەزی چین چینی داپۆشراو بە کلاوێك کە لێوارەکانی بە ئیکلیل (چەند شریتێکی قوماشییە و لەسەر شێوەی تاجێك دەهۆنرێتەوە و بە گەوهەر و بەردی نایاب دەنەخشێنرێت)[٤] یان بە شاڵی چنراو بە گەوهەر، بەسترابوو.

یوسف (سلاوی خوای لیبێت) تەنها کوڕ بوو لەو ئاهەنگە ژنانەیە کە لە وێنەکەدا لەلای چەپ بە جل و بەرگی دیوەخانی پاشایی و بەرگێکی گەنجانەی کەشخەی لەبەردایە، وەستاوە. ئینجا بۆ ئاماژەکردن بە جوانیەکەی تیشکێکی نورانی دەورەی دەموو چاوی داوە[٥].

هەروەها لەوێنەکەدا چەند مەرکان و قاپی فەخاری جوان و مەوخردان و قاچاخی مسی لولەدار دەبینرێن، ئەم قاپ و قاچاخانە لەگەڵ ئەوەی بۆ ڕازندنەوە دروستکراون، بەڵام بۆ پێداویستی ڕۆژانەشبەکاردەهێنران.

وێنەی پرتەقاڵ لە میوەکانی تر زیاتر تیشکی خراوەتە سەر، کاتێك کە پێشکەشی میوانەکان کراوە. ئەمڕووداوە وێنەیەکی ووردی کۆمەڵگەی

دیوەخانی پاشایەتی لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٧دا دەخاتەڕوو. بەجۆرێك ڕێکخستنی ئاهەنگ دوور لە جیهانی دەرەوە، ئامرازی شادمانی بووە بۆ ڕابواردن و بەسەر بردنی کاتەکانی دەست بەتاڵی، هەروەها باخ، کەش و هەوایەکی سۆزداری دروستدەکات و هاندەرە بۆ ئەوەی تاك ئیلهامی شیعری بۆبێت یان شیعر بخوێنێتەوە، کە ئەمە لە کولتووری ئێرانیدا سەرنج ڕاکێش بووە. زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت هەست بە پێگەی شیعر بکرێت، بەجۆرێك بابەتە شیعرییەکانبەشێوەیەکی ڕێژەیی بەڵگەن لەسەر بەرفراوانی و بەربڵاوی گرنگیدانی ئەم کولتوورە بە ئەدەب.

ئەو سینییەی کە ئەم وێنەیەی لەسەر کێشراوە لەسەردەمی پاشا سوڵتان حوسێن (١٦٩٤-١٧٢٢) لە شاری ئەسفەهان دروستکراوە، ئەم شارە وەکو پایتەختێکی ئێران و وەك ناوەندێکی شارنشینی ڕۆژهەلاتی لە ساڵی١٥٩٨ پێشکەوت. پاشان لەناکاو و لەدوای داگیرکردنی لەلایەن ئەفغانستانەوە لە ١٧٢٢ بەرەو لاوازی ڕۆیشت. ئەو شوێنەوارە مەزنانە لە ڕووی بیناسازییەوە کە ئاسەوارەکانیان ماون، سەرسامی گەشتیارە ئەورووپیەکانیان بۆ خۆیان کێشکردووە، ئەمە سەرەڕای لە ناوچوونی شوێنەواری تری زۆر گرنگ. لەگەڵ هاتنی ١٧٨٦، ئەسفەهان ئەم ڕۆڵەی لێسەندرایەوە و پایتەخت بۆ تاران، کە تا ئێستا پایتەختی ئێرانە، گوازرایەوە. بەڵام ئەگەر شاری مەزنی تر لە ڕۆژهەلات هەبێ، ئەوا ئەستەنبوڵ یەکێ بووە لەو شارە مەزنانەی کە هاوشانی شارە فارسییەکان بووە و لە ڕووی سیاسی، ئابووری و پێگە شارستانییەکەیەوە کێبەرکێی لەگەڵدا دەکردن. ئەستەنبۆل لە دوای ڕوخانی قوستەنتینیە لەسەر دەستی سوڵتان محەمەدی دووەم (١٤٥١-٨١) بوو بە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی تورکیای عوسمانی. هەروەها قاهیرە (وێنەی ٣٥) ش هەر لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە یەکێ بوو لە

شارە گەورەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دواتریش هەروەکو پایتەختی هەرێمی عوسمانی ناسرا. شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ یەکتر و لە کولتوورێکی شارنشینیدا، کە ڕەنگدانەوەی جۆراوجۆری مێژوویی، ئابووریی، کۆمەڵایەتی، ئاینی و خوێنییە، تارادەیەکی زۆر هاوبەشن. هەروەها ئەو کارەدەستیانەی کە لە ناو ماڵەکانی ئەم شارانەدا بەکارهاتوون لەسەر جۆراو جۆرییان، بەڵگەیەکی زۆر زەق و دیارن.

لە ماوەی نێوان سەدەی ١٦، ١٩دا ڕۆژهەڵات بەشێوەیەکی ڕێژەیی بارودۆخێکی جێگیری هەبوو. واتە ئەو ماوەیەی کە بە دواداچوونەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەی تێدا ئەنجامدراوە. لەم ماوەیەدا زۆربەی شارەکانی ڕۆژهەڵات لە ژێر دەستی ئیمپراتۆرییەتی تورکی عوسمانیدا بوون (١٢٩٩-١٩٢٤)، ئیمپراتۆرییەتێك کە لە ناوەڕاستی ئەورووپا درێژ دەبۆوە و بە تورکیاو عێراق تا کەنداوی عەرەبی و دورگەی کریمیا و کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست و باکوری ئەفریقای تێپەڕاندبوو، لە بەهێزترین قۆناغیدا بوو. بەڵام ئێران ئەو ماوەی تەنگژەو شێواوی و ناجێگیرییە سەربازییە دیاریکراوەی لە نیوەی سەدەی ١٨بەخۆیەوەی بینی لێبترازێ، ئەوا لەم ماوەیەدا لەژێر دەستی سەفەوییەکان (١٥٠١- ١٧٢٢) و، دواتریش بنەماڵەی قاجارییەکان فەرمانڕەواییان دەکرد (١٧٨٦- ١٩٢٤).

ئەم ناوچەیە بەوە جیادەکرێتەوە کە لە ڕووی جوگرافیەوە جیاوازی زۆری تێدایە. لەشاخەکانی ناوەڕاستی تورکیا و ئێران بۆ دەشتاییە سەوزەکانی ئێران لە کەنارەکانی دەریای قەزوین، بەڵام زەوییە کشتوکاڵیەکان لەسەر هێڵی کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست لە تورکیاوە تا باکوری ئەفریقا درێژدەبنەوە، لەکاتێکدا دەبینین زۆربەی زەوییەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی بیابانە. هەر شارێك، ئەگەر ئەو شوێنە خوراك و ئاوو هۆیەکانی گواستنەوەو گەیاندنی تێدانەبێت، دروست نابێت و پەرەناسەنێت. کاتێك

ئـەم شـارانە دامـەزران، ئـەوا ژینگـەی رەنگـاورەنگی زۆریـان لـە رووی کۆمەڵایەتی وکولتوورییەوە پەرە پێدا و تا ئێستاش هەرماون.

بـۆ نمونـە ئەسـتەنبۆڵ (وێنـەی ٣٦)، لـە سـەرەتای دامەزراندنیـەوە لـە سەدەی ٧ی پ. ز وەکو جێنشینێکی یان ئاوەدانییەکی یۆنانی قـەبارە مـام ناوەند کە بە بێزەنتـە ناسـرابوو، دادەنـرا. شـوێنگەی ئەسـتەنبۆڵ کـۆنترۆڵی رێگا بازرگانییە تەقلیدییەکانی نێوان ئەوروپا، ئەفریقا، دەریای رەش، هندو چین دەکـات، ئەمـەش وایکـردووە ببێتـە شـوێنێکی سـتراتیجی گـرنگ کـە نمونەی کەمە. ئەم شـارە لـە رێگـەی بازرگـانی ئاورێشـم،بەهارات و بـەردی گران بەهاوە پەرەی سەندوەو لە رێگەی ئـەو سەرچاوە خۆراکیانـەی کـە لـە ناوچە هەرێمیەکانی باشوری ئەوروپاوە دەهاتن، خـۆراکی خەڵکەکـەی دابـین دەکرد. هـەروەها شـاریقاهیرە لـە سـەرەتای سـەردەمی فیرعەونیەکانـەوە، کاتێـك بـە مـەمفێس دەناسـرا، پاشـان بـە جیـزاو دواتـریش بـە تێپـەڕینی سەردەمی گریکـی و رۆمانـەکان و، دواتـر لـە هـەردوو چاخی ناوەڕاسـت و خەلافەتی عوسمانی و چـاخە نوێیـەکان، بـە بـەردەوامبوونی ئاوەدانییـەکـەی دەناسرا. قاهیرە لەو رووەوە کە شوێنێکی ستراتیجی هەیە و دەکەوێتە سـەر سەرچاوەیەکی ئاوی گەورە، ئەویش دەریاچەی نیلە لە ئەستەنبۆڵ دەچێت و، لە رێگەی ئەم سەرچاوە ئاوییەوە کۆنترۆلی ئەو رێگایانەی کە دەچنەوە سەر صەعید و سودان، کردوە. هەروەها سەرچاوە خۆراکیەکانیشی لە ناوچـە بـە پیتەکانی دەلتای نیلەوە بۆدێت.

بەڵام شارە ئێرانییە ئاوەدانەکان، لە تورکیاو میسر جۆراو جۆرتر بـوون. ئێـران جگـە لـەوەی ناوچـەیەکە لـە باکوریـەوە دەریـای قـەزوین و لـە باشوریشیەوە کەنداوی فارس هەن، ئیتر ئەو بەشـەی وڵات کـە دەمێنێتـەوە ووشـکانیەو رێـرەوی ئـاوی کـە بتوانرێـت وەك ئامرازێـك بـۆ هاتوچـۆکردن بەکاربهێنرێت، تێیدا نییە. زۆربەی رێگاوبانەکانی شارە ئێرانییەکان رێگەی

زەمینین. بۆ نمونە ئەسفەهان (وێنەی ٣٧) مێژووی ئاوەدانکردنەوەی بۆ کۆتایی سەدەی٧ دەگەڕێتەوە. ئەم شارە دەکەوێتە سەر دەشتاییەکی پان و بەپیت و فراوان لەسەر دەریاچەی (زیانده رود). ئەسفەهان خۆشبەختە لەو ڕووەوە کە هەرچەندە سەرچاوەکانی ئاو لە ئێران کەمن، ئەوا بەشێوەیەکی سەرەکی ئەسفەهان پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەستێت، کە لە ڕێگەی سیستەمێکی زۆر داهێنەرکارانەی کەناڵەکانی ئاوو ئاوەڕۆکانەوە، ئاوی بەسەر شاردا دابەشکردووە. دوای ئەوەی پایتەخت بۆ باکوری ئێران لە ساڵی ١٧٨٦دا گوازرایەوە تاران بوو بە پاتیەخت، بەمەش ئیعتباراتی بوونی ئاوو خۆراك لە نێوان ئەم دوو شارەدا یەکسانبوون. تاران هەر لە کۆنەوە ناوبانگی بە بوونی ڕەزی میوەجات و سەوزەی چاك دەرکردوە و، بە ئاسانی ئاوی لە کانیاو و کەناڵەکانی شاخی (دیماوند) دەستدەکەوێت.

ڕەنگە سەرچاوەی هەرە کارای ئاوەدانی شارە گەورەکان دانیشتوان بێت، کە لە دێر زەمانەوە لە جێنشینەکان و گروپە کۆچەرییەکان پێکهاتوون. لەم تێکەڵاوبوونەوە کۆمەڵگەیەکی شارنشینی فرەڕەنگ دروستدەبێت. بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام، بەوپێیەی هەر لەسەدەی حەوتەمەوە کە ئاینی باوی ئەو ناوچەیەیە، بۆ دۆزینەوەی شوناسێکی کەلتووری هاوبەش، کە هەندێ لە جوولەکە و کرستیانەکانبەشدارییەکی کەمیان لە کارە پیشەیی و شارەزاییە بازرگانییەکانی ئەم کەلتوورەدا کردووە، کاریکردوە. زمانی عەرەبی لە ئیسلامدا زمانی پەرستنە، وەك زمانێکی هاوبەش لە نێوان ئەو گروپانەی کە زمانی ڕەسەنیان فارسی، توركی، ئەرمەنی، سلاڤی و بەربەرین قسەی پێکراوە.

بەڵام یەکێك لە گرفتە هەمیشەییەکانی شار، کێشەی دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوون و خزمەتگوزارییەکانە بۆ دانیشتوانی، بەجۆرێك کە پێداویستییە مرۆییەکان پێویستی بە دەزگای کارگێری، ئاینی، ڕێگاوبان،

ناوچەی بازرگانی و، دابینکردنی خزمەتگوزاری ئاوی دەست شۆرەکان و ئاوی خوردانەوەیە بۆ دانیشتوانەکەی. ئەمە جگە لەوەی پێویستی بە خانووبەرەی تایبەتییە بۆ هەموو ئاستەکان. لەگەڵ ئەوەی شار بە فرەڕنگی خەڵکەکەی جیادەکرێتەوە، ئەوا شەریعەتی ئیسلامی چەندین ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لە بارەی موڵکداری گشتییەوە فۆرمەلە کردووە. ئیسلام جەخت لەسەر ڕۆڵی تاك لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی موسڵمانە ئیمانـدارەکان هەروەها لە چوارچێوەی خێزان، کە یەکەی سەرەکییە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، دەکاتەوە.

فێرکردنەکانی قورئانی پیرۆز ڕێوشوێنی ووردی لەبارەی پەیوەندی و ئەرکەکانی خێزان و، ماڵ و سامان و میراتەوە داناوە، کە ئەمە بەشێوەیەکی نادیارو تایبەتی لە ڕووی مەدەنییەوە ئاماژەکردنە بەوەی هەر خێزانێك مافی خۆیەتی لە نێو چوار دیواری شوێنی نیشتەجێبوونەکەیدا بە ئاسوودەیی ودڵنیاییەوە بژی. ئەمە بووە هۆی جیاکردنەوەی فەزای گشتی و تایبەتی لە یەکتر. ژیانی گشتی ئەوەیە، کە لە ڕێگاوبان وشەقامەکان بەڕێوەدەچێت و خزمەتگوزاری و کارەکانی کەرتی بازرگانی تێدا هەڵدەسوڕێنرێت، ئەمە لەکاتێکدا کە ژیانی تایبەتی لە ناوەوەو لە نێو حەوش و ژوورە چوار دەورگیراوەکان بەردەوام دەبێت. ئەم دوو شوێنە بەشێوەیەکی گونجاو بەیەکەوە هاوبەستەن، بەڵام مەرج نییە تێکەڵ بن.

ئەم دابەشکردنە لە ڕووی وەزیفەو فەزاوە بەپێی بارودۆخی تۆپۆگرافی (زەویناسی) و مێژوویی شارە جیاجیاکان، جیاوازییان هەیە. وا پێویست دەکات ڕێگاوبان وخانوو و باڵەخانەکان بەپێی شێوەی سروشتی ئەو زەوییەی لە بەردەستدایە، دروست بکرێت. زۆر دەگمەن بوو کە پلانی خانووبەرە لە سەر زەوییەکان بە ڕەق و ڕووتی دروستکرابا. تورکە عوسمانییەکان بوون بە میراتگری وێرانەو شوێنەوارە بیزەنتیەکانی قوستەنتینیە، کە لە پانتاییە فراوان، چۆڵکراوەکان، خانوو، باخچەی بێخزمەت، تاقو و دیوار و پەرژینی

نارێــك دەورەی ئــەو كۆشــكانەیان دابــوو پێكهــاتبوون. ئــەم شــوێنانە هۆڵیپێشوازی وكلێسەو شـوێنی نشـتەجێبوونی تایبـەتی، كـە لـە كۆشـكی ئیمپراتـۆری سـەردەمی پێشـوو جێمـابوون، لـەخۆدەگرت. ئـەم ناوچـەیە دەكەوێتـە باشـوری رۆژهـەڵاتی شـارەوە. هـەروەها بنەماڵـە دەسـەڵاتدارە موسوڵمانەكان، كە پەیڕەوی فەتحی عەرەبیان لـە میسـر دەكـرد، ناچـاربوون مامەڵە لەگەڵ ئەو بەشە لەسـەر یەكانـەی كـە دەسـەڵاتدارانی پـێش ئـەوان جێیان هێشتوون، بكەن. لە ئێران بـۆ ئـەوەی شـارێكی هـەرێمی وەك تـاران بكرێتە پایتەخت، پێوستی بە هەمواركردنی بەردەوام و چەندین دەسـتكاری تر بۆ ئەو باڵەخانە و خانووانەی كە پێشتر هەبوون، هەبوو. ئەمـە سـەرەرای نوێكردنـەوەو جێبـەجێكردنی پـرۆژەی نـوێ. لـە كۆتاییـدا ئـەم بەرنامـە خوازراوانـە لـە پـەنجاكان تـا حـەفتاكانی سـەدەی ١٩ دا هاتنـەدی و، لـە پلاندانان و بیناسازییدا بە ڕەگەزی ئەوروپی كاریگـەربوو. دەرئـەنجامی ئـەو كاریگەربوونـە شـوێنی نیشـتەجێبوونی تێكـەڵاو دەركـەوتن. واتـە لەگـەڵ پارێزگاریكردن لە كەلتووری ڕەسەن، ئەوا شتی نوێش لەرووی بیناسـازییەوە لەهەرسێ پاتەختەكە دروسـتدەكران، كـە وایلێهـات باڵەخانـە و خانووەكـان چەندین بەشیان لێ گۆڕان یا لابران، لەكاتێكدا هەندێ لەو باڵەخانـە كۆنانـە بـەهۆی نۆژەنكردنـەوەیان لەسـەر شـێوازی نـوێ نـەڕووخێنران و، هەنـدێكی تریشیان ئەگەرچی لە ڕووی‌وەزیفەوە وەكو خۆیـان مانـەوە، ئـەوا لـە ڕووی شێوەوە نوێكرانەوە.

بـەڵام لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا، دەتوانرێـت زانیاریـەك لـەبارەی قوناغـەكانی پێشـكەوتنی ئـەو ناوچـە سـەرەكیانە بزانرێـت، كـە ئەمـەش خزمەت بە پێداویستییە بە بزووت و چالاكەكانی شار دەگەیەنێت، بەجۆرێك ئەو باڵەخانانـەی بـۆ بـەرگری و پارێزگـاریكردن دروسـتكرابوون، سـنورێكی فیزیكی ئاشكرایان دروستكردبوو، كە بەشێوەیەكی نـەریتی قـەڵا شـكۆدارو

دیواره بەرزەکان دروستدەکران و بەشێکی شاری دادەبڕاند یا دەورەی شاری دەدا. شوێنی ستراتیجی ئەستەنبۆڵ بەچەند پەرژینێکی بەهێز، کە لەسەر دەمی ڕۆم و بینرەنتەکانەوە دروستکرابوون، دەورەدراوە و دەکەوێتە نێوان شاخی زێرین و دەریای مەڕمەڕ، ئەمەش بۆ پاراستنی شار لە ناوچە وشکانییەکان. بەهەمان شێوە چەند پەرژینێکی دیواری بەدەوری بەشی باشوری ڕۆژهەلاتی دوور درێژدەبووەوە، کە لە حەوت گردە یەکەمەکەی شار پێکهاتووەو شوێنگەی کۆشکی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بوو و لە سەریدا کۆمەڵگەی کۆشکەکانی (تەوبەقابی سەرای )[8]دروستکراوە. ئەو کۆشکانە سەرکردە دەسەلاتدارە عوسمانییەکانی تێدا دەژیان و، لەدیوەخانی پاشایەتی وجێگای نیشتەجێبوونی پاشا پێکهاتبوو. (وێنەی ٣٨). هەوڵی زۆر بۆ ئەوەی سیستەمێکی بەرگری کارا بۆ شاری قاهیرە دابنرێت، درا. زۆرترین، دیارترین وکاراترینی ئەو هەولانەش ئەو سیستەمە بوو کە سولتان سەلاحەددین پلانی بۆ دانا، کە لە نێوان سالانی ١١٧١ و١١٨٢تەواو بوو.

پلانەکە بەم شێوەیە بوو، دوو کۆمەلگەی سەرەکی شار لەچوارچێوەیی بازنەیەك لەدیوار بەدەوری شار دروستکراو، کۆدەکاتەوەو لە ناو ئەو پەرژینەدا کۆشکێك لەسەر زەوییەکی بەرزی نێوان دەریای نیل وچیای مرقەتەم بۆ زالبوون بەسەر کۆمەلگەکە، دروستکرا. بەلام پلانە یەك بەدوای یەکەکان بۆ پەرەسەندنی تاران ڕەنگدانەوەی مێژووی پەرەسەندنی شارەکەیە لەسەر شێوەی تیشك، کە لەناوجەرگەی شارەوە لەسەرشێوەی چەندلایەکی نارێکخراوەیی دەورە دراو، کە بەخەندەقێکی ئاوی دەستپێدەکات و پەرژینێك کە چەند تاوەرێك و شەش دەروازەی تێدایە. لەسەدەی ١٦ دروستکراوە.

لەگەڵ دەستپێکردنی سەردەمی فتحی عەلی پاشای قاچار (١٧٩٧-١٨٣٤) (وێنەی ٣٩)، ئەم دیوارە پارێزەرانەی کە وەکو پەرژین بەدەوری کۆشك وتەلارەکاندا دروستدەکران، چەندین جار نۆژەنکراوەتەوە

ودەروازەكانی بەرەنگی بریسكەدار، كە سەر گوزەشتەی ڕووبەڕووبوونـەوەی پاڵەوانی ئێرانی (ڕۆستەم )[9] لەگەڵ (دێو) ی سپی [10] كە گیان لەبـەرێكی تەواو خەیاڵییە، وێنە دەكات.

جێگـای تایبـەت بـۆ حەوانـەوەی پاشـا بـە سیستـەمی بەرگریكردنـەوە بەسترابووەوە، لەوانەش جێگای حەوانەوەی خێزان و دەست و پێوەنـدەكانی، ئەمە سەرەرای نووسینگە كارگێریەكان بۆ بەرێوە بردنی كاروباری دەوڵـەت، كـە بێگومـان ئەمانـە هـەمووی پێكـەوە كۆبوونەتـەوەو كۆمەڵگەیـەك پێكـدەهێنن و دەتوانرێـت بەشـارێكی بچـووكیش بچـوێنرێت. دەرئـەنجامی تێكەڵاوبوونی وەزیفەی بەشی تایبەت لەگەڵ بەشی گشتی ماڵەكان بـۆ ئـەو پلاندانانـە بیناسـازیە هەرەمەكیـەی لـەكاتی زیـادكردن و دروسـتكردنی باڵەخانـە و شـوێنی نشتەجێبوونی نـوێ یـا لـەكاتی دووبـارە دەسـتكاری و نۆژەنكردنەوەی شوێنە نیشتەجێبوونە كۆنەكاندا پەیڕەو دەكرا، دەگەڕێتەوە. وابـاوبوو باڵەخانـە نوێكـان لەسـەر بنچـینەو پاشمـاوەی باڵەخانـەو خـانووە كۆنەكان دروستبكرێن، بەردەوامبوون لەبەكارهێنانی شوێنە نموونەییەكان بۆ دروستكردنی شوێنی نیشتەجێبوونی نوێ كـارێكی زیرەكانـە بـوو. نموونـەی هەرە قەشـەنگ لەسـەر ئـەم حاڵەتـە كۆشـكی " تەوپـەقابی سـەرای "ە لـە ئەسـتەمبوڵ كـە لەسـەر بنچـینەو پاشمـاوە كۆنـەكانی بیزەنتـە لەباشـوری كاتدرائی (سانت سۆفیا)[11]دروستكراوە. بەپشـت بەسـتن بـە نووسـینەكانی مێژوونووسی گریكـی (كریتۆفۆلـۆس): سـوڵتان محەمـەدی دووەم لـە ١٤٥٩ فەرمانـەكانی بـە دروسـتكردنی كۆشـكێك لەناوجەرگـەی بیزەنتـەی كـۆن دەركرد، كە بەرەودەریا درێژ دەبێتەوە، بەم جۆرە بوویە كۆشكێكی زۆرجوان و لەسەرووی هەموو ئـەو كۆشـكانەوە بـوو كـە لـەوەوپێش دروسـتكرابوون، هەروەها لەڕووی شێوە، قەبارە، تێچوون وگەورەییەوە لەهەموو كۆشكەكانی تر قەشەنگتربوو. بەوپێیە شوێنی حەوانەوەی سولتان لەچوارچێوەی پەرژینـە

دیـوارێکی زۆربـەرزدا ڕووبـەرێکی زۆرگـەورەی داگیرکردبـوو. ئـەم کۆشـکە لەسەرشـێوەی چـوار حەوشـی بەیەکـەوە بەسـتراو دروسـتکراوە کـەدوانیان بەژیانی گشتی و بەڕێوبردنی کارگێڕییەوە تایبەت کرابوو، دووانەکەی تریش بۆ ژیانی تایبەتی وخێزانی تەرخانکرابوون. هەرچـوار حەوشـەکە بـەدەروازەو دەرگای گەورە پارێزگاری لێکرابوو. ئەوانەی کە ڕێپێدراوبوون ئەو دەرگایانە ببڕن و بچنە ژوورەوە، تا دەگەیشتنە ناو کۆشـك لـەو دەروازە یـەك لـەدوای یەکانەوە ژمارەیان کەمتر دەبوەوە، پاشان ئەم شـوێنە ئاوەدانییەکـەی ڕووی لەزیادبوون دەکـرد، تـا وایلێهـات لەکۆتاییـدا ئـەو چوارحەوشـە باڵەخانـەی جۆاوجۆری بەڕێوەبەرە حکومیەکان، چێشتخانە، تەویلە، دیوەخانی سوڵتان، قوتابخانــە، کتێبخانــە، مزگـەوت، کۆشـکی بچـووك بچـووك و شـوێنی نیشتەجێبوونی تایبەت کە لە ناوەڕاستی باخێکی زۆرجوان دروستکراون، لە خـۆدەگرت. هـەمان شـت لـەتارانییش هـەبوو، بـەجۆرێك بەرێوەبەرایەتییـە حکومیەکان و ماڵی پاشا و دەست و پەیوەندەکانی لەناوچەیەکدابوون کە بە پەرژینی دیواری ویە ((ئەرك))[12] دەناسرا، دەورەدرابوون. بەڵام لە تاران ئەو گەشەسەندنە هەرەمەکی تـرو بـێ سـەروبەرتر بـوو تـا ئەسـتەمبۆڵ. لێـرەدا دیواری باکوری ناوچەی (ئەرك) لەگەڵ دیوارەکانی خانووەکانی شار هاوبەش بـوو، لەکاتێکـدا خانووەکـانی نـاوەوە، کـە کۆشـکی (گوڵسـتان)[13] یـان پێکـدەهێنا (وێنـەی٤٠) بەشـێوەیەکی سـەرەکی لـە یەکـەی جیـا جیـا و بەیەکەوە نەبەسـتراو پێکـدەهاتن وەك ژوورەکـانی پێشـوازیکردن کـە ژووری کراوە بوون[14]، ئینجا ئەو حەوش وکۆشکە بچووکانەی کە لە ناو باخەکانی تایبەت بەگۆرانی و سەما دروستکرابوون، بە ئاوی کانیاوەکـان ئـاو دەدران. هەموو ئەم خۆشگوزەرانیانە لەسـەردەستی فەتح عەلی شا هاتنـەدی. فـەتح عەلی بۆ وێناکردنی گەورەیی خۆی، ئەو کۆشکە چوارچێوەیەکی گونجاو بوو. هەروەها ئەم شوێنە پەنایەکی دڵڕفێن بوو بۆئەوەی لە گەرما و تەپ وتـۆزی

دنیای دەرەوە بنەماڵەی شا بپارێزێت. ئەمەو لەکاتێکدا قەڵای‌قاهیرە هەر لە بەندیخانەیەکی سەربازی دەچوو و، پەرژینە دیوارییە گەورەکەی چەند منارە گەلێکی بەرگریکردنی لە نێودابوو. ئەم قەڵایە جێگای مەمالیکەکان، هەروەها کۆشکەکانی سوڵتان لەگەڵ شوێنی حەوانەوەی تایبەتو شوێنی کارمەندەکانی تێدابوو.

زۆربەی جار ئەو خانووانەی کە بۆ خزمەتکردنی ژیانی ڕۆژانەی دانیشتوانی شار پێویست بوون، لەسەر ئەو ڕووبەرە زەوییە دروستدەکرا، کە دەکەوتە نێوان پەرژینەکانی شار و باڵەخانە و کۆشکەکانی پاشاو سوڵتانەکان و پانتایی دەوروبەریان. لەگەڵ ئەوەی ئەم شارانە وا دەردەکەون کە قەرەباڵغ و جەنجاڵن، کەچی لەواقیعدا لەسەر پلانێکی لۆجیکی وورد دروستکراون. تۆڕی ڕێگاوبانە سەرەکیەکان لەگەڵ ئەوەی ڕێگەی هاتووچۆن، شار بۆ چەند کەرتێکی خزمەتگوزاری و شوێنی نیشتەجێبوون دابەشدەکەن. بەڵام لە چوارچێوەی هەرکەرتێکدا زۆربەی جار شەقامەکان ئاڵۆزو تەسك بوون، لە زستاندا پیس و شێدارو،لە هاوینیشدا تەپ و تۆزاوی بوون. جگە لە خانووەکان، کە یەکێکە لەپێویستیە سەرەکیەکان و لەڕووی چۆنایەتی دروستکردن و شێوەی دەرەوەیان بەپێی پێگەی کۆمەڵایەتی و زەنگینی ئەوانەی لەناویا دەژیان، جیاوازیان هەبوو، هەروەها مزگەوت، کنێس یا کڵێسایەك لەناوچەی جولەکە و ئەویتر لە ناوچەی کرستیان نشینەکان و، دوکان و بازاڕ و حەمامی گشتی هەبوو.

شار بەوە دەناسرا کە دامەزراوەی گەورەی ئاینی و بازرگانی تێدایە، ئەم دامەزراوانە لەشوێنی ستراتیجی ونزیك کۆشکی فەرمانبەر یا لەسەر ناوبڕەی نێوان ڕێگا سەرەکیەکان، یانیش لەشوێنە بەرزەکان دروستدەکران، وەکو حەوت گردەکەی ئەستەنبوڵ. دامەزرێنەرانی ئەم باڵەخانە گشتیانە لە فەرمانبەر یا ئەندامانی خێزانەکانیان، یانیش هاوولاتییە دەوڵەمەندەکان

بوون، بەڵام یارمەتی مـاددی پێویسـت بـۆ بوونیادنـانی ئـەم دامەزراوانـە و پارێزگاریکردنیـان، ئـەوا لەڕێگـەی سیسـتەمێکی ئیسـلامی خێرخـوازەوە دەهات کە بە (وەقف) دەناسرێت: واتـە لەڕێگـەی ئـەوموڵك وسـامانانەی کـە بۆخێر، وەك زەوی وخانوو دوکانی بەکرێدراو، تەرخان دەکرێن. ئەم موڵکانـە بـۆ پاڵپشتی کاری خێرخوازی، وەك دروستکردنی مزگـەوت یـا دانـانی ئـاو لەسـەر ڕێگاوبانــەکان بـۆخێر تــەرخان دەکــرێن یــا بــە شــێوەیەکی تاهــەتایی بــە کەمدەرامەتەکان دەسپاردرێن. ئەم بنەما ئیسلامیە لە نزیـك کردنـەوەی نێـوان لایەنی ئاینی و پرۆژە بازرگانیەکانـەوە وەك دروسـتکردنی مزگـەوت لەتەنیشـت بازارەکـان، فۆرمەلـە دەبێـت. لـەم بارەیـەوە ئەسـتەنبوڵ و تـاران دوو نموونـەی زۆرباشن، بەتایبەت لە ڕووی پشت بەستنی ئەمدامەزراوانە بەیەکترەوە.

ڕەنگە باشترین نمونە لە سـەر مەسـەلەی وەقف تۆبۆگرافیـای ئەسـتەمبۆڵ بێـت، کـە گومبـەز و منـارە و مزگەوتـە سـوڵتانییەکانی تێـدا بـڵاوە، وەك مزگەوتی سوڵتان محمدی دووەم (١٤٥١- ٨١) و مزگەوتی سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢- ٢٠)، و مزگەوتی سوڵتان سـلێمان قـانونی (١٥٢٠- ٦٦) و کچەکەی (مهری ماە)، کە مزگەوتەکەی بەرزتر لە لوتکەی گردی چوارەم و پێنجەم و سێیەم و شەشەم، یەك لەدوای یەك بونیادنراوە. دەوروبەری ئـەم مزگەوتانــە شــوێنی نیشــتەجێبوونی هاوشــێوەی جــوانی و قەشــەنگی مزگەوتــەکان، کــە بۆکــاری خێرخــوازی ئــاینی وخوێنــدن تــەرخانکراوون، دروسـتکراون، هـەروەها پێداویسـتیە بازرگانیـەکانیش بـە هـەمان شـێوە بایــەخیان پێــدەدرا، بۆیــە ئەســتەنبوڵ بــەجۆراجۆری پێشکەشــکردنی خزمەتگوزارییەکانی، جا ئەو خزمەتگوزارییانە بۆ خەڵکەکەی خۆی یان بـۆ گەشتیاران بێت، لە شارەکانی تر جیادەکرێتەوە. بەجۆرێك ناوچەی بازرگانی سـەرەکی دەکەوێتـە ناوجەرگـەی شـارە کۆنەکـە و، بریتیـە لـە تۆڕێـك لـە ڕێگاوبانی یەکتربڕ کە لەلایەکانیـەوە بـازاڕی کـراوە بڵاودەبنـەوە. خانـەکان

(کـاروان سـەرای)[١٤] کـە جێگـەی حەوانـەوەی بازرگانـە گەشـتیارەکان و، کۆگایـەکیش بـۆ عـەمبارکردنی کـاڵاو شـت ومەکـەکانیان بـەکاردەهات، هەروەها ئەم خانانە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری بازرگـانی دوکـانی تێـدابوو، هەندێ ڕووبەریشی بۆ شوێنی کارکردن تـەرخانکرابوو. دوکانـەکانی بـازاڕی (بەدستان)[١٦] کە بە پەرژینی دیواری دەورەدرابوو، تایبەتبوون بـە فرۆشـتنی جوانکاری و کەل و پەلی ڕازاندنەوە، ئەو دوکانانەی لـە ڕێـزی سـەرابوون ئـەو کاڵایانـەی کـە لـە ماڵەکانـدا بـەکاردەهاتن، دەفرۆشـت. لـە پـاڵ ئـەم ناوچـە بازرگانییە داخراوانەدا بازاڕی کراوەش هەبوون (وێنەی ٤١) کـە بەشـێوەیەکی تایبەتی خواردەمەنی تێدا دەفرۆشرا، بەڵام پەیوەنـدی تونـدی نێـوان وەزیفـەی ئاینی و بازرگانی لەوەدا دەردەکەوێت، کە هەر خانێك یا بەدسـتانێك بەشـێك لە داهاتەکەی بۆ پارێزگاریکردن لە مزگەوتەکان دەبەخشی.

دەشـێ یـەکێك لـە گـرنگترین جیاوگـەکانی تـری ژێرخـانی ئەسـتەنبوڵ ئەوەبێت، کـە پەیوەنـدی بـە ئـاو و گواسـتنەوە و گەیانـدن و پیشـەسـازیەوە هەیـە. تورکـە عوسمانیـەکان کاتێـك شـاری بیزەنتـەیان لـە سـاڵی ١٤٥٣ ڕزگارکرد سیستەمی ئاوو ئاوەڕۆی بیزەنتیەکانیان پەرەپێدا. ئاو لـە ڕێگـەی دارستانی بەلگراد لە ڕێگای سیستەمی بەنداوسـازی و عـەمباری و کەناڵـە ئاویەکانەوە دەگاتە ناو شار، پاشان ئەم ئاوە لە چەندین عەمباری ئاویدا لە ڕێگەی ئەو زێرابـە بەردیـە سروشـتیە زەبەلاحانـەی لـە ژێـر زەوی هـەن کـۆ دەکرێتـەوە، ئـاو بـە سـەر شـاردا دابەشـدەکرێت. لەگـەڵ ئـەوەی کـە ئـاو بەخۆڕاییبوو، کەچی تەویـەقابی سـەرای و باڵەخانـە گرنگـەکان و بنەماڵـە زەنگینـەکان بەتـەنها عـەمباری ئـاوی تایبـەت بـەخۆیان هـەبوو، بۆیـە بـۆ دروسـتکردنی ڕێگـا و شـوێنی گشـتی زۆر جـوان، کـە لـە هـەموو لایـەکی شـارەوە دەبینرا،خێـر زۆر دەکـرا (وێنـەی ٤٢)، ئـەم کـارە خێرخوازییانـە بەڕاستی جێگای دەست خۆشـیلێکردنن. هەرچـەندە ڕێگـا سـەرەکیەکان بـۆ

گواستنەوەی کاڵاو سەرنشینەکان زۆر بە باشی دروستکرابوون، ئەوا گواستنەوەی ئاوی، زۆر کاراتر و چالاکتر بوو. کەشتی بازرگانی و هەڵگری گەشتیاران بەشێوەیەکی رێك ولەکاتی خۆیدا لە کەنارەکانی دەریای شاخی زێڕین و بەسفۆرەوە دەردەچوون. لەگەڵ ئەوەی ئەستەنبوڵ بەهۆی شوێنگە جوگرافی و سیاسییەکەیەوە کە هاوتای نەبوو کۆنترۆڵی سەرچاوە سەرەکیەکانی ئاویدەکرد، لە هەمان کاتدا شارێکی پیشەسازی گرنگیش بوو. کارە دەستیەکان بەرهەمی تایبەتی بۆ (تەوبەقابی سەرای) و دامەزراوە حکومیەکانی تر بەرهەم دەهێنا، هەروەها کارگە حکومیەکانی چەك و تەقەمەنی و جل و بەرگی سەربازی بۆ سوپا و سوپای دەریاوانی دروستدەکرد. لە هەمان کاتدا شوێنی کاری دەستی تریش، کە جل وبەرگیان بەمەبەستی فرۆشتنیان لە بازاڕە کراوەکان دروستدەکرد، هەبوون. بەڵام ناوچەکانی دەوروبەری شار بۆ مومارەسەکردنی ئەو پیشانەی کە زۆر ڕەچاوی پاك و خاوێنییان تێدا ناکرێت، وەك خۆشەکردنی پێستە کە لەوناوچەیەدا زۆر باوبوو وەك (یەدی گولی) نزیك پەرژینە دیوارییە کۆنەکانی بێزەنتە، جێگایەکی گونجاوبوون. تەواوبوونی خانووەکان لەگەڵ ئەو ژێر خانە ئابوورییە سەرسوڕهێنەرە، ڕەنگدانەوەی پێگەی کۆمەڵایەتیبوو. بە گشتی پەسەندکردن لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بەشێوەیەکی ستوونیبوو، بەجۆرێك بنەماڵە زەنگینەکان لە بەرزاییەکانی شار شوێنی نیشتەجێبوونیان دروستدەکرد، هەژارەکانیش لە خانووی لە دار دروستکراوی کۆن و پیس لە نزماییەکانی شاردا دەژیان. خانووی زەنگینەکان بە باخچە گەورەکانیانەوە لەسەر کەناری باکوری دەریای بەسفۆر ریز دەبوون. زۆربەی جار هەندێ ناوچە لەوانی تر بە سیمای زەق و جوان و قەشەنگ جیادەکرانەوە، وەك ناوچەی (ئەیوب)، کە دەکەوێتە لوتکەی (شاخی زێڕین) و لە دەوری گۆڕی ئەیوب ئەنساری دروستکراوە کە

هەڵگری ئاڵای پێغەمبەر محمەدە (د. خ) و لەگەڵ یەکەم گەمارۆی عەرەبی بۆ شاری قوستەنتینیە لە ساڵی٦٧٤دا کۆچی دواییکروە. ناوچەی ئەیوب بەوپێیەی لای موسوڵمانان مەزارگەیەکی ئاینییە و ناوچەیەکی زەنگین نشینە گەشەیسەندوە و پێشکەوتووە. بەڵام ئەو گروپانەی ئەستەنبوڵ، کە موسوڵمان نەبوون لە شوێنە دوورەکان و دوور لە ناوەندی شار دەژیان. لە هەموو ئەم شوێنانە فرە ڕەنگ تر و بەجۆشتر ناوچەی (پیرا) بوو لەسەر ڕێگای شاخی زێڕین، کە شاندە دیبلۆماسە ئەورویپەکان وحەواڵەکارە بازرگانەکانیتێدا دەژیان.

بەڵام تاران جەنجاڵ تر بوو و خانووەکانی دەکەوتنە تەختایی چیاکانی (ئەلبەرز)، کە لوتکە چیای دیاوەند بەسەریادا زاڵە، بەمەش لە ڕووی شکڵی یا کۆمەڵایەتیەوە ڕەهەندێکی ئاسۆیی بە شار دەبەخشی. دامەزراوە و دەزگا کارگێرییەکانی ناوچەی (ئەرك) و دامەزراوە ئاینییە نزیکەکانی و دامەزراوە بازرگانییەکان دەکەوتنە باشووری شارەوە، کەچی کۆشکە هاوینەییەکانی دەسەڵاتدار و دەست و پێوەندەکانیان دەکەوتنە باکوری شارەوە، کە دەگەشتنە پەرژینە دیوارییەکان و تا گردەکانی دەوروبەری شار درێژ دەبوونەوە.

بە پێچەوانەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی کە بەردەوام لە تەوبەقابی سەرای دەژیان، دەسەڵاتدارە قاچارەکان ساڵانە لە خانووە زستانییەکان بۆ کۆشکی (گوڵستان) دەیان گواستەوە. لە چوارچێوەی پەرژینە دیوارییەکانی ناوچەی (ئەرك)، قاچارەکان چەند شوێنێکی نیشتەجێبوونی هاوینە، لە هەیوان یا خانووی بچووکی راوکردنەوە بگرە تا خانوویەرەی فەرمی و قەشەنگیان هەبوو. لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕێگایە ناوبڕەیە بە پێوانەی ئێستا کەمە و زۆر دوورنییە، ئەوا ئەوکات گواستنەوە وەکو گەشتێك وابوو کە خێزانی شا و کارگێران و شتومەکەکانیان لەسەر چەند چوارچەرخەیەك، کە هەندێکیان بۆ گواستنەوەی کەسەکان و هەندێکی تریان بۆ گواستنەوەی شت

و مەکـــەکان بـــەکاردەهاتن، هەڵـــدەگرت. قاچـــارەکان لەســـەر نـــەریتی گواســـتنەوەیان، تەنانـــەت لـــە دوای دووبـــارە نۆژەنکردنـــەوەی تـــارانیش لـــە شەســـتەکانی ســـەدەی ١٩ هـــەر بـــەردەوامبوون بـــۆ پارێزگاریکردنیـــان لـــە پەیوەندییە سۆزدارییەکانیان بەرابردوویانەوە، وەك خێڵێکی ڕەوەندوکۆچەر، هەروەها بەم کارەیـان حـەز و ئارەزوەکانیـان بەشـێوەیەکی کردەیـی بـە خـۆ دەربازکردن لە گەرمای هاوین و پشودان لە نێو ئـاوو و هەوایـەکی فێنـك و سارد لە ناوچەکانی باکور، دەستەبەردەکرد.

لە تاران باڵەخانەی ئایینی سەرەکی دەکەوێتە نزیك پەرژینی باشـووری ناوچەی ئەرك. ئەم مزگەوتە گەورەیە لە سەردەمی شا فەتح عەلی لە نێـوان ١٨٠٨ و ١٨١٣دا دروستکراوە. جا پاشکۆکانی مزگەوت کە درێژدەبوونەوە و دەکەوتنە نێو خانووەکانی تەنیشت مزگـەوت و لەگـەڵ پەرژینـە دیوارینـە گشـتییەکان و ڕارەوەکـانی شـار تێکـەڵ دەبـن، دروسـتبوون. مزگـەوت پەیوەندییەکی تووندی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە دوکانانـە (بـازاڕ) کـە لـە دەورەی هەن، دروستدەکات. هەریەك لە شا فەتح عـەلی و شـا ناسـرەدین (١٨٤٨-٩٦) (وێنەی ٤٣) ڕوویـەری ئـەو بازاڕەیـان فراوانکـرد، ڕێگـا و بانـەکانیان دینگـەدارکرد، دوکـان و کـاروان سـەرای نوێیـان بـۆ دروسـتکرد، هـەروەها هەوڵێکی زۆریان بۆ چاکترکردنی سیستەمی ئاوو ئاوەڕۆکانـدا. ئـاوی تـاران پشتی بە تۆڕێك لە کەناڵی ئاوی ئاڵۆز دەبەستی و، ئەم عەمبارە ئاوانـە لـە ڕێی بیرو سەرچاوە ئاوییەکانی ژێر زەوی شاخەکانی باکوری شارەوە، پڕ ئـاو دەکـران. لـە پـاڵ ئـەو بـازاڕەدا، شـوێنی کـارە دەسـتییە بچـووکەکانی وەك ئاسنگەری و فەخفورسـازی لێـرە و لـەوێ بڵاودەبوونـەوە، ئەمـە لەکاتێکـدا شوێنی چەو و گەچ و پێداویستییە سـەرەکیەکانی دروسـتکردنی خانوویـەرە دەکەوتنە ئەودیو سنوری باشوری پەرژینە دیوارییـەکانی شـار. بـەڵام تـۆڕی شەقامە تیشکدارەکان، ئەوا لە ناو جەرگەی ناوچەی ئەرك و مزگەوتەکەی و

بازاڕەکەیـــەوە دەســـتی پێـــدەکرد و، شـــاری بەســـەر چـــەند یەکەیـــەکی نیشتەجێبووندا دابەشدەکرد، کە لەگەڵ گەڕەکـە تەنگـە بـەر و تەسـکەکاندا یەکتریان دەبڕی. تارانیش هەروەك ئەستەنبوڵ دانیشتوانە هەژارەکان لە نـاو شوێنە جەنجاڵ و قەرەباڵغەکاندا دەژیان و، خانووی زەنگینەکانیش دەکەوتنە ناوچەی باکورو ڕۆژهەڵاتی تاران.

بەڵام شارەکان بەردەوام لەسەر ئەو شێوەیەی خۆیـان نامێننـەوە، بۆیـە لەسەر هەریەك لەم سێ پایتەختە پێویستیدەکرد لەگەڵ ئەو باڵـە کۆچـەرییە بەردەوامانە ڕابێن. ئـەو کۆچـەرانە یـا دەبـوو لـە نـاو دامەزرێنـەرانی ئـەو شارانەدا بتوێنەوە، یانیش لەسەر ئـەو زەویانـە بگیرسـێنەوە کـە دەکەوتنـە دەوروبەری شارەکان و، ئەو ناوانەیان داگیرکردبا. ئـەم بارودۆخـە فشـارێکی ڕاستەوخۆی لەسەر خزمەتگوزاری و یەکـە نیشـتەجێبووەکان دروستدەکرد. ئەمە جگە لەوەی خانووەکان توشی ئاگرکەوتنەوە و لافاوی خولی دەبوونەوە و ووردە ووردە دەڕوخـان، یـا زۆر بەئاسـانی ئـەو یەکـە نیشـتەجێبوونانە نەیانـدەتوانی ئـەو وەزیفانـەیان جێبەجێبکـەن کـە بۆیـان دروسـتکرابوون، ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی جموجۆڵێکی خێرا بۆ دووبارە دروسـتکردن و نۆژەنکردنـەوەی خانووبـەرەکان. تـا سـەرەتاکانی سـەدەی ١٩ ئـەم گۆڕانـە بەردەوامە بەشـێوەیەکی ڕێـژەیی حسـابی بـۆ دەکـرا و ووردە ووردە شـێوەی شارەکانی دەگۆڕی، ئەگەرچی پارێزگاری لە هەندێ لایـەنی نـەریتی دەکـرد، بـەڵام لـەماوەی نێـوان پـەنجاکان و حـەفتاکانی سـەدەی ١٩ هـەر سـێ پایتەختەکـە وازیـان لـەم جـۆرە نۆژەنکردنـەوە تەقلیدییانـە هێنـا. ناوچـە کۆنەکان نەهێڵران و ناوچە بازرگانیەکانی شـار گۆڕانکاریـان بەسـەرداهات. هۆکاری جیا جیا لەم پلانە نوێخوازەدا ڕۆڵی هەبوو. لەگەڵ کۆتـایی سـەدەی ١٩ دا دەســـەڵاتدارە عوسمانیـــەکان بەجـــدی بـــەدوای تونـــدوتۆڵکردنی پەیوەندییـەکانیان لەگـەڵ ئەوروپیەکانـدا دەگـەڕان و لەوانـەوە هونـەرکار،

بیناساز و شارەزای سەربازی بۆ گەشەپێدان و دووبارە بونیادنانەوەی دامەزراوەتەقلیدیەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیان، دەهێنران. ئیتر وردە وردە لەگەڵ گوێزرانەوەی کارگێرەکانی حکومەت بۆ وەزارەتەکانی ناو شار، تەوبەقابی سەرای وەزیفەی خۆی لەدەستدا. هەروەها شوێنی نیشتەجێبوونی پاشا گوێزرایەوە، بەو پێیەی شێوازێکی کۆنە و بۆ ئەو سەردەمە ناگونجێت. هەر لەسەدەی ١٦دا چەند بەشێکی ئەم کۆشکە بەهۆی ئەو ئاگر کەوتنەوانەی کە شار بە شێوەیەکی خولی دووچاری دەبۆوە، داتەپیی و ڕووخا. پاشان سوڵتان محەمەدی دووەم (١٨٠٨-٣٩) لەساڵی ١٨٢٦ دا بۆ کۆشکی نوێ لە (بەشکتاش)ی تەنیشت ئاوایی (پیرا) لە شاخی زێڕین بنکەی گواستەوە، بەمەش ناوەندی شاری بۆ باکوور گواستەوە. ئەم گۆڕانکارییانە هاوکات لەگەڵ خانەنشینکردنی هێزەکانی سەربازی ڕاست (الجند اليسارية) و تێکشکاندنی سەرکردایەتیەکەیان بوو. لەجێی ئەمانە تیمی مەشق پێکراو بە شێوازی نوێی دانا و لەسەر ئەو زەوییانەی دەکەوتنە دەرەوەی پەرژینی دیواری شار لە نزیك ئاوایی (پیرا) و(حەیدەر پاشا) لە بەشی ئاسیای دەریای بەسفۆر جێنشینیکردن. خولەفاکانیشی هەمان سیاسەتی ئەویان لە پەراوێزخستنی شارە کۆنەکە و جیاکردنەوەی بەشی کارگێری لە شوێنی نیشتەجێبوونی پاشا و دروستکردنی کۆشکی زیاتر پەیڕەوکرد، وەك کۆشکی دلڕفێنی (دۆڵمەی باخچە) (وێنەی٤٤)[17] کە سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم (١٨٣٩ - ٦١) فەرمانی دروستکردنی داوە و لە ساڵی (١٨٥٣) تەواو بووە (وێنەی ٤٥). ئێستا ڕووی خانوەکان و سەکۆ ئیتالیەکانی ئەم کۆشکە دەکەونە سەر کەناری دەریای (بشکتاش). هەموو ئەم گەشەسەندنانە کاریگەریان لەسەر جۆری نیشتەجێبوون لە شار هەبووە، بەجۆرێك دانیشتوانە زەنگینەکان هەمیشە خانووی هاوینەیان لەسەر کەناری دەریای بەسفۆر، کە بە (یالی)[18] ناودەبران دروستدەکرد، ئەوە بوو

لـه کۆتـایی پـەنجاکانی سـەدەی ۱۹ دا دەسـت بـەرداری ئـەم یالیانـە بـوون و،ڕێچکەی دیوەخانی سوڵتانی عوسمانیان گرت و بەرەو باکوور ڕۆشتن.

ئـەم گۆڕانانـە لـە ئەسـتەنبوڵ شـتێکی حـەتمی بـوو، کـە پەیوەنـدی عوسمانیەکان بـە پـاریس هانـدەری ئەوگۆڕانانـە بـوو و وایکـرد لـە پـەنجاو شەستەکانی سەدەی ۱۹ دا ئـەم شـارە ببێتـە خـودانی شـەقامی فـراوان و دارودرەختـی ڕازاوە، کـە باخـەکانی بـە گۆڕەپانـەکانی شـار دەبەسـتەوە، ئەمەش لەژێر فەرمانەکانی بـارۆن هۆسمـان (Haussmann) ئەنجامـدرا. پاشان پێشانگای جیهانی لە ساڵی ۱۸٦۸دا بۆ ئەوەی ڕێگا خۆشبکات بۆ شاندە بەشداربووەکانی تورکیا، میسر وئێـران تـا بەرهەمـە پیشەسـازی و دەستیەکانیان بخەنـەڕوو و دەسـتکەوتەکانی هۆسمـانیش بـە چـاوی خۆیـان ببینن، کرایەوە. سوڵتانی عوسمانی عەبدولعەزیز (۱۸٦۱- ۷٦) و خدێوی ئیسـماعیل (۱۸٦۳- ۷۹) و هەنـدێ لـە کـارگێڕە ئێرانیـەکان سـەردانی پێشـانگاکەیان کـرد و، هەنـدێك لـەناو شـاری پـاریس سـوڕانەوە. ئـەم شارەزایانە پلانەکانی شارەوانیە جیاوازەکانی بۆ باشـترکردنی شـارەکانیان خێراترکـرد. لـە ئەسـتەنبوڵ ئـاوایی (پـیرا) خرایـە ژێـر یـەکێك لـەو تاقیکردنەوانەی کە لە ڕووی پلانـدانان و بـەڕێوەبردنی شـارەوە مـەیلێکی زۆری لەسـەر بـوو. لەگـەڵ کۆتـایی شەسـتەکانی سـەدەی ۱۹ دا پەرژینـە دیوارییـە کۆنـەکانی دەوری شـار ڕوخێنـراو پـردی (جالاتـا) بـۆ بەیـەك گەیاندنی (پیرا) و شـارە کۆنەکـە دروسـتکرا. شـەقام و ڕێگـاو گۆڕەپـانی فـراوان دروسـتکران و لـە دەورەیئـەم شـەقامانەدا دوکـان و باڵەخانـەی نیشتەجێبوونی زۆر جوان دامـەزران، بـەڵام لـەقاهیرە، خـدێوی ئیسـماعیل چەندین بیرۆکەی ڕێکخستنی بۆ نوێکردنەوەی بەشەکانی شار، کـە پێشـتر بە لێکۆڵینەوەیان سـەرقاڵبوو، لـە بیردابـوو. بـەڵام ئـەم بیرۆکانـەی خـۆی لەدوای سەردانەکەی بۆ پاریس تـەواو گـۆڕی. لـەم بارەیـەوە بڕیاریـدا کـە

ئیسماعیلیە و ئەزبەکیە لە باکور و رۆژئاوای شاری قاهیرەوە فراوان بکرێتەوەو،کەرتی بازرگانی و کارگێڕی بەرەو ئەوێ گواستەوە.

دەشێ تاران ئەو شارەبێت کە گەورەترین وخێراترین گۆڕانی بەسەر داهاتبێت، بەجۆرێك شار تا ئێستاش چواردەوری بە پەرژینەکانی سەدەی ١٦ گیراوە، کە چەندین جار نۆژەنکراوەتەوە تا ئەو ئەندازەیەی وای لێ هاتووە نەتوانێت بەشێوەیەکی کارا وەزیفەکانی خۆی جێبەجێ بکات. سەرژمێری دانیشتوان زیادی کرد تا ئەو ڕادەیەی تاکەکان لە دەرەوەی ئەو پەرژینانە نیشتەجێبوون، ئەوەش لە ڕووی دابینکردنی ئاسایشی شارەوە بووە هۆی دروستبوونی گرفت. شار پێویستی بە دروستکردنی تۆڕێك ڕێگەی هاتووچۆو گواستنەوە هەبوو. هەروەها سیستەمی ئاوو ئاوەڕۆکان بەتایبەتی کە شار دووچاری لافاوی خولی دەبووەوە پێویستی بە گەشەپێدان بوو. ناسرەدین شا لە دیسەمبەری ١٨٦٨ دا بڕیاری دووبارە بوونیادنانەوەی تارانی دەرکرد. واتە دوای چەند مانگێك لە پێشانگاکەی پاریس. پاشان دەستیکرد بە ڕووخاندنی پەرژینە کۆنەکە و، ئاواییەکانی باکوری شاری تێکەڵ بەناو شار کرد، ئەمەش شاری چوار هێندەی قەبارەی خۆی فراوانکردن. ئەم ڕووبەرەی بە شێوازێکی زۆر جوان و ڕێك و پێك پەرژینکرد لەسەر شێوەی ژمارە هەشت و منارەی بۆ دانا، ئینجا بە خەندەقێکی ئاوی دەورەی گرت و، دەروازەکانی بە وێنەی قەشەنگی دیوەخانی پاشایی ڕازاندەوە، هەریەکێ لەم دەروازانە لە ١٢ دیوەخان پێکدەهات، لێرەدا ئەوەی کە پەیوەندی بە زەخرەفەی بیناسازیەوە هەبێت، ئاراستەیەکی تەقلیدی تێیدا بالادەستە.

بەلام دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەم فراوانبوونە، دانانی ناوچە کارگێری و بازرگانییەکانە لە باشوری شار بە شێوەیەکی جێگیر، ئینجا ناوچەی (ئەرك) وەك شوێنی نیشتەجێبوونی زستانە و ناوەندێکی ئیداری، وەزیفەی خۆی

جێبەجێدەکرد. بەڵام کۆشکی گوڵستان لەلایەن ناسرەدین شاوە دووبارە دروستکرایەوە. ئەو باڵەخانە و خانووانەی پاشاکانی پێش خۆی دروستیانکردبوو، هەمووی رووخاند و یەکەیپێشوازی و شوێنی نیشتەجێبونی نوێی لە جێگایان بە درێژایی نێوان ساڵانی (١٨٦٧-١٨٩٢) بونیادنایەوە. هەروەها ئەو نەریتە کۆنەی قاچارییەکان هەروەکو خۆی مایەوە، کە بریتیبوو لە کۆچکردن بۆ کۆشکە هاوینەییەکانیان. هەروەها پاشا ناسرەدین فەرمانی بە دروستکردنی چەند کۆشکێك لەسەر گردەکانی باکور دەرکرد، ئینجا گۆڕەپانیش پەرەی پێدرا و بەرەو باشوری ناوچەی ئەرك فراوانبوو، کە دەروازەیەکی بۆ چوونە ناو بازار دروستدەکرد. رەنگە گرنگترین ئەو دەستکەوتانەی لە بەرنامەی بیناسازی کە ناسرەدین شا بەدەستی هێنابێت، گەشەپێدانی باکوری تاران بۆ ئاوایی جوان ودڵرفێن، هەروەها دروستکردنی تۆڕێك لە ڕێگاوبانی فراوان بووبێت، کە ئاراستەکەی لە گۆڕەپانی نوێ و جوانەوە بەرەو ناو جەرگەی شار و گەیاندنیان بەو ڕێگایانەی کە دەچێتەوە سەر ئاوەدانیەکانی دەرەوەی پەرژینی شار، دەستپێدەکات. لە نێوان ئەم شەقامانەدا ناوچەی نیشتەجێبوون دروستبوون وخانووی سەرنجڕاکێش و باخی گۆرانی وسەمای تێدا دامەزران.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

(١) شاعیری سۆفیگەری ئێرانی نورەدین عەبدولرەحمانی کوری نیزامەدین ئەحمەدی کوری شەمسەدین دوشتی شەهیر بجامیە، مێژووناسان پێیان وایە لە ساڵی ٥٣٥ کۆچی هاتۆتە دنیاوە و لە ساڵی ٥٩٩ی کۆچی (٨٩٨ك /١٤٩٢ن) ناوبانگی لە بواری چیرۆکی سۆزداری لە شیعری فارسیدا دەرکردووە، لە گرنگترین کارە شیعریەکانی: حەوت ئاورەنەگ، یوسف و زلێخا، لەیل و مەجنون، تەسبیحی بێ گوناه و ئازادەکان.

(٢) لێرەدا ئامارەیە بۆ وەرگێرانە ئینگلیزیەکە، کە نووسەر پشتی پێبەستووە.

(٣) کاغەزی کارتۆنی: تەکنیکێکە و بریتیە لە شێلان و هەویرکاری کاغەز پاشان لەقالب گرتنی بۆ ئەوەی شێوەی داواکراو وەرگرێت و دواتر رەنگ دەکرێت، لەکۆتاییشدا بە وارنیشی (مادەیەکی بریسکەدارە) شەفاف رووپۆش دەکرێت.

(٤) ئەکلیل: دەسکێکی رێکخراوە بە گەوهەر، کە یەکێکە لەو سەرپۆشانەی کە تایبەتن بەژنان و ئەوان لەسەری دەنێن، بڕوا وایە کە عەلییەی خوشکی رەشید یەکەم کەس بەکاریهێناوە و بیرتییە لە چەند شریتیکی قوماشی و لەسەر شێوەی تاج لوول دەدرێت و بە گەوهەر و یاقوت دەرازێنرێتەوە و، لە موشا وا باس دەکەن، کە کەنیزەکان ئەم سەرپۆشە لوولدراوانە بە کۆمەڵێك شعری خۆشەویستی و نووسراو لەبارەی خۆشەویست لەسەر ئەو تاجەی کە لەسەری دەنێن و دەنەخشێن.

(٥) گۆی نورین لە راستیدا هێمایەکە بۆ پێغەمبەرایەتی و پێگەئاینییەکەی، هەروەها هەندێجاریش لەسەر وێنەی خەلیفە و سوڵتانەکانیش دادەنرا.

(٦) سولتانی عوسمانی محمد فاتح (١٤٥١– ١٤٨١) کوری چوارەمی سوڵتان مرادی دووەم و حەوتەمین سوڵتانی عوسمانی.

(٧) نیمچە دورگەی کریمیا، دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئۆکرانیا لە نێوان دەریای ڕەش و دەریای ئەزۆف.

(٨) دەستەواژەیەکی تورکی لێکدراوە بە مانای کۆشکی دەروازە تۆپین دێت.

(٩) ڕۆستەم کوری زاڵ لە بەناوبانگترین پاڵەوانەکانی ئێرانە بەو شێوەیە وێنا دەکرێ کە پێستی پڵنگی وەك جلوبەرگ لەبەردایە.

(١٠) دێو: دەستەواژەیەکی فارسیەو بە (دێڤ) دێتە سەر زار، ئەویش ناوی زیندەوەرێکی داستانییە کە ڕۆستەم کوشتویەتی. هاو واتای دێوە زمەیە.

(١١) کڵێسای قەدیسە سۆفیا، کە بە ئایە سۆفیا ناسراوە، ئەمیش مانایەکی وشەییە بۆ حاجیە سۆفیا بەمانای قەدیسە سۆفیا کە ئیمپراتۆری بیزەنتی (جستنیان) لە سەدەی شەشی زاینی دروستی کردووە، پاشان لە سەردەمی عوسمانی کراوە بە مزگەوت.

(١٢) دەستەواژەیەکی فارسیە بە مانای قەڵایەکی بچووك لە ناو قەڵایەکی گەورە.

(١٣) دەستەواژەیەکی فارسیە بە مانای باخی گوڵ و گوڵزار دێت.

(١٤) واتە هەیوان یان تەلار. بە فارسی بە مانای دیوەخان دێت و، بریتییە لە بەلەکونەی دینگەدار لە بەری پێشەوەی خانوو دروست دەکرا.

(١٥) کۆمەڵگای کاروان سەرای: دەستەواژەیەکی فارسی لێکدراوە بەمانای کۆشکی قافڵەکان ئەم جۆرە دامەزراوانە لەسەر ڕووبەری دیاریکراو بە درێژایی هێڵەکانی بازرگانی درێژ دەبونەوە.

(١٦) دەستەواژەیەکی تورکیە بەمانای بازاڕی سەر گیراو (قەیسەری)ە، کە شتومەکی گران بەهای تێدا دەفرۆشرێت.

(١٧) دەستەواژەیەکی تورکیە واتە باخی پڕ.

(١٨) دەستەواژەیەکی تورکیە واتە کەناری دەریا یان ئەو خانوانەی لەسەر کەناری دەریان.

## بەشی دووەم: خانوو

(خانووەکە دەکەوێتە جوانترین بەشەکانی کەناری دەریای بەسفۆرەوە، لە دواوەی لەسەر گردۆلکەیەك دروستکراوە، کە دیمەنێکی زۆر جوانی هەیە. بەڵام پانتایی ناوماڵەکە، ئەوا هەر زۆر سەرسوڕهێنەرە. ئەوەی بە کاروباری ماڵەکە هەڵدەستێ، پێی ووتم کە ئەم شوێنە ۸۰۰ ژووری تێدایە، من ناتوانم زۆر پێداگیری لەسەر ئەو ژمارەیە بکەم، چونکە من ژوورەکانم هەژمارنەکردوە، بەڵام ژمارەی ژوورەکان زۆر زۆرن و زۆربەشیان ڕازێنراونەتەوە و ڕووبەرێکی زۆریان بە لاکێشی نایاب داپۆشراوە. بنمیچی ژوورەکان بە ڕەنگێکی زێڕین دەردەکەون، وێنەی میوەو گوڵی زۆر جوان بە شێوازێکی سروشتی لەسەری نەخشێنراوە... ). خاتوو ماری وێرتلی مۆنتگیۆ.

ئەم نامەیەی خاتوو ماری وێرتلی مۆنتگیۆ Wortley Montagu Lady Mary[1]، یەکێکە لەو نامانەی کە زۆر بە سەرسامیەوە سەردانەکەی بۆ کۆشکی چواردە بەهار، کۆشکی (فاتمە) ی کچی سوڵتان موحەمەدی سێیەم (۱۷۰۳ ــ ۳۰) لە ساڵی ۱۷۱۸ وەسف دەکات. ئەم نامەیە ئاماژە بە پلەو پایەیی فاتیمە لای باوکی و بنەماڵەکەی دەکات. بۆ خاتری ئەو و بۆ ئامادەکردنی ئەو کۆشکە خەرجێك و ماندووبونێکی زۆر کراوە. هەروەها ئەو ڕێگایەی کە دەگاتەوە سەر ماڵەکەی دەریدەخات چەندە پێداگیری کراوە لەسەر ئەوەی دەبێ ئەو دەوروپشتە فەزایەکی سروشتی زۆر جوانی هەبێت. هەروەها ئەو شوێنەی بۆ دروستکردنی خانووەکە هەڵبژێردراوە، ڕەچاوی هەموو شتێکی تێدا کراوە.

ئەمەو چارەسەرکردنی هونەریی بۆ پانتاییەکان (لەوانەش دروستکردنی باخچەو چیمەنەکان)، سیفەتێکە لە سیفەتە جیاکراوەکانی بیناسازی تورکی. ئەوەش ئاماژەیە بەبوونی پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان ژینگەی ناوەوە و

دەرەوە (ناوەوەی شار و دەرەوەی شـار). لـە ئەسـتەنبوڵ ماڵـەکان بـە باخچـە دەورە دەدران، لـە کاتێکـدا لـە بەسـفۆر بەشـی دواوە (حەوشـی پشـتەوە)ی ماڵەکان باخچەو چیمەنی گەورەی تێدا دروستکرابوو. ئەم سیفەتانە تـەنها بـۆ ماڵی چینە باڵاو ناوەندەکان قۆرخکرابوو، بەڵام ماڵەکانی گەڕەکـە هـەژارەکان هەر ئەوەندەیان دەتوانی پانتاییەك بدۆزنەوە بۆ چاندنی چـەند نـەمامێك، جـا لەناو مـەرکانە، یانیش لەناو سندوقی تەرخانکراو دەچـێنران و لەسـەر لێـواری پەنجـەرەکان دادەنـران. هـەروەها دانیشـتوانی شـارە لادێیـەکانی وەك: (پۆرسە)،(سفرانپۆلۆ) و (عەما سیا)، بایـەخیان بـە بـاخ و چـیمەن و جـوانی سروشت دەدا. ئەم تێگەیشتنە قووڵە بۆ هاوسـەنگی نێـوان خـانوو و پانتـایی نـاوەوە لـە بیناسـازی ئێرانیشـدا دەردەکـەوێت، ئـەو فراوانبوونـەی تـاران لـە شەستەکانی سەدەی ١٩ دا بەخۆیەوە بینی، بەڵگەیەکە بـۆ ئەمـە. بـەجۆرێك خـانووی فـراوان لـەنێو بـاخ دروسـتدەکران، بـەڵام بـە شـێوەیەك کـە لـە خزمەتگوزارییـەکان و ئـەو پەرژینانـەی بـۆ دابینکردنـی ئاسایشـی شـار دەوریاندابوو، نزیك بێت. لە لادێکانی ئێران بـۆ دروسـتکردنی خانووەکانیـان، هەمان چەشنی خانووە کۆنـەکانیان نـوێ دەکـردەوە. ئـەم جـۆرە خانووانـە لـە شارەکانی وەك ئەسفەهان، شیراز، کرمان و ناوچەکانی دەوروبـەری دەبینـرێن. لەگەڵ ئەوەی شاری قاهیرە جەنجاڵترە، کەچی چارەسـەری بـۆ ئـەوەی بتوانرێـت هەر لە چوارچێوەی خانووەکـەدا هەنـدێ رووبـەری زەوی بـۆ بـاخ و باخـات و چیمەن تەرخانبکرێت، دۆزراوەتەوە. دابینکردنی پانتـایی کـراوە لـە نـاو شـار شتێکی گرنگبوو، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی پارەیـان نـەبوو و توانایـان نـەبوو لـە خانووەکانیاندا شوێنێکی تایبەت بۆ بـاخ و چـیمەن دابـین بکـەن. لـە هـەموو لایـەکی شـاری ئەسـتەنبوڵ تەنانـەت لـە (مزگەوتـەکان، مەزارگـەکان، گۆڕستانەکان) گـوڵ و گـوڵزارو درەخـت دەچـێنرا (وێنـەی ٤٦). هـەروەها لـە قاهیرە گۆڕستانی گەورە گەورە بڵاوبوون، لە ژێر قەڵای قاهیرە گۆڕی گەورە بۆ

پاشاو خێزانەکانیان دروستکرابوون. لەکاتێکدا لـە بـاکووری ئێـران قـەدپاڵی چیاکان بە گوند ئاوەدانکرابوونەوە.

لەگەڵ ئـەوەی هـەر شـارێك لـە شـارەکانی رۆژهـەڵات بـە مـۆرکی لۆکـاڵی تایبەتی خۆی لە رووی شێوازی بیناسازی و زەخرەفەوە جیادەکرێتەوە، ئەوا ئـەو بنەما گشتیانەی بۆ جیاکردنەوەی فەزای گشتی لـە تایبـەتی کـە لـە شـارەکانی رۆژهـەڵات پـەیڕەودەکرا، پرۆگرامـەکانی مـۆدێرنیزم لـە نیـوەی سـەدەی ١٩ دا نەیتوانی ئەم بنەمایانە لە نێو خۆیدا بتوێنێتەوە، بۆ نمونـە کۆشـکی زۆر جـوانی بە دینگەو بەیتونەی سەر سێگۆشـەی ڕازاوە (pediment)[٢] لەسـەر شـێوازی بیناسازی ئەوروپی کلاسیکی دروستدەکرێت، بەڵام دیسانەوە لەبەر بـوونی ئـەو پەرژینـە بەرزانـەی بـۆی دروسـتدەکرێت، نێـو ماڵـەکان لـە چـاوی خـەڵکی دەشاردرێتەوە، بەمەش تەواو وەکو هەر ماڵێکی نەریتی دێتە بەرچاو. هـەروەها لە شەقامە جەنجاڵەکانی گەڕەکەکانی شار ئەو دەرگا سـادەو سـاکارانەی کـە بـۆ ماڵەکان دروستدەکرێن، چاوی خـەڵکی لـە بەرامبـەر زەنگینـی ئـەو خێزانانـەی لەودیوی دیوارەکاندا دەژیان، دەخەڵەتاند. بەڵام ناوچەکانی دەوروبەری شـار ئـەو دەرگایانەی بە قەد دیواری سادەو نارێکـەوەن و قفڵـی گـەورەو قـایی تێخـراوە، سەرنجی کەس بۆ خۆی ڕاناکێشێت، بەمەش لە چاوی کەسی ناحەز دەپارێزێت.

گرنگی پانتایی ناوەوەی ماڵ لە وێنە مێژووییەکانی شـاری رۆژهـەڵاتی دەردەکـەوێت. دەسـتنووس و کتێبـە مێـژوویی و داسـتانە شـیعرییەکان گوزارشـت لـە جـوانی و سەرسـوڕهێنەری مـاڵی رۆژهـەڵاتی دەکـەن، بـە تایبەتیش لەسەر پانتایی ناوەوەی ماڵەکان. بۆ نمونە ئەو ڕووداوەی لە نێـوان پێغەمبەر یوسف (سلاوی خوای لێبێت) و خاتوو زولێخا ڕوویـداوە، لـە نێـو باخێکدا گوزارشتی لێکراوە، بەڵام ڕووی دەرەوەی خانووەکـە لەگـەڵ ئـەوەی زۆر بـە ووردی وێنـەو ڕەنگـی کێشـراوە، کەچـی شـێوەی گشـتی و ڕووە سروشتیەکەی خانوو وەك چۆن لە هونەری ئەوروپیدا باوە ناخاتە ڕوو.

خانووەکانی ئەستەنبوڵ بە ناسکی و ناوازەیی ئەو شێوازە بیناسازییەی جیادەکرێتەوە کە باڵەخانەوماڵەکانی هەیانە. سولتان موحەمەدی دووەم سیستەمێکی پێوانەیی پەرەپێداو، مێژوو نووسی یۆنانی (کریتۆفۆلۆس) ستایشی ئەو نوێسازییەی سولتان کە لە دروستکردنی (تەوپەقابی سەرای) ئەنجامیداوە، کردووە. ئەم مێژوو نووسە لەدوای تەواو بوونی ئەو کۆشکەو لە ساڵی ١٤٦٥ دا دەنووسێت:

((هەروەها سولتان موحەمەدی دووەم کۆشکەکەی تەواوکرد، ئەم کۆشکە جوانترین کۆشکە لەناو هەموو کۆشکەکانی تر، جا چ لەڕووی جوانی یان وەزیفی، یانیش لەڕووی ئەو زەخرەفانەوە بێت کە لەسەر دیوارەکانی نەخشێنراون. بەجۆرێك هیچ ڕوویەکی پشت گوێ نەخراوە. کاتێك لەگەڵ کۆشکە جوانەکانی جیهان بەراوردی پێدەکرێت، جوانترین کۆشکە... )).

ماڵە تایبەتیەکانی تەوپەقابی سەرای بەسەر حەوشی سێ و چوار (وێنەی ٤٧) دا دابەشکرابوو. ژیانی شارنشینی لای هەموو چینە کۆمەڵایەتیەکان پێویستی دەکرد سەلامولك، کە هۆڵی تایبەتبوو بە پیاوان و لەوێداپێشوازی لە میوانەکان دەکرا، لە حەرمولك کە بەشی تایبەتبوو بەسەرۆك خێزان و کوڕەکانی و ژن و دەستە خوشکەکان و، لەوێدا کاتیان بەسەر دەبرد، جیابکرێتەوە. لە ژیانی نێو کۆشکدا جیاکردنەوەی ژنان بەشێوەیەکی زۆر توند پەیڕەودەکرا، ئەمەش لە پلان و دابەشکردنی شوێنی ژوورەکاندا دەردەکەوێت. لە بەشی سێیەمی کۆشکەکەدا زنجیرەیەك ژوور لە دەرەوە دروستکراون کە هەر کۆمەڵە ژوورێك یەکەیەکی سەربەخۆ پێکدەهێنن، وەك ژووری دیوەخان، کتێبخانە و مزگەوت. ژووری کورسی پاشایی لە ڕێگەی دەرگایەکی بە زەخرەفە نەخشێنراو و جوان لە کۆتایی ڕاڕەوێکی درێژەوە دەتوانی پێی بگەی. ئەم شوێنە ڕۆلی سەلامولك

دەبینێت، ئەگەرچی چوونە ئەم شوێنە زۆر سنووردار کرابوو، شوێنێکی بچووکبوو و لە دوو ژووری بنمیچ بەرز پێکهاتبوو، لە دەرەوە بە بنمیچێکی هەڵگیراو کە بە هۆی چەند دینگەیەکەوە وەستاوە، بەجۆرێك ڕێگایەکی هاتووچۆی داخراوی لە هەر چوار لای شوێنەکە بۆ دروستکردبوو. ئا لەم شوێنەدابوو کە سوڵتانی عوسمانی پێشوازی لە گەورە کاربەدەست و باڵیۆزە بێگانەکان دەکرد. لە کاتێکدا حەرمولك دەکەوتە لای چەپی کۆشك و، لەپشت بەشی سێیەم و چوارەم دروستکرابوو، لەرێگەی دەروازەیەکی سادەو ساکار لە گۆشەیەکی بەشی دووەمی کۆشك دەتوانرا کەسەکان بچنە ژوورەوە. حەرمولك یەکەیەکی خود ئیکتیفایەو بە تەواوی لە بەشەکانی تری کۆشك جیاکراوەتەوە. حەرمولك بۆ خۆی لە چوار بەشی یەك لەدوای یەك پێکهاتووە، کە شوێنێکی بێپایان و ئاڵۆزەو لە سەدەی ١٦ وە تا سەدەی ١٨ ژمارەی ژوورەکانی بێ ئەندازە زیادیکردووەو گەیشتوەتە نزیکەی ٣٠٠ یەکەی بچووك و بەسەر چەند ژوورو حەوش و باخی بچووك و ڕاڕەودا دابەشکراوە.

ئەم پانتاییە کە ئاوا سەیر دەکرێت بە شێوەیەکی شپرز و لەیەك دابڕاو دێتە بەرچاو، کەچی لە ڕاستیدا بریتیە لە کۆمەڵێك یەکەی نیشتەجێبوونی بەیەکەوە بەستراو. هۆڵی بۆ نیشتەجێبوونی سوڵتان و دایکی تێدایە، دەشێت بڵێین دایکی سوڵتان کەسی یەکەمە لە بنەماڵەی عوسمانی و لەنێو هەموو ژنانی کۆشك و شازادە بچووکەکان، کە زۆرترین دەسەڵاتی بەدەستە. هەر پارچەیەك لەو کۆمەڵانە لە نهۆمێك یان دوو لە دەوری ژێر زەمینێکی لاکێشەیی یان ڕووبەرێکی کراوە پێکهاتوون. ڕەنگە پارچە زەوی دایکی سوڵتان نمونەیەك بێت بۆ جوانترین شێوازەکانی بیناسازی و گەورەترین ڕووبەر، کە لە بەشێکی تایبەت بە هۆڵەکانی پێشوازی و ژووری تایبەتی و حەمام و مزگەوتیش پێکدێت. هەموو ئەمانە لە دەوری ڕووبەرێکی چوارگۆشەی فراواندا کۆبوونەتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە لە نێوان ژوورەکان و فەزاکان هاوسەنگیەکی وورد هەیە، بەڵام لە حەرمولك زۆرجار تاك بەهۆی تەنگەبەری شوێنەکە هەست بە ترسدەکات، لە بەرامبەردا ئەو دابەشکردنە ئازادەی بۆ ژوورەکان لە بەشی چوارەم و کۆتایی کۆشکەکە کراوە، ڕەوشێکی ئازادترو ئارامتری دروستکردووە. ئەم بەشە لە باخێکی زۆر فراوان کە لەسەر چەند ئاستێکی جیاوازدایە پێکهاتووە، ئینجا بەرەو خوار سەکۆیەکی جوان و کانیەکی تێدایەو بە سەر دیمەنێکی دڵڕفێنی شاخی زێڕین دەشکێتەوە. هەرچی ئەو باڵەخانانەیە کە لە باخەکەدان زۆربەیان هی سەدەی (١٧ و ١٨) ن، شێوەی چەند کۆشکێکی[٣] هەشت لا کراوەی دڵڕفێن، کە لە هەموو لایەکانیەوە هەیوانی فراوان و چەند ژوورێکی تێدایە کە بنمیچی نەرم و پەنجەرەی فراوانیان هەیە. لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەم باڵەخانانە بە زۆری بۆ سوڵتان تەرخانکرابوون، ئەوا ڕاڕەوێکی گەورە حەرمولکی بە شوێنی سوڵتان دەبەستەوە، بەجۆرێك ژنەکانی بانگ دەکران بۆ لای سوڵتان. ئەم جۆرەی دیزاینی خانوو بنەبڕکرا تا ئەو ڕادەیەی لە سەدەی ١٩ دا ئەو کۆشکانەی دروستکران لەسەر شێوازی ئەورووپی بوون، کە ئەم شێوازی دروستکردنە شوێنی (تەوبەقابی سەرای) گرتەوە. ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی چۆن ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر بیناسازی داهات بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو جیاکردنەوەیەی کە پێشتر باسکرا بگونجێت، ڕوویاندا. بۆ نمونە کۆشکی (دۆڵمەی باخچە) کە لە ساڵی ١٨٥٣ دا دروستکرا، هۆڵە گەورەکانی پێشوازی کە بە زەخرەفە ڕازێنرابوونەوە چەندین ژووری لە دەرەوە بۆ دروستکراو بەسەر هۆڵەکانی سەلامولك و حەرمولك دابەشکرابوو، هەمووشیان دەرگاکانیان ڕوویان بەرەو ژوورەوەیە. ئەم شێوازە ئەگەرچی لەسەر ڕووبەری بچووکیش بێت، لە ماڵە زەنگینەکانی دانیشتووی ئەستەنبوڵ لاسایی کراوەتەوە.

دوو شێوازی خانوو دروستکردن لە بەردەم زەنگین و خاوەن پێگە بەرزەکانی، وەك گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەت و ئەندامانی بواری قەزایی و دام و دەزگا ئایینیەکانی تورکیای عوسمانیدا هەبوو. لە کاتێکدا (قۆناق)[٤] شێوازی خانووی شارنشینیبوو، ئەوا (یالی) شێوازێکی خانووی تربوو کە لە کەناری دەریاچەی بەسفۆر دروستدەکرا. بنەماڵەکان دەچوونە ئەو شوێنانە و هاوینیان لەوێدا بەسەردەبرد. لە کۆتایی سەدەی ١٩ دا یالی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بوو بوو بە ماڵی هەمیشەیی خێزانەکان، بەمەش بە درێژایی ساڵ هەر خێزانەکانی تێدا دەمایەوە. دەتوانرێت قۆناق لە ناوەڕاستی باخێکدا دروستبکرێت و بە پەرژینی بەرز دەورە بدرێت، بەڵام زۆربەی زۆری ئەم خانووانە ڕاستەوخۆ ڕوویان دەکەوتە سەر شەقامەکان. ئەم خانووانە هەرشێوازێکبن ئەوا بەهۆی کلیل و قفڵەوە پارێزرابوون. هەروەها سیمای هەرە جیاکەرەوەی دیوارەکانی دەرەوەی قۆناق بریتییە لە یەك لەسەر یەکی نهۆمەکانی کە شێوەیەکی دڵڕفێنی هەیە (وێنەی٤٨). دوو یا سێ نهۆمی سەرەوە هەریەکەو زیاتر لەوەی خوار خۆی، هەندێ بەرەو ڕووی دەرەوە هاتووە. ئەم نهۆمانە لەسەر ستوونی شێوە کەوانەیی ڕاگیراون، کە شێوەی هەیوانێکی هەڵواسراو پێکدەهێنێت. ئەم سیما جیاکەرەوەیە لە بیناسازی لەبەر پێویستی کردەیی و جوانی هاتەکایەوە، چونکە ئەمە ڕووبەری نهۆمەکانی سەرەوەی قۆناق زیاد دەکات و دەروازەو دیوارەکانی خوارەوە لە تیشکی هەتاوو ئاوی باران دەپارێزێت. هەر نهۆمێك ڕیزێك پەنجەرەی هەیە کە زۆر بە جوانی بەهۆی چەتر و بەر پەنجەرەی دارین و تێل بەند کراون، هەموو ئەمانە وادەکەن خانووەکە لە چاوی غەیرەو ڕووناکی زۆر بپارێزێت. هەروەها لەسەر ڕووی خانووەکەوە بنمیچێکی هەندێ لار و هەیوانێکی پان کە درێژییەکەی دوو مەتر لە ڕووبەری نهۆمی خوارەوە زیاترە، هەیە.

لە پشت ئەم ڕووەوە قۆناقی شارنشینی شکڵ وەردەگرێت، کە لە ٣٠ یا ٤٠ ژوور پێکدێت. لە دەروازەی سەرەکییەوە خانووەکە بە شێوەیەکی

نیمچە یەکسان بەسەر سەلاموڵك و حەرموڵك دابەشدەبێت، کە زۆربەی جار شێوەی دوو ڕووبەر وەردەگرێت و بەهۆی ڕاڕەوێکەوە بەیەك گەیەنراون. بەڵام شوێنی سەلاموڵك لە قۆناقی داخراودا دەکەوێتە نهۆمی یەکەمەوە ڕێك لەسەرەوەی ژووری خزمەتگوزارییەکانەوەیە. حەرموڵك لەنهۆمی سەرەوە دروستکراوە. هەریەك لە حەوشەکانی حەرموڵك و سەلاموڵك لەڕووی دابەشبوون و وەزیفەی هەر ژوورێکیانەوە لە یەکدەچن. لە نهۆمی ژێرەوەی سەلاموڵك تەویلە و کۆگا بۆ عەمبارکردنی پێداویستیەکانی ناو ماڵ، هەروەها ژووری خزمەتکارە پیاوەکان دروستدەکرێت. بەڵام نهۆمەکەی تر ناوچەی گشتی و بنچینەیی سەلاموڵك و دیوەخان پێکدەهێنێت و میوانداری و کاروکاسبی تێدا ئەنجام دەدرێت. دیوەخان بۆ دوو بەش دابەشدەکرێت، بەشە نزمەکەی نزیك دەرگایەو، بەشەکەی تر بەرزترەو بە درێژایی دیوارەکانی قاڵی لەنێودا قەدکراوە. لە دیوەخاندا پیاوانی خێزانەکەپێشوازی لە میوانەکانیان دەکەن.

بەڵام حەوشی حەرموڵك هەندێك گەرم و گوڕی پێوە دیارە، چونکە تایبەتمەندییەکانی زیاترن. کۆگاکان لە نهۆمی خوارەوە بە باخ دەورە دراون. دەروازەکەش بەرەو ڕاڕەوێك دەڕوات کە لە هەردوو لایەوە ژووری زیادە بۆ عەمبارکردنی شتی زیاترو جێگای حەوانەوەی خزمەتکارەکان هەن. بەڵامپلیکانە، ئەوا تا دەگەیشتە هۆڵی پێشوازی لەسەرەوە درێژدەبووەوە، ئەم هۆڵەش وەکو لە سەلاموڵك دابەشدەبوو،بۆ پێشوازیکردن لە خانمە میوانەکان و خزم و کەسی نزیك، بەکاردەهات. ئەو ژوورانەی لە دەوری هۆڵیپێشوازی لە هەریەك لە حەرموڵك و سەلاموڵك دروستکرابوون، وەکو ژووری دانیشتنی تر یا بۆ نوستن بەکاردەهاتن.

بەڵام یالی کە لەسەر کەناری دەریای بەسفۆر دروستدەکرا، ئەوا وەرچەرخانێکی بیناسازی زۆر جوان بوو، لە قۆناقی دروستکراو لە ناو باخ و

چیمەنەکان زۆر خۆشتر بوو. لە ڕێگەی وشکانییەوە و لە دەروازەی پەرژینی بەرزی ئەلحاجبەوە، کە بەسەر کۆمەڵێك باخەوە دەکرایەوە بۆی دەچوون. یالی خۆی لە خۆیدا بریتیبو لە شوێنێکی نیشتەجێبوونی فراوان، کە نهۆمێکی یا دوو نهۆمی پەنجەرە گەورەی چوار چێوە سادەی هەبوو و، بەسەر دەریای بەسفۆردا دەکرایەوە. ڕووی دەرەوەی یالی- کاتێك لە ڕووەکەی تریەوە تەماشای بکرێت لە ئەنجامی هاتنە دەرەوەی نهۆمی سەرەوە بۆ دەرەوە و قایمکردنی لەسەر دینگەی کەوانەیی- وێنەیەکی زۆر جوان پیشان دەدات، هەمان ئەو وێنە جوانە دەبەخشێت، کاتێك تەماشای قۆناقی شار دەکرێت. بەڵام ڕووبەری ناوەوەی یالی هۆڵێکی گەورەی بنمیچ بڵند سەلاملوك و حەرملوك ی نەریتی بە هۆی ئەو چەند بەشەی کە بۆ پێشوازیکردن و بوونی چەندین ژووری تر هەیەتی، لە یەك جیادەکاتەوە.

دەتوانرێت جۆراو جۆری زیاتر لە بیناسازی یالی بە دی بکرێت، بە جۆرێك هەندێ جار سەلاملوك و حەر ملوك لە دوو خانووی سەربەخۆ پێکدەهاتن، جاری واش هەبوو لە دوو نهۆمی جیاواز دروستدەکران و، هەندێ جاریتریش ئەو ڕووبەرەی بۆ حەرملوك تەرخاندەکرا بەشی زۆری دابەشکردنەکەی بەردەکەوت. کۆشك و کەپرەکان- کە زۆربەی کات لە ناو باخچەکاندا لەسەر شێوەی بیناسازی و زەخرەفەی نوێ دروستدەکران- دەوروبەرێکی گەرمو گوڕو ناوازەی دروستدەکرد. بەڵام باخچەکان لەوە زۆر زیاتربوون کە تەنها پاشینەیەکی جوانکاری بن بۆ ماڵەکان، بەڵکو لە هەمانکاتدا جێگای سەرنج ڕاکێشان و چاودێریکردنی بنەماڵەو دارودەستەکانیان بوون. سوڵتان موحەمەدی دووەم یەکێك بوو لە باخەوانە هەرە چالاك و شارەزاکان، بەشێوەیەك خودی سوڵتان شێوازی ڕەسەنی تەوبەقابی سەرای داناو، بە کێڵانی زەوی و چاندنی نەمام لەم کۆشکە زۆر خۆشحاڵ دەبوو. لە ئەستەنبوڵ باخ و باخچەی گشتی هەبوون. باخەوانە

تورکەکان چەندین جۆری نەمام و پیازو سەوزەو میوەی ڕەگداری سەیریان، کە بۆ بازاڕەکانی ئەستەنبوڵ بۆ ساغکردنەوەی یاخود وەك دیاری بۆ ماڵی سوڵتان دەنێردران، ناسی. شێوازەکانی بیناسازی لە جوانیدا جۆراو جۆرو سەرسوڕهێنەر بوون، تورکەکان شێوەی حەوزی گوڵ و نافورە و کانیەکانی ناو هۆڵەکانی پێشوازییان کە لەڕووی دابەشبوونیانەوە هاوشێوەی یەکتر نەبوون، پێیانباشترو جوانتر بوو لەو هاوشێوەییە فەرمیەی لە باخچەی ئێرانی داهەبوو.

هەرچەندە خانووی چینی دەوڵەمەند لە قاهیرە لەڕووی شێوازی گشتیەوە بەو قۆناقەی لە ئەستەنبوڵ هەبوو دەچوو (وێنەی ٤٩)، ئەوا لەگەڵ دروستبوونی ناوچەی نوێ لە سەدەی ١٩ دا هەندێك لەو ماڵانە بنمیچی زۆر بەرزو پەنجەرەی فراوانیان بۆ دروستکرا، بەوەش تۆخمەکانی (یالی) تورکی تێکەڵ بە شێوازە جیاکراوەکانی بیناسازی رۆژئاوایی کرا. لەگەڵ ئەوەی ئەم جۆرە خانووانە لە قاهیرە حەز پێکراوبوو، بەڵام لەگەڵ کەش و هەوای ئەوێدا نەدەگونجا، بەجۆرێك ئەم ماڵانە لە هاویندا زۆر گەرم بوون، بەڵامنەخشەسازیی نەریتی کە لە خانوویقاهیرەدا بەکاردەهات، بەشێوەیەکی کردەیی بەرگری لە گەرمای هاوین دەکرد.

ڕووی سادەو ساکاری دەرەوەی خانووەکان ژیانی ماڵەوە دەیشاردەوە، بەشێوەیەك پەنجەرەی نهۆمێك یان دوو نهۆمی سەرەوە بە بەر پەنجەرەی دارین، کە لەسەر ئەو دینگە کەوانەییانەی دەکەونە سەر دیوارەکانی نهۆمی زەمینییەوە دروستکراون، پێشیان دەگیرێت. هەروەك ئەستەنبوڵ، ئەم خەسڵەتە پانتایی ماڵەکە تا دەتوانرێت گەورەتر دەکاتەوە، هەروەها ئەم بەر پەنجەرە دارینیانە ئەو ڕووناکی و گەرمیەی کە لە شەقامەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، ڕێکدەخست. جۆراوجۆرییەکی زۆر لەسەر بنەما بنچینەییەکانی بیناسازی ڕوویاندا، کە شێوەیەکی سحراوی جیاکراوە بە ناو ماڵ

دەبەخشـێت. دەروازەی خـانوو بەسـەر حەوشـی سـەلاملوکی پیاوانـدا دەکرێتـەوە. ئـەم حەوشـە سـەرەڕای بـوونی تەویلـە، ژووری عـەمبارکردنی خـۆراك، چێشـتخانە، ئـەوا هـەیوانێکی کـراوەی تێدایـە کـە وەك شـوێنی پێشـوازیکردن لـەکاتی هاوینانـدا بـەکاردێت. جگـە لەمانـەش ژووری مـەنزەرە[٥]ی فـەرمی بـۆ پێشـوازیکردن لـە میوانـە پیاوەکـان بـەکاردێت. لەکاتێکدا دەرگایـەکی لابـەلا لـە گۆشـەیەکی زۆر دووری حەوشـەکە بـەرەو حەرمولك دەچێت و لە چەند بەشێکی ژووری نانخواردن کە لـە دەوری هـۆڵی نانخواردنی سەرەکی دروسـتکراون، پێکهـاتووە. زۆربـەی جـار بنمیچـی ئـەم هۆڵە لەسەر شێوەی گومەزی بەرز، کە بە پەنجەرەی شوشـەیی ڕەنگـاورەنگ ڕوناك دەکرێتەوە،دروستکراوە. هـەروەها دیوەخانـە بـەرزەکان دەوری هـۆڵی سـەرەکی دەدەن. قاندرمـەکان بـۆ سـەرەوەو بـەرەوژووری تـرو، سـەکۆو بەلەکۆنەو جێی دانشتنی هاوینـەی یـەك لا کـراوە تـا فێنـك بێـت. لێـرەش هـەروەك ئەسـتەنبوڵ، خـانووی دەوڵەمەنـدەکان حـەمامی تایبـەتی خـۆی تێدابوو. چەندە بنەماڵەکە زەنگین تر بن، ئەوا خانووەکەیان نهـۆمی زیـاترو ژووری زیاتری تێدا دەبوو.

لـە تـاران و شـارە سـەرەکییەکانی تـری ئێـران، کۆشـك و تـەلاری دەوڵەمەندەکان کە تاوەکو ئێستا هەر ماون و زۆربەیان هی سەدەی (١٩)ن. گۆڕانکاری جیاواز لە هەمان ئەو بنەما سەرەکییانەی لە نەخشەی ناو ماڵی خێزانیدا پەیڕەو دەکرا، دەخاتە ڕوو. هێشـتا خانووەکـان بـە پـەرژینی بـەرز دەورە دراون و، بە توندی ڕەچاوی جیاکردنەوەی بەشی پیـاوان بیرۆنـی[٦] لـە بەشی ژنان ئەندرۆنی[٧] دەکات، بەجۆرێك خانووی شارنشـینی لـە تـاران یـا خـانوو لـە گونـدەکان دیـواری ڕووی دەرەوەی دوورو درێـژبوو و هـیچ زەخرەفەیەکی لەسـەر نـەبوو، تـەنیا بـەهۆی دەرگایـەکی سـادەو سـاکار یـا دەروازەیەکی بەرزی بەقەدەوە بوو. لە چوار چێوەی ئەم پەرژینە دیوارییانەوە

باخ یاخود حەوش، فەزایـەکی بـەرفراوانی بـۆ هـەموو یەکـەکانی خانووەکـە پێکدەهێنا. کۆشکی دەسـەڵاتدارە قاچارییەکان و بنەماڵـە گـەورەکانیان و گەورە فەرمانبەرەکانیان تەواو فراوان بوون تا بتوانن یەکەی سەربەخۆ لـەناو ئەو باخەی کۆشك، لەسەر شێوەی خانووی بچووکی هەشت لایی، یـا بینـای چوارگۆشە، کە حەوشی ناوەوەی هەبوو، یا هەیوانی فراوان یا تەلاری یەك لا یـا سێ لا کـراوە، دروسـتبکەن. هـەموو ئەمانـە دەکەوتنـە چـوار چـێوەی نەخشـەی سـەرەکی خانووەکـەوە. ئـەم خانووانـە لـە ڕووی بەکارهێنانـەوە و ئەرکی جۆراو جۆریان هەبوو. بۆ نمونە سەکۆ دەشێ دەروازەیەك، یا هۆڵێکی دیوەخان یا لەکاتی کەشوهەوای گـەرم پانتاییـەك بێـت بـۆ نووسـتن، یـانیش وەکـو بەلـەکۆن گـەر لـە نهـۆمی دووەم یـا سـێیەمی خانووەکـە دابێـت، بەکاردێت. جیـاوازی ئاسـتی بڵنـدی نێـوان بەشـەکانی ماڵەکـە شـێوەیەکی سەرنج ڕاکێشی بە ماڵەکە دەبەخشی، کـە چـەند نهـۆمێکی بنمـیچ نـزم لـە دەوری بەلکۆنێکی فـراوان دروسـتدەکران، ئـەم ژوورانـەش بـە تۆڕێـك ڕاڕەو بەیەکەوە دەبەسترێنەوە.

ئەم خەسڵەتە جوان و جیاکراوەیە لـە هـەر یـەك لـە کۆشـکی گوڵسـتان (وێنەی٥٠) لە ناوچەی (ئەرك) لە تاران یا لە کۆشکی هاوینە (وێنـەی٥١) لە باکووری شار دەردەکەوێت.

شا فەتح عەلی (١٧٩٧ ــ ١٨٣٤) تـەلارێکی شـکۆداری دروسـتکردبوو و (وێنـەی ٥٢) بـۆ چـاوپێکەوتنە فەرمیـەکان و پێشـوازیکردن لـە میوانـانی، بەکاریدەهێنا. هەروەها لە چوار چێوەی ئەو تەلارە ژوور و بەشی جیاکراوەی بـۆ ژنان دروستکردبوو. بەڵام خەلیفەی دوای ئەو نـادرەدین شـا (١٨٣٤ ــ ١٨٤٨) لەگەڵ ئەوەی کاریگەری شێوازی بیناسازی ئـەورووپی هاوچـەرخی بەسـەرەوەبوو، کەچی لە کاتی نوێکردنەوەی ئەو کۆشکە لە (١٨٦٧ ـ ١٨٩٢) هەر بە هەمان نەریتی بیناسازی بە جیاکردنەوەی هەردوو بەشی ئافرەت و پیاو پابەند بـوو

و، تەلاری (فەتح عەلی شا) ی وەکو خۆی هێشتەوە. بەڵام باڵەخانەیەکی نوێ کە قاندرمەی گەورەو بڵندی هەبوو، ئەو قاندرمانە بەرەو سەرەوە دەڕۆیشتن و دەگەیشتنە هۆڵ و ژوورەکانی تریپێشوازی، ئەمەو چەند ژوورێکی تایبەت بە خۆی و، حەوشی ئەندرۆنی لەسەر دروستکرد.

کۆشکی گوڵستان بەوە جیادەکرێتەوە کە باخەکانی بەپێی سیستەمی نەریتی دروستکراون، کە کەناڵە ئاوییەکانی بەدەوری حەوزی رازاندنەوەو حەوزی گوڵ و گوڵزارو دارو درەختەکان دروستکراون. لەگەڵ ئەوەی لە رۆژهەڵات رێزو نرخی باخ و باخات زۆر دەگیرا، ئەوا لە بیناسازی شارنشینی ئێرانیشدا رۆڵێکی سەرەکی بینیوە. هەڵکەندنی شوێنەوارە کۆنەکان نەخشەسازی باخ و چیمەنی بەرفراوانی دۆزیوەتەوە، کە بۆ نیوەی سەدەی۱۷ پێش گەیشتنی ئیسلام بۆ ئێران دەگەڕێتەوە و، سەرچاوەکانی نەخشەی بیناسازی پاش ئەوماوەیەش دەردەخات. باخەکانی ئێران لەسەر شێوەی فردەوسی زەمینی دروستکرابوون و شوێنگەیەکی بۆ خۆپاراستن لە گەرمای هاوین فەراهەم دەکرد. بروا وایە کە بیرۆکەی دروستکردنی ئەم جۆرە باخانە لەو وەسفانەوە کە لە قورئانی پیرۆز سەبارەت بە فردەوس هاتوە، وەرگیرا بێت. بەڵام جۆراو جۆری باخەکان، ئەوا بەهۆی هەڵبژاردنی گوڵ و گوڵزارو نێرگزو دارو درەختی وەك سەروو دار پرتەقاڵ و هەنار و، لە رێگەی دروستکردنی سەکۆو کەناڵەکانی ئاوو رازاندنەوەی بە ماسی و مراوییەوە دەبوو. ڕەنگە کۆشکی (قاچار)ی هاوینە کە شا فەتح عەلی لە ساڵی ۱۸۰۷ دروستیکردبوو، لەسەر گرنگی و بایەخی باخات لای ئێرانیەکان باشترین بەڵگە بێت. دەتوانرێت لە رێگەی ژمارەیەك سەکۆی باخە پایە پایەکان کە بەهۆی تاڤگەی ئاوییەوە بەیەکەوە بەستراون، بە بەشەکانی ئەو کۆشکە بگەین. هەروەها کۆشکی هاوینەی نادرەدین شا- ناسراو بە دە ئاباد- کە ساڵی ۱۸۸۸ لە نزیك کۆشکی قاچار

دروستکرابوو، ڕەنگدانەوەی وەرزینێکی (تأویل) کەسی و هونەریە بۆ باڵەخانەکانی ناو باخەکە.

هەموو ئەم کۆشك و تەلارانە لەسەر ڕووبەری گەورە گەورە دروستکراون. بەڵام ئەو باخانەش کە لە حەوشە بچووکەکان دروستکراون، توانای ئەوەیان هەبوو هەمان کەش و هەوا لە ڕووی جێبوونەوەو لێکوەشاوەیی دروستبکەن. هەمیشە حەوشی بیرۆنی و ئەندرۆن بەهۆی ڕاڕەوێکی پێچاو پێچەوە بەیەکەوە بەسترابوون، بەڵام ڕەنگە لە چوار چێوەی باخێکی گەورەدا تەواو لە یەکتر جیاکراوە بن. لە هەردوو بەشی بیرۆنی و ئەندرۆن ژوورەکان ڕوویان بەسەر حەوشەوە بوو، نەریت وابوو دەبوو حەوش چوار حەوزی دەستکردی بۆ چاندنی گوڵ و گوڵزارو دارو درەخت لە دەوری حەوزێکی بازنەیی تێدابێت. ئینجا ئەو نەخشەسازییەی دەرەنجامی ئەمەیە. بەکارهێنانی جۆراوجۆر و، بە هەمان ئەندازە لە زستان و هاویندا کاریگەری هەبوو. بەلکۆنە پان و پۆڕو بە دینگەکان وەك شوێنێك بۆ پێشوازیکردن بەکاردەهێنران. لە هەندێك لە خانووەکانیشدا ئەو بەلکۆنانە پەنجەرەی گەورەی لە بنمیچەوە تا سەر زەوی هەبوو. هەروەها لە پشت هەر بەلکۆنێکەوە شوێنی نووستن و چەند ژوورێکی عەمبارکردنی تێدابوو. بەڵام لە خانووە گەورەکان، ئەو بەشانەی حەوشە کە دەکەوتنە بەرامبەر یەکتر ڕۆڵی ژووری زستانەو هاوینەیان دەبینی. دەروازەیەك هەبوو دەگەیشتە ئەو ژێر زەمینەی کە لە بەشی زستانەی خانووەکە ڕۆڵی ژووری دانیشتن و کۆبوونەوەی خێزانی دەبینی، هەروەها چەند قادرمەیەکیش لەسەریانەوە دەگاتە بەلکۆنێك، ئەم بەلکۆنەیە وەك ڕووبەرێکی کراوەی بێ بنمیچ بۆ نووستن لە بەشی هاوینەی خانووەکە دادەنرێت. خانووەکان لە ناوەڕاست و باشووری ئێران کە زۆر گەرم بوون، شێوازی بینای سەرەکی تێدا پەیڕەو دەکرا، بەڵام سەرەرای ئەوەش منارەیەکی شێوە چوارگۆشەی بەرزیان هەبوو،

لایەکانی ئەو منارەیە رۆڵی ستونی هەواگۆڕکێی دەبینی، کە هەوای بۆ ژوورەکانی خوارەوە دەنارد.

کەرەستەو شێوازەکانی بیناسازی و ڕێگاکانی دروستکردن و رازاندنەوە، ڕۆڵیان لە بوونی ئەو جیاوازییە هەرێمییەی کە مۆرکێکی جیاکراوە بە ماڵەکان دەبەخشێت، هەبووە. ڕەنگە بۆچوونی یەکەمی لەسەر ئەستەنبوڵ وادەربخات کە کەرەستەی سەرەکی بۆ دروستکردنی خانووبەرە بەرد بووبێت، وەك بەردی جیری خۆڵەمێشی و، گەچی سپی توخم زیوی، کە ڕووکاری دەرەوە و کۆپنی (الافاریز) پەنجەرەکان و بەلکۆنی کراوەی مزگەوتە گەورەکانی پۆشیوە. ئەم بۆچونە تاڕادەیەکی زۆر چەواشەکارە، چونکە کەرەستە گران بەهاکان تەنها بۆ دروستکردنی باڵەخانە گشتییە گەورەکان بەکاردەهاتن. بەڵام خانوو لەسەر هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگە لە دروستکردنیدا دار بەکاردەهات، کە ئەمەش شرۆڤەی هۆکاری داڕوخانی چەندین خانوو بەهۆی ئەو سووتانە ڕێکخراوەوە کە ئەستەنبوڵی دەگرتەوە، دەکات. تەنانەت باڵەخانە یەکەمییەکانی (تەوبەقابی سەرای)ش سەرەتا لە داری پەرژینکراو بە بەرد دروستکرابوو، پاشان وردە وردە ئەو باڵەخانانە بە باڵەخانەی بەهێزتر گۆڕان.

هۆکارگەلێك لە پشتەوەی بەکارهێنانی درەخت لە ئەستەنبوڵ هەبوون، دار زۆر و هەرزان بوو، ئەمە جگە لەو یارمەتیانەی لە دارستانەکانی هەرێمی رۆژهەڵاتی ئەوروپا و لە ڕێگای ئەنادۆڵەوە دەنێردران و، هەر کەموکورتیەکی نەبوونی داری سەرچاوە لۆکاڵییەکانی پڕدەکردەوە. لەلایەکی ترەوە بەکارهێنانی درەخت لە بیناسازیدا بە بەراورد لەگەڵ بەرد کردەیی تر و سوك تربوو. ئەم تایبەتمەندییانە سەبارەت بە شارێك کە دەکەوێتە نێو بازنەی بوومەلەرزەوە، زیندە بوون. هەروەها لەو کەش و هەوا باراناوی و شێدارەی ئەستەنبوڵ، دار باشترین کەرەستەیە تا بەرد بۆ ئەوەی

بتوانێت لەگەڵ ئاودا بگونجێت. شتێکی تریش، خانووی دارین زووتر تەواو دەبێت و ڕێگە بە دروستکردنی زەخرەفە و نەخش سازی دەدات. بۆیە بنچینەکان و نهۆمی ژێرەوەی (قۆناق)ی شاری لە بەرد دروستدەکرا و، لە سەرەوەشی نهۆمەکانی دانیشتن و هۆڵەکانی کۆبوونەوەی خێزانی لە دار دروستدەکران. کارەکە بۆ بەیەك گەیاندنی بەشەکانی ماڵەکە و، دروستکردنی دینگەی کەوانەیی ڕێکو پێك کە هەر نهۆمێکی قیت دەکردەوە، هەروەها بۆ دروستکردنی بەر پەنجەرە دارییەکان، ئەوا پێویستی بە ڕێگایەکی تایبەتی هەبوو.

ئەمەو (یالی) دارینی سەر کەناری دەریای بەسفۆر بەهەمان شێوە دروستدەکران. بەڵام لێرەدا سەرەرای ئەو مادانەی پێشتر باسکران، ماددەی تریش بەکاردەهاتن وەك قوڕی بەکارهاتوو بۆ دروستکردنی دیوار و سواغدانی سەربان و زەوی نهۆمەکانی خوارەوە و تێکەڵەی شوشەی ڕەنگاو ڕەنگ کە لە لێواری سەرەوەی پەنجەرەکان بەکاردەهاتن، دەڕازێنێتەوە. هەروەها هەر لەسەرەتای سەدەی ١٦ تاسەدەکانی دوایی ماددەی بڕۆنز و ئاسن بۆ دەرگاو پەنجەرەکان وماددەی ڕەنگاو ڕەنگ و جوان بۆ ڕووپۆشینی دیوارەکان بەکارهێنران. ئەم مادە بەکارهاتووانە لە شوێنی سەرەکی دروستکردنی فەخفوری (ئەزنیق) و(قۆتاهیا) دروستکرابوون و تەنها لە بیناسازی عوسمانی تورکەکان دەبینران، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەو مادە ڕووپۆشەرانەی لە خانووی بەنرخ و سەرنج ڕاکێش بە گوڵو گوڵزار دەبینران، تەنها بۆ ڕووپۆشینی ناوەوەی مزگەوت و کۆشکو خانووە گەورەکان بەکاردەهاتن، بەڵام لە ڕووی دەرەوەی خانووەکان بەکارنەدەهاتن تەنها لەسەر دەرگاو پەنجەرەکانی حەوشی مزگەوتەکان و لە دەوری تابلۆ دیواریەکان و بەلکۆن و دیواری هەیوانە دینگەدارەکان نەبێت، ئەمەش بۆ کەم کردنەوەی ئەو باکگراوندە بۆروسپیانەی خانووەکان هەیانە. هەروەها

بــەڕۆڵی خــۆی ڕەنگــاوڕەنگی شــێوەی دەرەوە، خانوەکــانی لەیــەکتر جیادەکردەوە. ئینجا هەریەکە لە قۆناق ویالی وەکو نەریتێك بەرەنگی سووری تاریك ڕەنگدەکران، بەڵام لەسەرەتای سەدەی ١٨بە دواوە وابــاوبوو ڕەنگی کالٚتریان بەکاردەهێنا وەك زەردو شین و سەوزو پەمەیی.

خانوەکــانی قــاهیرە (وێنــەی ٥٣) هاوشــێوەی قۆنــاق لــە ئەســتەنبوڵ دروستدەکران، بەڵام بەبەکارهێنانی ئەندازەی جیاواز لە داروبەرد و قرمید. بەجۆرێك بۆ دروستکردنی دیــواری ئەســتووری نهــۆمی خــوارەوە کــە لــە کورەکانی نزیکقاهیرەوە دەهێنران، بەردی لمی (تــابوك) بــەکاردەهات و ئــەم دیوارانە بێزەخرەفەبوون. ئەم تابوکانە شێوەیەکی لاکێشەی ڕێکیــان هــەبوو. هەرچی نهۆمەکانی سەرەوەو دینگە کەوانەییەکانە، ئەوا لە قرمیدی سوری تۆخی دروستکراو لەقوڕ دروستدەکران.

ئینجا قرمیدەکە لەسەر تێکەڵەیەك لــە کــا، گــەچ و بــەرد ڕیــز دەکــرا، دواتر بە گەچ دادەپۆشرا و زۆربەی جاریش بە خــەتی ســووری ئــاڵ و گەچــی سپی دادەپۆشــرا. بــەڵام دار بــۆ دروســتکردنی چــەترە هــەیوان و پەنجــەرەی هەیوانە داخراوەکان، بەلکۆنەکان و لە شەقامەکان یــا حەوشــی ماڵەکانــەوە دەردەکەون،بەکاردێت. هەروەها ئــەم پەنجەرانــە بــەر پەنجــەرەی دارینیــان لــە دیوی دەرەوەیان قــایم کــراوە. ئینجــا ئــەم بــەر پەنجەرانــە لــەرووی ئــاڵۆزی، وردەکاری و ناسکی نەخشاندنییانەوە دەست ڕەنگینی دارتاشی دەردەخست، بــە جۆرێــك کاتێــك خانوویــەکی نــوێ لەلایــەن خێزانێکــی دەوڵەمەنــدەوە دروستدەکرا، ئەوا بەشی دەرەوەی خانووەکــە دەبوایــە کاریگەرییــەکی زۆری لەســەر تەماشــاکار لــە ڕووی جۆراوجــۆری ئــەو زەخرەفەیــەی کــە تێیــدا بەکارهاتووە، دروستکردبایە.

لەگەڵ ئــەوەی قرمیــد لەهەریــەك لــە تورکیــاو میســر تــوخمی ســەرەکی بیناسازی پێکدەهێنا، ئەوا زۆربەی جار بۆ بناغەی خانوو بەکاردەهات و بە

جۆرێك دادەنرا كە بە بەرد یا چینێك گەچدادەپۆشرا. بەڵام لە ئێران قرمیـد لەبیناسـازیدا تـەنیا مـادەی سـەرەكی نـەبوو، بـەڵكو وەك مادەیـەك بـۆ رازاندنەوە بەكاردەهات، بەمەش لەسـەدەی ١٧ بـەدواوە دەتـوانرا باڵەخانـە ئاینییە سەرەكیەكان لە ئەسفەهان، تەهران، شیرازو شاری تری هەرێمـەكانی تـر یەكسـەر لـە گومبـەزو حەوشـەكانی تـر كـە بـەرەنگی فـەیروزی (وێنەی٥٤)شین، سپی، زەردو سەوز رەنگكرابوون و بەزەخرەفەی ئەنـدازەیی و داروبـارو نـەمامی جـوان رازێنرابـووەوە، بناسـرێنەوە و جیابكرێنـەوە. هـەروەها رووی دەرەوەی كۆشـك وخـانووە گـەورەكانی تـاران رەنگدانـەوەی تێكەڵكردنێكی گونجـاوی قرمیـدو چـەوبوون. ئـەو قرمیـدەی لـە بیناسـازی ئێرانیدا بەكاردەهات شێوە چوارگۆشەییەك بوو كـە لـە تێكەڵەیـەكی قـوڕی زەرد و لم بۆ پڕكردنـەوەی كـون و كەلەبـەرەكان بـەكاردەهات، دروسـتدەكرا. ئینجا ئەم قرمیدانە بەشێوەیەكی رێك ریزدەكران و بـە گـەچ ولم دادەپۆشـرا، جاری وا هەبوو ئەو رێزە قرمیدانە بەدوای یەكدا بـەبێ زەخرەفـە یـا لەسـەر شـێوەی جۆراوجـۆر و بـەرەو دەرەوە بـۆ ئـەوەی شـێوەیەكی جـوان بـەرووی دەرەوەی خانووەكە ببەخشێت، ریزدەكران. بۆ نموونە لەسـەر شـێوەی شـریتی یا رووبەرێك لە هێڵی یەكتربڕ ستوونی دادەنران.

هەروەها ئەو سەربانەی لە قرمید دروستدەكرا، بەرگەی دڵۆپەی دەگرت و جوانیەكی زیاتری بە خانووەكە دەبەخشـی و لـە هەمانكاتـدا ئـەو رەنگـە تێكەڵانە یەك رەنگیی قرمیدە زەردەكانی كەم دەكردەوە. بۆیـە دیوارەكـانی دەرەوە بە بۆیەی رەنگاو رەنگ جوان و دەرازێنرایەوە بـۆ ئـەوەی زەخرەفـەی ئەندازەیی رەنگكراو بـە رەنگـی فـەیروزی، سپی و زەردی لێدەربچێت. یـا دروستكردنی وێنەی هەمـەرەنگی پەمـەیی و خـەمری و زەردی كـاڵ، شـین، سەوز و پرتەقاڵی كاڵ و تۆخ فرەرەنگیی دیـوانی كۆشـك و ماڵـە گـەورەكان ناوەندێكی نموونەییـە بـۆ رووپۆشـینی ئـەو رووبـەرە سـتونییەی كـە دەروازەو

هەیوانــەکان یــانیش بەلکۆنــە ئاســۆییەکان کــە بــە حــەوش دەورە دراون دەڕازێنێتەوە، دروستدەکرد، لە کاتێکدا ئەو شاکارانەی بە دیواری دیوانەوە نەخشێنرابوون وێنەی رەنگاو رەنگن و بە جۆرێکی سەرنج راکێشی زۆر جوان بە قەد دیوارەکانەوە کێشراون کە لە لاکێش و قوماشی پەردە دەچوون و لــە سەرەوەی دەروازەی خانووەکان هەڵدەواسران. لە چالاکترین و دیارترینی ئــەو گەشەسەندنانەی کە لە سەدەی ١٩ روویانــدا، زۆربــوونی داواکــاری بــوو بــۆ ڕێنەو شــاکاری گــەورە کــە وێنــەی کورتــە چیرۆك، بەســەرهات و داســتانی پاڵەوانە کەلتووری و میللییەکانی دەکرد و هــەموو ئەمانــە لەگــەڵ واقیعــی ژیانی رۆژانەی ئەو سەردەمەدا تێکەڵ کرابوون.

هــەروەها فرەرەنگیــەکی زۆر لــە رێگــەی قــایمکردنی پارچــە شووشــەی ڕەنگاوڕەنگی سوورو زەرد بۆ ئەو چوارچێوە دارینەی لە تــاقی نیــو بازنــەیی ســەر دەروازەکــان یــا وەك چوارچــێوەی چــەتری ســکەداری پەنجــەرەکان بەکاردەهاتن، بەسەر بیناسازی شارنشــینیدا هــات. هــەروەها بــەکارهێنانی سنووورداری بەرد ڕەگەزێکی تری جوانکاری بوو، کە هیچی کەمتر نەبوو لــە وەی پێشتر کە پارچە بەردی جیری رەنگ خاکی کاڵ یــا روخــامی ســەوز لــە سەر شێوەی بەلکۆن کــە دەوری حەوشــەکانی دەدا، بــەکاردەهێنرا، جــا ئــەو شــوێنانە چ باڵەخانــەی ئــاینی یــا خــانوو بــن، ئینجــا ئــەم پارچــە بەردانــە ڕووەکانیان هەڵدەکەنرێن یا بەنــەخش و نیگــاری ناســك و لــە ســەر شــێوەی لقەداری پڕگوڵینی ناوازە کوندەکران و دەنەخشێنران.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

(١) خاتوو ماری وێرتلی مۆنتگیۆ (١٦٨٩– ١٧٦٢) ئەدیبێکی بەریتانیە ناوبانگی دەرکردووە، لە ڕێگای ئەو نامانەی کە تێیدا وەسفی ژینگەی ڕۆژهەڵاتی کردووە. هەست و سۆزێکی زۆری بەرامبەر بە ئیسلام دەربڕیوە. لە ساڵی ١٦٨٩ هاتۆتە دنیاوە و، باوکی ئەفرین بیربۆنت میراتگری هەرێمی کنسنگتۆن بوو. هەر لە منداڵییەوە خەریکی ئەدەب بووە و خۆی فێری لاتینی کردووە، پاشان وانەی ئیتاڵی و فەرەنسی و تورکی وەرگرتووە. لە ١٧١٢ بووە بە هاوسەری ئەندام پەرلەمان ئیدوارد وێرتلی مۆنتگیۆ. هاوسەرەکەی لە ساڵی ١٧١٦ بوو بە باڵیۆزی باب العالی و لەگەڵیدا چووە بۆ تورکیا. بەپێچەوانەی هاوسەرە بێگانەکانی تر خاتوو ماری دەستی کردووە بە گەڕان بەدوای خۆشگووزەرانییە چڕوو پڕەکانی قوستەنتینیە و توانایی زیاتری لە زمانی تورکی بەدەست هێناوە. سەردانی ژنانی تورکی لە حەریم و هاورێیەتی زۆرێکیانی کردووە. خاتوو مۆنتگیۆ گواسترایەوە بۆ بەریتانیا بۆ وەرگرتنی دژەتەنی جەدەری کە ئەوکات لە تورکیا بڵاو بوبۆوە، دوای ململانێیەکی دووروودرێژ لەگەڵ نەخۆشییەکەی، لە ناوەندی تەندروستی بەریتانی لە ١٧٦٢، واتە لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

(٢) pediment چەند زنجیرەیەکە لە بەری پێشەوەی خانووەکان دروست دەکرا.

(٣) کۆی دەستەواژەی کۆشکە لە دەستەواژەی کۆشکی تورکی وەرگیراوە. واتە خانووی بچووك، یان ئەو شوێنانەی کە بۆ پشودان بەکار دەهاتن، هەروەها ئامارەشە بۆ خانۆچکە.

(٤) دەستەواژەیەکی تورکیە، یەکێ لە ماناکانی واتە خانووی گەورە.

(٥) دەستەواژەیەکی گشتی خەڵکی میسرە (مەندەرە) کە لە (مەنزەرە) وەرگیراوە. ئەمە زاراوەیەکی بیناسازییە بۆ ژووری سەرەوە یان باڵکۆنی خانوو. ئەو کۆشکانەی تایبەت دەکرێن بە میوانان، زۆربەی جار لە ناوەڕاستی ژوورەکە نافورەیەکی ڕوخامی ڕەنگاوڕەنگ هەیە کە دوو یان سێ سەکۆی لە دەور دروست دەکرێت و بەرزترن لە زەوی ژوورەکان و بەلاکێش و سەرین ڕایەخ دەکرێت.

(٦) دەستەواژەیەکی فارسیە بە مانای حەوشی دەرەوەی خانوو دێت. واتە سەلاموڵك.

(٧) ئەندرۆن دەستەواژەیەکی فارسیە بە مانای حەوشی ناوەوەی خانوو دێت. واتە حەرموڵك.

## بەشی سێیەم : شوێنی نیشتەجێبوون

((لەگەڵ ئەو سادەییەی کە دارودیواری دەرەوەی خانووەکان هەیانە، ئەوا دیوی ناوەوەی خانووەکان دڵڕفێنو سەرسامکار وجێگایەکی حەوانەوەی چاکن. لە ناو خانووەکاندا زێڕ و کاری دەستی دانسق، ئالآوالآ، گەوهەرو بەردی بە نرخ دەبینرێت، کە ئەوەندە جوانن تا ئەو رادەیەی ناتوانرێت گوزارشت لەو هەستە بکرێت کە لە دەروونداجێی دەهێڵێن.

ئەم تێبینیانە هی دبلۆماتێکی روسییە کە ئەوکات بنکەی کارکردن لە ئەستەنبوڵ بوو و ئەو شتانەی تۆمارکردوە و تێیدا ئاماژەی بە سیفەتی ناوماڵی دوو لە گەورە پیاوانی دەوڵەت کردووە، ئەوانیش وەزیری باڵا (وەزیری یەکەمی سوڵتان) و دەریاوانی پاشایی (فەرماندەی یەکەمی کەشتیوانی عوسمانی). ئەم تێبینیانە پوختەیەکن دەربارەی فەلسەفەی سەرەکی رازاندنەوەی ناوماڵ و ئەوەی وەکو نەریتێك لە ناو هەموو ماڵە دەوڵەمەندەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیڕەو دەکرا. پلانی خانووەکان کە زۆر زیرەکانە بەهرەمەندیی و داهێنانی تێدا دەردەکەوێت. ئەم دیزاینە لە دابەشکردنی ژوورەکان، حەوش، سەکۆ، قاندرمەو هەیوانەکان پشتی بە بنەمایەکی سەرەکی بەستووە، ئەو بنەمایەش بریتییە لە بەکارهێنانی فەزای ناوماڵ بەشێوەیەکی زیرەکانە بۆ ئەوەی دەورووبەرێکی تایبەت بۆ ژیانی خێزانی بخولقێنێت. هەروەها ئێدوارد لین Edward lane[1] لە راپۆرتەکەیدا جەختی لەسەر چاودێریکردنی تایبەتمەندێتی ژیانی خەڵکیقاهیرە لە سەدەی ١٩ دەکاتەوە.

لە دیزاینی هەر یەکەیەکی نیشتەجێبووندا حەزێکی زۆر لە پەیڕەوکردنی سیستمی رێکخستنی ناوماڵ بەدی دەکرێت... زۆربەی جار بەرزی بەشەکانی ناوماڵ لە یەکتر جیاوازبوون، بەجۆرێك پێویستیدەکرد

کاتێك کەسێك لەناو ماڵدا بسوڕێتەوەو لە ژوورێکەوە بۆ یەکی تر بڕوات-کە هەموویان لە ریزی یەکتردان-ئەوا دەبوو چەند قادرمەیەك ببڕێت. ئامانجی بیناساز لەوەدا ئەوەیە تایبەتمەندیەکی زیاتر بە ماڵەکە ببەخشێت، ئەمەش زیاتر لەو بەشەدا دەردەکەوێت کە تایبەتە بە ئافرەتان، هەروەها بیناساز ڕەچاوی ئەوەش دەکات کە هیچ پەنجەرەیەکی خانووەکە نەکەوێتە سەر خانووی دەرودراوسێکان.

لە چوارچێوەی ئەو یاسا توندەی سەبارەت بە جیاکردنەوەی هەردوو ڕەگەز پەیڕەو دەکرا، ئەوا ناوماڵەکان بەجوانترین شێوە فەرشکرابوون و بەپێی داهاتی خێزان دەگۆڕا، ئەم حاڵەتە یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی شوێنی نیشتەجێبوون ببێتە شوێنێك کە کولتووری شارنیشینی تێدا گەشە بکات. ئەم شێوازی فەرشکردنە لە نەریتی ڕۆژئاواییەوە کە لەو سەردەمەدا لە ڕۆژئاوا پەیڕەودەکرا، دووربوو، چونکە بەشێوەیەکی نەریتی لەم ماڵانەدا خوان رازاندنەوە یا کورسی یا ژووری عەمباری لاوەکی یا قەرەوێڵەو شوێنی تایبەت بەجل و بەرگ یا مێزی رازاندنەوە لەگۆڕەێ نەبوون. فەرشی ناوماڵەکان لە لاکێش و دەسماڵ و چەرچەف پێکدەهات، جگە لە چەند ژوورێکی دیاریکراونەبێ وەك تەویلە، ژوورەکانی عەمبارکردن، چێشتخانەو حەمامەکان، ئەوا دابەشکردنێك بۆ ژوورەکان و تایبەتکردنی ژوورێك بە وەزیفەیەکی دیاریکراوەوە بوونی نەبوو. تەنانەت ژووری پێشوازیکردنی سەرەکی هەردووبەشی ژنان و پیاوان کە جگە لەوەی پانتاییەکی گەورەتریان لە ژوورەکانی تر هەبوو، ئەوا دەتوانرێت وەکو ژوورەکانی تر بۆ ژووری نان خواردن بگۆڕدرێت یا بە ئاسانی وەکو رووبەرێك بۆ شوێنی خەوتن بەکاربهێنرێت. ئینجا ئەگەر ژمارەی میوانەکان زۆر بوون، ئەوا هەیوان، سەربان و تەنانەت سەکۆی خانووەکەش وەك شوێنێك ی نەریتی بۆ دانیشتن و خواردن و خەوتن، بەکاردەهێنرێت.

ئـەم بنەمایـە سـەبارەت بـە پانتاییـەکانی ناومـاڵ -کـە چـەندین بـەکارهێنانیان هەیـە- رەهەنـدێکی کۆمەڵایـەتی و جوانکـاری هەیـە. ئـەم بنەمایە پاڵپشتی ئەولەویەتی داواکراو دەکات لە خێزانێك کە لـە ژیـارێکی ئیسلامیدا بژی، بە جۆرێك شوێنی نیشتەجێبوون وا رێکخـراوە کـە نـەرمی تێدا بێت و بتوانێت شوێنی دانیشـتن و میوانـداری بـۆ هـەموو ئەنـدامان و خزموکەسی خێزانی درێژەوە بوو، فەراهـەم بکـات. هـەروەها ئـەم بنەمایـە جێکەوتەی زمانەوانیشی لەدواوەیە، بۆ نمونە لەیەکێ لـە نووسـراوە تورکیـە عوسمانیەکان لە سەرەتای سەدەی ١٧ باس لە ئەندازیاری بیناسازی دەکـات و، پێشی وایـە کـە ئـەو دابەشـکردنەی لـە خانووەکانـدا دەکرێـت روویـەکی جوانکاری بە ناو ماڵ دەبەخشێت. جگـە لـە و رووبەرانـەی بـۆ چێشـتخانە، حەمام، شوێنی تەقەتکردنی ماڵ و سـامان یـا ژووری عـەمبارکردنی شـتی جۆرا وجۆر تـەرخانکراون، ئـەوا ژوورەکـان تـەنها بـەپێی خەسـڵەتی شـوێن، کەش و هەواو وەسف دەکرێن. بەجۆرێك ژوورەکـانی نهـۆمی سـەرەوە ژوورە هاوینییەکانن و ئەوانەی نهۆمی خوارەوە ژوورە زستانییەکانن، کە ئەمـەش بـە لەبـەر چـاوگرتنی سروشـتی ئـەو کـەش و هەوایـەی ناوچـەی رۆژهـەڵات هەیەتی، بۆ چوونێکی لۆژیکییە. ئینجا ژوورەکان هەندێکیان بنمیچەکانیان تەختن و هەندێکی تریان گومبەزی لاکێشەیی و بەعزێکیان بازنەییان هەیە، هەروەها هەندێکی تری ژوورەکـان حەوشـی دەرەوەیـان هەیـە. بـەڵام ژووری میوان بەشێوەیەکی تایبەتی بۆی دەڕوانرێت، ئەمەش لەبەرئـەوەی میـوان و میوانداریی لە کولتووری رۆژهەڵاتیدا بایـەخێکی زۆری پێـدەدرێت. ئـەوەتا ووشەی (سەلامولك)ی تورکی مانای ژووری پیاوانە لە هەمان کاتدا مانـای ژووری میوانیش دەگەیەنێت.

چـنراوە دەسـتییەکان لـە تێکـەڵاوکردنی نێـوان نـەرمی (مرونـة) لـە دابەشکردنی پانتایی ناوەوەی ماڵ و پیداویستییە مرۆییەکان لـە زەخرەفـەو

ڕەنگ، دەوروبەرێکی نمونەیی فەراهەمکردوە. بەجۆرێك پیشەسازی ڕستن و چنین لە شارەکانی ڕۆژهەڵات گەشەی سەند تا ئەو ڕادەیەی دەیتوانی پێداویستی بازاڕە لۆکاڵییەکان پڕبکاتەوە، لەهەمان کاتیشدا بۆ بازاڕەکانی دەرەوەش ڕەوانە دەکران. شوێنی جۆلاکانی (شوێنی ڕەنگکردن ودروستکردنی قوماش) ئەستەنبوڵ قوماشی زۆر چاك و جوانی بەرهەم دەهێنان و بازاڕەکانیشی چنراوی سوفی نمایش دەکرد، کە لە بازاڕەکانی دیمەشق و حەلەبەوە هاوردبوونی. ئەمبازاڕانە بەقوماشی ئاوریشمی چاك ناوبانگیان دەرکردبوو. هەروەها بازاڕی قوماشی کەتان و پەمۆ لەقاهیرە گەشەی سەند، لەکاتێکدا ئەسفەهان لە دروستکردنی ئاورێشم و قوماشی لە پەمۆ دروستکراوی وێنە لە سەر کۆپیکراو ناوی دەرکردبوو. بەجۆرێك هەر یەك لە تورکیا و ئێران لاکێش و ڕایەخی لە سوف و ئاورێشم دروستکراویان بەرهەمدەهێنا. بیناسازی خانووی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێویستی بەم شتە چنراوانە بۆ دابەشکردن و ڕازاندنەوەی ناوماڵەکان هەبوو، هەروەها چنراوە هەڵواسراوەکانی وەك ناوبڕە بۆ دابەشکردنی هۆڵ و حەوشەکان بەسەر چەند یەکەیەکی شیاوی ڕێك و پێك بەکاردەهێنا. هەروەها ئەم چنراوانە ڕۆڵی پەردەشیان وەردەگرت کاتێك لەبەردەم دەروازەکان و ئەو هەیوانانەی دنگەی کراوەیان هەبوو، دادەنران. بەمەش دیزاینی ڕستراو و چنراوەکان کاریگەرییان لەسەر زەخرەفەی بیناسازی خانووی ڕۆژهەڵاتی هەبوو. لە بیناسازیدا زەخرەفەی دووبارەبۆوە بەکاردەهات، کە لەدیزاینی ئەو چنراوە بەیەکدا چوانە دەچوو کە وەك چوارگۆشەو هێڵی ڕایەڵکراو لەکاتی دانانی قرمیددا دەردەکەوێت. دەشێ وێنەی هەڵواسراوی ڕەنگ ئاڵی ستوونی دیوانی سوڵتان و وێنە هەڵواسراوە ئاسۆییەکان کە بە نەمام و گوڵ و گوڵزاری تیکەڵاو و زەخرەفەی ئەندازەیی کە داتاشراون یا بەگەچ یا بەداری ئاخێنراو بەعاج ڕووپۆشکراون و نەخشێنراون، کاری چنراوی وا دانسقێن کە

نەکرێ لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر بگوازرێنەوە (وێنـەی ٥٥). کاریگـەری ئـەو رستن وچنینانە ئەوەندە زۆرن تا ئەو ئەندازەیەی دەکرێ لە چـەندین کاریدەسـتی و پێداویستی ناو ماڵدا ببینـرێن، بـۆ نمونـە قـاپ وقاچـاخ وکوپـەی فـەخفوری بـە زەخرەفە نەخشێنراوە، کە تێکەڵاوییەك لە نێوان هونەری هەڵکۆڵین، لـە قاڵبـدان و رەنگکردن بەرەنگی ئاڵاو واڵا دروستدەکات (وێنەی ٥٦).

هـەروەها پێکهاتـەی رسـتراو و چـنراوی ناومـاڵ —جـا راسـتەوخۆ وەك ئەوەی فەرش یا جل و بەرگ بێت، یا ناڕاستەوخۆ بەهۆی کاریگەری نـەخش و زەخرەفـەی بنمـیچ و دارو دیـواری خانووەکـە بێـت— پـەیامێکی گـرنگ دەربارەی ئەندازەی دەوڵەمەندی و پێگە لە چوارچێوەی خێـزان وکۆمەڵگـە، زەوق و سـەلیقەی کەسـی وکولتـووری دەنێرێـت. بـەجۆرێك هەریـەك لـە سەلاموڵك وحەرموڵك بەشێوەیەکی زۆرجـوان بـە زەخرەفـەو وفەرشـی جـوان رازێنراونەتەوە (وێنەی٥٧). ئینجا هۆڵی ناوەنـدی پێشـوازی، گـەورەترین و زۆرترینرازانەوەی بۆ دەکرێت تا ژوورەکانی تری ناوماڵ وهەندێ جار باشترین ژوورەکان لە دەوری سەلاموڵك بوون وهەمان گرنگیان هەبووە، بەڵام ئەمانە هەر هەمووی پشتی بە دەوڵەمەندی وپێگـەی خێزانـەوە دەبەسـت بـۆ نمونـە فەرمانبەری گـەورە لـە دەوڵـەت پێویسـتی بـە پانتاییـەکی گـەورەی ژووری پێشوازی هەبوو، کە جێگەی هەموو سەردانکارو میوانەکانی تێدابێتـەوە. رووبەری سەرەکی ژووریپێشوازی لەگەڵ ئەوەی درێـژترین و پـانترین ژوورە، هەروەها زۆربەی جار بەرزترین بنمیچیشی هەیە. دوو ریز ژووری بچووك لە دوودیـوی ژووری پێشـوازیدا هـەن و لـە نێـوان خۆیانـدا بـە ڕاڕەو بەیەکـەوە بەستراون. لە ئەستەنبوڵ و قاهیرە نـاوەوەی ژووری پێشـوازی لـە لایەکیـەوە یانیش لەدوولاوەی بەرز دەکرایەوە، کە وایدەکرد لە ئاستی لایەنەکانی تـری ژوورەکە بەرزتربێت، ئینجا ئەم شوێنە بەرزانەی ژوورەکە وەك رووبەرێك بـۆ دانیشتنی میوان وخێـزان بـەکاردەهات و ئەوکەسانەی لەلایـەن بنەماڵـەوە

بانگهێشت دەکران لەم شوێنەی ناوماڵدا میوانداریيان دەکرا. ئەم ژووره لەناوەوە بەشێوەیەکی گونجاو دارو دیوارەکانی هەر لە بنمیچەوە تا خوارەوە بە یەك جۆر زەخرەفە رازاندراوەتەوە.

لە ئەستەنبوڵ واباو بوو کە ژووری پێشوازی سەلاملوك وحەرملكی ماڵە دەوڵەمەندەکان بەدار وشووشە برازێنرێتەوە. لە تەوبەقابی سەرای جگە لەبەشی تایبەت بەسوڵتان وبنەماڵەکەی کە ژوور و هەیوانەکانیان لە گومبەزی رووپۆشکراو بە کەرەستە خانووی رەنگ ئاڵ پێکهاتووە، ئەوا زۆربەی بنمیچی خانووەکان لەدار و بە شێوەی جیاجیا کاری تێداکراوە، دروستدەکران. لەو چارسەرکردنە زۆر سەرەنج ڕاکێشانە ئەوەیەنا کە پێکبەستی دارتاشی تێدا بەکارهاتووە و هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تردا بەشێوەی تێکەڵەیەکی ئاڵۆزی شێوە ئەندازەیی وەك ئەستێرە و شێوەی پاقلاوەیی تێکەڵکراوە و هەر کۆمەڵێك لە دەوری یەکەیەکی ناوەندی کە زۆر جوان لەسەر شێوەی گوڵ داتاشراوە، قایمکراون. پاشان ئەم دارانە لە رەنگی قاوەیی تۆخی سوور باو رەنگدەکرێن، ئینجا ئەو بنمیچانە جۆرێك لە هەستی گەرمی وئارام بەخش دروستدەکەن. بەڵام لەگەڵ هاتنی سەدەی ١٩ ، رازاندنەوەی بنمیچی خانووەکان بەدار و گەچ رووی لەزیاد بوونکرد، بەجۆرێك کە چەند بەشێك لەو تێکەڵاویە دەستیە دارینەی کە دروستکراوەو بەرەنگی تری وەك سوور وسەوز رەنگ دەکرێن. پاشان لێواری نەخشەکان بەرەنگی زێرین (یا بەزێڕ) دەست نیشان دەکرێن، هەروەها چەند ووردەکارییەکی بچووکی وەك دەستە گوڵ یا چەند دەسکە گژوگیایەکی لوولدراوی بۆ دروست دەکرێت ئەویش بە بەکارهێنانی گەچ وچەو. لە دروستکردنی خانووەکاندا دیوارەکان بۆ دروستکردنی زەخرەفەی رەنگاورەنگ و، سەربانی دروستکراو لە کەرەستەی خانووی جۆرا وجۆر، کە دەتوانرێت چەندین مادده و تەکنیکی تێکەڵ بکرێت، هەلی زۆری

رەخساندوە. لەو بەشانەی کە بۆ سولّتان ودایکی لە حەرمولك ((تەوبـەقابی سـەرای)) تـەرخانکراون، دیـواری ژوورەکانی‌پێشـوازی —هـەر لـە سـەدەی ١٦تا١٧- و ئەو هەیوانانەی لەسەر سـەکۆی باخـەکانی حەوشـی چوارەمدا دروسـتکراون، ئـەوا بـە ئـەفریزی دیـوانی پاشـایی رازێنراوەتـەوە کـە لـە کارگـەکانی شـاری (ئزنیـق)ەوە هێنـراون (وێنـەی٥٨). دیـوانی پاشـایی بـە رەنگی کالّی جۆراوجۆری وەك شین و فەیروزی سەر زەویـە سـپیەکەی رەنـگ دەکـرا و، لـەژێر چینێك شووشـەی تـەنك و بریسـکەداردا دەپـارێزرا. لـەم دیزاینـی بیناسـازییانەدا گـولّزاری لـوتس و فاوانیـاو، جارجـارەش گـەلاّی لولدراو بەکاردەهاتن، بەمەش لە پەردە دەچوون. ئینجـا ئـەم ئەفریزانـە بـە درێژایی دارودیوار و دەرگا دارینە رەنگ تاریك ودروستکراو لەعاج و چاوە ماسـی (صـدف) کـە دیزاینێکـی زۆر بـە وورده لـەو دروسـتکراوە زەخرەفـە ئەندازەییـەدا تێبینـی دەکرێـت، بەمـەش نمونەیـەکی تـر دەخاتـەڕوو کـە گوزارشت لـە رووبـەرە بـەکارهاتووەکانی فەرشـکردنی ناومـالّ دەکـات. لـە سـەدەی١٨وایلێهـات دیوارەکـانی ژووری پێشـوازی و بەشـە تایبەتـەکانی (تەوبـەقابی سـەرای) بـە دارودرەخـت و گـەچ ڕوو پۆشـدەکران، بـەجۆرێکی دلّڕفێن لەسەر شێوەی چەند ئەفاریزێکی کۆمەلّکانەی ریزکراو لە دوای یەك، بە جۆرێك گولّی وای تێدا وێنەکێشـراوە رێـك لـە گـولّی سروشـتی دەچێت. بەلاّم بەشەکانی تەوبە قابی سەرای بریتیە لە پێوەرێك بۆ جـوانی بـێ وێنـە، نەریت وا بـووە کـە دیـواری مـالّی هاولاّتیـە دەولّەمەنـدەکان بـە دار وگـەچ برازێنرێتەوە. دەشێ دەوری ژوورەکانی پێشوازی بە ئەفاریزی دارینی تاشراو کە بەنەخش ونیگاری ئەندازەیی لەگـەلّ دەزگـای عـەمبارەکانی نێـو دیـوار وتاقەکان رازێنرابێتەوە. دیوارەکـان بـە وێنـەی زۆر جـوان و رەنگـاورەنگ و نەمامی رەنگ ئالّ دەرازێنرانەوە (وێنەی٥٩). لە کۆتاییەکانی سـەدەی١٨و دواتـریش — زۆرجـار- ئـەم دیزاینانـە بـە ئـەفاریزی سروشـتی گـۆڕان کـە

ڕەنگدانـــەوەی کاریگـــەری هونـــەری ئـــەوروپی پێـــوە دیـــارە. ئینجـــا ئەمچاکســـازییانە بـۆ ڕوویـەرە بەتاڵـەکانی دیـواری ماڵـەکان لەیـەك کاتـدا نیشـێکی ڕێکـو پێـك و جوانکـاریش بـوو. لەبـەر ئـەوەی دیـوی ژوورەوەی ماڵـەکان سـەربەخۆ کـەل وپـەلی ناومـاڵی تێـدا نـەبوو. واتـە شـوێنێکی تایبەتکراو بۆ شتەکان بوونی نەبوو، بۆیە عـەمبارو تاقـەکانی نێـو دیـواری ژورەکان بۆ هەڵگرتن و خستنەرووی کارەدەستیەکان و قاپ وقاچـاخ و شـتە دەستییەکانی ڕازاندنەوەی ناومالّ بەکاردەهاتن، کـە هـەموو ژوورەکـان لـەم خەسـڵەتەدا هاوبەشبوون. بـەڵام ژووری پێشـوازی دیوەخانێـك بـوو شـوێنی فەرشکراو بۆ دانیشتن بە درێژایی ئەو بەشـەی کـە بـەرزترە لەبەشـەکانی تـر ئامادەکراوە. لێرەدا ئەو تەنها شتەی کـە جێگـۆڕکێی پێنـەدەکرا، عـەمبار وتاقی تایبـەت بەفەرشەکان بوو.

لەبەر ئـەوەی پێویسـتی دەکـرد کـە ناومـالّ پـەردە پۆشـبکرێت و لەچـاوی دەرەوە دوور بێـت، ئـەوا پەنجـەرەکانی نهـۆمی خـوارەوە بـە هـەیوانی داریـن و بەرپەنجەرەی چڕ دەگیران (وێنەی٦٠). ئەم بەر پەنجەرە دارییانـە کـۆنترۆڵی هـەوا گۆڕکێ و ڕووناکیان دەکرد. بەڵام پەنجەرەکانی نهۆمی سەرەوە لـە ڕێگـەی ئـەو پەنجەرانـەی کـە لـە بەشـی سـەرەوەی ژوورەکـان و لـە نێـو تـاقی شـێوە نیمچـە بازنەییدا بوون، ڕێگا بەچوونە ژوورەوەی ڕووناکیدەدرا، بەمەش کە ڕوویـەرێکی ڕەنگدارو زەخرەفەیی پێکدەهێنێت. ئەم تاقانە بـە زەخرەفـەی گەچـی ونەخشـی زۆر ووردی نەمام وگوڵزار کە شوشەی ڕەنگاو ڕەنگی وەك شینی تۆخ، فـەیروزی و زەردی کاهرەمانی تێدا بەکارهاتووە، ڕازێنراونەتەوە، ئـەم نـەخش و دیزاینانـە بەوەیان دەچێت کـە لـە دیـوانی پاشـاییدا بـەکارهاتووە. هـەر لـە کۆتاییـەکانی سەدەی ١٨و سەرەتاکانی سەدەی ١٩ ، ئەم شێوازی زەخرەفـە چڕەی پەنجـەرەی ماڵەکان لە (یالی) کە لەسەر کەناری دەریای بەسفۆر دروسـتدەکرا بـە شوشـەی سادە، بێ زەخرەفە، داپۆشراو بە پەردە، گۆڕا.

بــەڵام زەمینــەی ناوماڵــەکان بــەپێ ی شــوێن وجــۆری شــوێنی نیشتەجێبوونەکە دەگۆڕا. تەوەتا ئەستەنبوڵ شوێنێکە بەدرێژایی مانگەکانی پایز وزستان شێدارە، بۆیە پێویستی دەکرد زەویەکان فەرش و رایەخبکرێن — دەشێ زەویەکان لە دار ولە بەرد دروستکرابن— ئەمە لە کاتێکدایە کە بیناسازی (یالی) هاوینە کە یارمەتی هەواگۆڕکێی زیاتر دەدا، ئەم شێوازەی بیناسازی هەولێدەدا کە شێوەی باخجەیەکی نێو خۆیی فەراهەم بکات. لەژوورە پانو پۆڕەکانی پێشوازی نهۆمی خوارەوە زەویەکەی ریزبەندی پارچەیروخامی سپی تێرکراوی تێدا بەکاردەهات، کە جاری واهەبوو تێکەڵەیەك لە بەردی سپی ورەش لەسەر شێوەی دیزاینی نەمام ئاسای تێدا بەکاردەهات، ئەوا لە ناوەڕاستەکەیدا نافورەیەکی روخامی هەبوو. خاتو ماری مۆنتگیۆ دڵڕفێنیی ئەم جۆرە ژوورانە وێنەدەکات و دەڵێت:

بەڵام ئەوەی زیاتر دڵخۆشیم پێ دەبەخشێت، چۆنیەتی دانانی ئەو نافورە روخامیەیە لەبەشی خوارەوەی ژوورەکە کە لەرێگەی چەند لولەیەکەوە پاڵ بە ئاوەکەوە دەنێت، بە ئەندازەیەك هەوای فێنێك دەبەخشێت ودەروون خۆشحاڵ دەکات، ئینجا بەهۆی نەرمی وئارامبەخشی دەنگی ئاوەکە کاتێك لە حەوزێکەوە بۆ ئەویتر پاڵی پێوە دەنرێت، ئەوا ئەم نافورانە زۆر دڵڕفێنن.

ماڵە دەوڵەمەندەکانی قاهیرە بە رێژەیەکی هاوشێوەی وەسفەکەی پێشوو بەزەخرەفە رازاونەتەوە، بەڵام بەو جۆرەیە کە لەگەڵ ئاووهەواو سەلیقەی خەڵکە خۆجێیەکەدا بگونجێت. ژوورەکانی پێشوازیکردن وژووری دانیشتن وهەندێ ژووری لاوەکی کە بنمیچەکانیان نزمتر ولەدار دروستکراوو بەستون (دینگە) وەستاون، ئەوا بەپانتایی ژوورەکەدا دار رایەڵکراون و زۆربەی جاریش داپۆشراوو رەنگ زێرینن. بنمیچەکان بەزەخرەفەی ئەندازەیی جۆراوجۆر وبە ووردەکاری ووردیان جیادەکرانەوە، کە شێوەی

زەخرەفەکانی ئەستێرەیی وشێوە مەعین ودەمانچەیی تێدابوو و بەرەنگی سەوز، سورو شین رەنگ کراون وهەندێ جار بنمیچەکان بریتین لە گۆمبەزی بەرز و رووناك لە رێگەی پارچەی شوشەیی رەنگاو رەنگەوە رووناکی دەچێتە ناومالەکانەوە، ئینجا رووپۆشی دیوارەکان بەپێی وەرزو داهاتی خێزانەکان جیاوازن. زۆربەی جار ئەم دیوارانە لە گەچی سپی و سوور و بەدیزاینی شێوە نەمامی پێکەوە بەستراوو دوبارە بووەوە، روو پۆشدەکران. هەندێ جار دیوارەکان بە وێنەو رووداوی ئاینی دەرازێنرانەوە وهەندێ رستەی جوانی عەرەبی لە نێویاندا دەنووسران، ئەمە لەکاتێکدا دیواری ژووری میوانی مالە دەولەندەکان کە لە وەزریهاویندا بەکاردەهاتن، بە پارچەی روخامی روو پۆشکروە هەروەك چۆن لە ناومالە تەقلیدیە تورکە عوسمانیەکان دەبینرێن، بەجۆرێك کە قەدی دیوارەکان بەسەر چەند دەرگایەکی عەمبارە دیوارینەییەکان وئەو تاقانەی بەکاردەهاتن بۆ پاراستن وخستنەرووی قاپ وقاچاغ وشتی ناوازە کە زۆر بەهرەمەندانە داتاشراون، دابەشکراوە.

هەروەها پەنای لای پەنجەرە وبالکۆنە داخراوەکان –کە لە ئاستی دیوار قوولتر وبەرزترن و بە ئەفاریزی دارین وتاشراو و بەر پەنجەرەی دارینی زەخرەفەداری تێکەڵ و جوان، دەورە دراوە– ژووری بچووکوقنجیان پێکدەهێنا. هەروەها لەسەر پەنجەرەکان و بەدرێژایی دیوارەکە رەفەی دارینی باریك رایەڵ کراوەو بۆ نمایشکردنی قاپ وقاچاغی فەخوری و شووشەیی بەکاردەهاتن. بەلام لەسەر دانیشە بەردی یا دارینەکان، ئەوا لە ژوورەکانی نهۆمی خوارەوە بە درێژایی دیواری ئەو ژوورانە درێژ دەبوونەوە و شوێنی دانیشتنی دەرەخساند. ئینجا پەنجەرەی ژوورەکانی نهۆمی سەرەوەی مالەکە لە شووشەی رەنگاورەنگی کاڵ دروستکرابوون و لە نێو چوارچێوەیەکی گەچی قایم دەکران وشێوەی یەکەیەکی زەخرەفەیی شکڵ ئەندازەیی یا چەپکە گولزاریی پێکدەهێنا. بەلام زەخرەفە زۆر

سەرسامکارەکان، ئەوا بۆ نهۆمی هۆڵەکانی پێشوازی تایبەتدەکران. زەمینەی ئەم نهۆمانە بە تێکەڵێك لە روخامی سپی ورەش رووپۆش دەکران و دارودیوارەکەیشی بە سووری شێوە ئاوێزەیی، چوارگوشەی یەکتر بڕو ئەستێرەیی تێکەڵاو دەبریسکایەوە. پاشان پرۆسێسەکە بە کاریگەری تێکەڵکردنی هونەری زەخرەفەسازی و ئامرازەکانی فێنککردنەوە پاڵپشتی دەکرا، ئەویش لە رێگەی دروستکردنی ئافورەی روخامی بچووك لە ناوەڕاستی هۆڵەکان کە ئاویان بۆ ناو حەوزێکی قووڵتر کە بە تێکەڵەیەکی ناسك لەسەر شێوەی گوێچکە ماسی ناو پۆشکراوە، جۆگەلەی دەکرد.

لە نێران فەزای ناوەوەی ماڵەکان بەوە جیادەکرایەوە کە هاوسەنگییەکی دروستدەکرد لە نێوان کاریگەری ئەو زەخرەفانەی زەق دێنەپیش چاو، لەو رووەوە کە تەکنیك ورەنگی جۆراوجۆری تێدا بەکاردێن، هەروەها ئەو رووبەرە کراوە و پانتاییەی کە لە باڵەخانەکاندا هەن. بۆ نمونە هۆڵی پێشوازی هەر لە بنمیچی ژوورەکە تا زەمینەکەی تەواو بە زەخرەفە رووپۆشکراوە و بەسەر هەیوانێکی ستونداردا دەڕوانێت، تەنانەت پێکهاتەی زەخرەفی وای تێدا بەکارهاتووە کە لەقرمیدی تاك رەنگ یا گەچی سپی دروستکراون (وێنەی ٦١). هەندێ لە گەشیارە رۆژئاواییەکان بە هۆی چاودێری وورديانەوە توانیویانە لەم هاوسەنگیە تێبگەن، بە جۆرێك (ئیلا سایکس)[٢] کاتێك لە کۆتایی سەدەی ١٩ بەرەو کرمان بەرێکەوتووە لە تۆمارکردنەکانیدا نووسیویەتی کە: لەو بەکارهێنانە بەهرەمەندانەیەی گەچ کە ماڵەکان وا دێنە بەرچاو سادەن و بەو رووە گەچسازییەی کە هەیانەو ئەو هەیوانانەی لەسەر ستونەکان هەڵگیراون سەرنج رادەکێشن، گەرێدە سەرسام دەبێت. بەڵام هەرچی دیوی ناوەوەیە، ئەوا زۆربەی جار ژووری سەرەکی پەنجەرەیەکی زۆر گەورەی هەیە ولە شووشەی رەنگاورەنگی قایکراو لە ناو چوارچێوەیەکی بچووکی دروستکراو لە قورقۆشم، پێکهاتووە، بەمەش

رونـاكی دێتــه ژوورەوه و رەنگـی كـاڵ بـەناو ژوورەكـەدا پەخشـاندەكاتەوەو كاریگەری رووناكیەكە زۆرجوان دەبێت.

هەروەها خاتوو سایكس تێبنیكردوه كه رازاندنەوه و رایەخی گران بەها تەنها لە (ئەندرۆن) رادەخران، كه بەشی تایبەتی ژنان وخێزان بـوو ((لێـرەدا حەوزی نزم كە گوڵ وگوڵزار بـەدەوری كانیاوەكەیـدا چـێنرابوون، دەبینـرێـت، كە رەنگە دیوی نـاوەوەی بـە رەنگێكـی شـینی كـاڵ رەنگكرابێـت و ئەگـەر رووبەرێكی باش فەراهەم بوو، ئـەوا درەختێـك لـە گۆشـەیەكی حەوشـەكەدا سێبەری خۆی بڵاو دەكاتەوە)).

لەگەڵ هـاتنی سـەدەی ١٩ رازاندنـەوەی نـاو مـاڵی ئێرانـی لـە مـادەی بیناسازی وەك داروديواری یەك رەنگ، زەخرەفەی گەچی هەڵكـەنراو یـا لـە قالبدراو، شوشەی رەنگاورەنگ و ئاوێنەی جۆراوجۆر، وێنـەی نەخشـێنراوی سـەر درەخـت یـا قوماشـی قـەنب[٣] پێكـدەهات. ئـەم مادانـە شـیوازێكی بیناسازییان دروستكرد كە لە ئەنجامی تێكەڵكردنی سستمی خۆشی بـەخش لە رووی زەخرەفەی سەر شتە چنراوەكان و بنەماكانی پێكهاتە وێنەییەكان. هەر تەكنیكێك بە جۆرێك هەڵدەبژێردرا كە لەگەڵ بنمیچی ژوورەكـە و ئـەو جۆرەی كە وێنەی ژوورەكە بە جوانترین شـێوە دەخاتـە ڕوو، بگونجێـت. ئـەم بنەمایانـە لـە بـاكووری تـاران و لـە كۆشـكی گوڵسـتان جێبـەجێكراون كـە شـوێنی حەوانــەوەی بنەماڵــەی دەســەڵاتداربوو، هــەروەها لــە شــوێنی نیشتەجێبوونی گەورە دەوڵەمەندەكانیشدا جێبەجێ دەكرا، جـا ئـەم شـوێنی نیشتەجێبوونانە چ لە تاران یا ئەسفەهان یا لە شارە هەرێمییەكانا بوونایـە، وەك شیراز وكرمان. ئەو شێوازی رازاندنەوەیە زۆربـاو بـوو كـە بریتیبـوو لـە تاشە بەردی تـاك رەنـگ كـە مێژوویـەكی دوورو درێـژی هەیـە، ئەمـە وەك خەسڵەتێكی سـەرەكی بیناسـازی لـە ئێـران دادەنرێت. بـەڵام لـە سـەرەتای سـەدەی١٧بـەدواوە هونـەری بـەكارهێنانی بـەرد شۆڕشـێكی لـە دیـزاین و

ڕەنگکردن بەرپاکرد، جا چ لە باڵەخانە ئاینییەکان یا ماڵ و خانووبەرەکان بێت —ئینجا لەگەڵ هاتنی سەدەی ١٩ ئەم تاشە بەردانە هەموو بانێکی گرتەوە، بەمەش دار و دیواری دەرەوەو ناوەوەی باڵەخانەکان بە ئەفریز و هەڵواسراوەو چوارچێوە رووپۆش کران، تەنانەت ناوەندە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی تاشە بەردی بیناسازی —بە تایبەتی لە تاران، ئەسفەهان وشیراز— بە دروستکردنی ئەو تاشە بەردانە و بە پێی داواکردنی لە بازاڕەکان و بەکارهێنانیان لە رازاندنەوەی ناو ماڵەکانیان کە جۆرێك لە بەردی بیناسازی باوبوو، سەرقاڵبوون، ئەویش لەسەر شێوەی قوچەك لەسەر دەروازە یا وەك چوارچێوەی پەنجەرە بچووکەکان بەکاردەهاتن، یا ناوپۆشی ئەو تاقانەی پێ دەکرا، کە لە نیوەی سەرەوەی دیواری ژوورەکان دروستدەکران. لە کۆتایی سەدەی ١٩ کاریگەری رۆژئاوایی لەسەر رێکخستن و رازاندنەوەی ناوماڵ، وایکرد لە ئاگردانی جوانکاری کە بەرۆڵی خۆی پانتایی فراوان ونوێی بۆ بەکارهێنانی ئەو تاشە بەردانە تەرخانکردبوو، نوێکردنەوە بکرێت. کە دەشێ ئەفریزی ئاسۆیی لەسەر رەفەی ئاگردانەکان دابنرێن، هەروەها دەکرێت چوارچێوەیەك لەم تاشە بەردانە کە لە سێ لا پێکهاتووەو بۆ رازاندنەوەی دەرگا یا پەنجەرەو یانیش رازاندنەوەی ئاگردانەکان بەکاربێت. زۆربەی ئەم جۆرە بەردانە بەتایبەتی لە هەشتاکانی سەدەی ١٩ و دواتریش هونەری وێنە کێشان لەژێر چینێکی بەردی شووشەیی بەکاردەهات. ئەم هونەرە فرەڕەنگییە بۆ بەکارهێنانی بابەتی هەرە زیندوو فرەڕەنگ کە سەرباری بابەتە تەقلیدییەکان نەخش ونیگاری نەمامی رەنگاوڕەنگ وسەکۆی ناوەندی بەکاردەهات، هاندەربوو، ئەوا چەند رووداوێکی ئەدەبی تەقلیدیش وەك چیرۆکی یوسف (سڵاوی خوای لێبێت) و زولێخا دەخرانە روو، کە زۆر باوە و وێنە سروشتیەکان و وێنەی ئافرەت ومنداڵی رۆژئاوایی کە جل وبەرگی مۆدی نوێیان لەبەردایە خراونەتەڕوو.

ڕەنگە زۆرترینی ئەو وێنانەی کە سەرنج ڕاکێشن و بایەخیان پێدەدرێت، ئەو وێنەیە بێت کە بۆ نادرەدین شا و بەهەڵسوکەوتی جیاجیا وەرگیراوە — ڕۆخەکانی دیاریکراون و بە ڕەنگی ڕەش خەت وخاڵ خاڵ کراوە— هەروەها شێوەیەکی تری دانیشتنی شا کاتێك بۆ گوێگرتن لە مۆسیقای ئامێری پیانۆ یا لەکاتی نمایشی سوپا دانیشتوە، وێنەی کێشراوە. هەروەها تاشە بەردی بیناسازی بۆ شۆستەکردنی زەویەکان بەیەکەی زەخرەفی لەسەر شێوەی گوڵ وگوڵزار یا لەسەر شێوەی بازنەی تێکەڵکراو ونارێك کە لە ئاورێشم دەچوو، بەکارهاتووە.

هەروەها هونەرەکانی تری ڕازاندنەوە لە هونەری بەکارهێنانی بەرد لە ڕووی داهێنانی شێوازی نوێ سەرتر بوون، هەروەك چۆن لە ئەستەنبوڵ و قاهیرە شووشە بەکارهاتووە، کە پارچە تێکەڵاوەکانی بە ڕەنگی سوورو سەوزو زەرد چوارچێوەی دارینی تاقە نیو بازنەییەکانی سەر دەروازەکانی دەبریسکاندەوە، یا بۆ دروستکردنی چەتری پەنجەرەکان —لەسەر شێوەی سکە بۆ سەرەوە دەکرانەوە— بەکاردەهات. هەروەها بۆ بەکارهێنانی شووشە ئەوا هونەری ناوازە داهێنرا، ئەویش لە ڕێی دروستکردنی کۆمەڵە ئاوێنەیەك و کۆکردنەوەیان لەسەر شێوەی شانەی هەنگ، کە لە بنمیچەکاندا دەبریسکایەوە، جا چلە ژوورەکان یا هەیوانەکان بێت، ئەوا ڕووناکیەکی زیوی زۆر بەشەوق و دەوروبەرێکی دڵڕفێنی دروستدەکرد.

بەڵام ئەو ئەفریزانەی کە نەخشی نەمامیان تێدایە و بە زەمینەیەکی گەچی سپی و هەندێ پارچەی بچووکی شووشەیی ڕەنگاوڕەنگ دەڕازێننەوە، ئەوا زۆرترینی ئەو ڕێگایانەیە کە شووشەی تێدا بەکاردێت. لە کۆنەوە لە ئێران بەکارهێنانی زەخرەفەی دروستکراو لەگەچی ڕەنگا وڕەنگ وهەڵکەنراو یا کۆنکریت کراو لەناو قالب، وەك جۆرێك لە ڕازاندنەوەی بیناسازی بەکارهاتووە. ئەم تەکنیکە لە سەدەی ١٧ و بۆ ئەو ڕیزە سەکۆیانەی لە ژوورەکانی پێشوازی

دروستدەکران و چرایان لـە سـەردادەنرا، بـەکارهاتووە. لەگـەڵ دەسـتپێکردنی سەدەی ١٩ بۆ رازاندنەوەی بنمیچ ودیوارو ماڵەکان ئەم تەکنیکە گەشەی سـەند بـە ئەندازەیـەکی زۆر وورد بـەکارهات، ئـەویش بـە بـەکارهێنانی هونـەری هەڵکەندن بۆ دیزاینکردنی چەپکە گوڵ ومەرکانی پڕگوڵ وگوڵزار ومیوە، ئینجا بـەدەوری ئەمانـەوە کۆمـەڵێك نـەمام دروسـتکراون ولـە نێوانەکانیانـدا وێنـەی باڵنـدە کێشـراون. هـەروەها زەخرەفـەی زۆر جـوان و دڵـڕفێن لەناوماڵـدا دروستدەکرا، ئەویش وێنەی جوان و راستەوخۆ لە سەر دیوارە گەچیەکان یا ئـەو دیوارانەی بە بۆیەی زەیتی بۆیە کراون و وێنەکان وەك گـوڵزار وباڵنـدە و وێنـەی چەند کەسێك بەسەر دیوارەکانەوە بابەتی نەریتی بـوون، بـۆ نمونـە گـەنجی جـوان وکچـی جـوان جـل وبـەرگی زۆرجوانیـان لـە بەردایـە. ئـەم وێنانـە لـەو قوژبنـە بچـووکانەی کـە لـە گۆشـەی ژوورەکـان هـەن، دەبینـرێن. پاشـان ئـەم شـێوازی رازاندنەوەیـە گـۆڕاو لـە وێنەکێشـان لەسـەر دیـواری ژوورەکـان گوازرایـەوە بـۆ وێنەکێشان لە قەد بنمیچی ژوورەکان. یەکێ لەم نمونانـە سـەرنجی سـێر فردریـك جۆڵـد سمیـت SirFrederic goldsmith [1] کـە بەڕێوەبـەری فـاکس بـوو، راکێشا. سێر فردریك ئەم شـتانەی لای خـوارەوەی لـە دەفتـەری یادگاریەکانیـدا تۆمارکردوە کـە تێیـدا ژووری میـوانی یـەکێك لـە ماڵـەکانی ناوچـەی دەریـای قەزوینی شاری ئینزلی لە ساڵی ١٨٧٠ وەسف کردووە:

خـاوەن ماڵەکـە ژووری میـوانی دایـە دەسـمەوە کـە بـە شـارەزووی خـۆم رەفتاری تێدا بکەم. ژوورێك بـوو رووبەرەکـەی ١٤ بـە ١٦ پـێ دەبێـت و بـە وێنەی گوڵو گوزار و ئافرەت رازێنراوەتەوە. لەسەر بنمیچی ژوورەکە وێنـەی ژنێکی زۆرجوان کراوە وجل وبەرگێکی جوانی لە بەردایە و رووومـەتەکانی بە رەنگی سوور تا لێواری چاوەکانی رەنگ کراوەو وێنـەی خزمـەتکارەکان بـە دەوریا، ئەمە جگە لەو شێوە مروڤانـەی کـە باڵیـان بـۆ دروسـتکراوە و لـە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوە (وێنەی ٦٢).

ئینجا ئەو زەخرەفانەی کە هەموو رووبەرەکانی ناوەوەی ژوور دەرازێننەوە، بەشتی رستراو و چنراو لە رووی چەندایەتی و جۆرایەتییەوە دەوڵەمەند دەکران، ئەمەش داهاتی خێزان و پێگە کۆمەلآیەتییەکەی دابینیان دەکات، هەروەها بەکارهێنانی پەردەو شتی هەڵواسراو سەرچەف ولاکێش، وا لەژوورەکە دەکات کە لەگەڵ وەرز وکەش و هەوا و رێورەسمە تایبەتیەکاندا بگونجێت، ئەمە جۆرێکە لە نەرم ونیانی لە کاری رێکخستنی ژوورەکان، تا بتوانرێت ژوورەکان تایبەت نەکرێن. ئینجا پارچە بچووکەکانی کەل وپەلی ناوماڵ کە بۆ گواستنەوە بشێن -وەك سندوقی زێر و زیوو شت و مەکی تایبەتی و ئەو کورسی و مێزانەی دەنووشتێنرێنەوە ونەوانەی بۆ نووسین بەکاردێن و قاپ و قاچاخی فەخفوری وفافۆن ومس وزێر، کە بۆ ئامادەکردنی خواردن بەکاردەهاتن، هەروەها کەل وپەلە ناوازەکانی وەك مەرکانە و وێنەکانی خۆشنووسی قەد دیوار و دەست نووسی ناوازە تەواو دەکەن. خاتوو ماری مۆنتگیۆ لە تورکیا و لە ساڵی ١٧١٧ وەسفی ژوورێکی رازێنراوە بەکەل وپەل دەکات لە حەرمولك کە خاوەن ماڵەکە میوانداری ئەوی تێدا کردوە و کە چۆن مرۆڤ تێیدا ئاسوودە دەبێت:

ژوورەکان هەر هەمووی بە لاکێشی فارسی رایەخکراون و لەلایەکیەوە لە بەرزایین یا رایەخکراون (ژووری نووستنم لە دوولاوەی ژوورەکە بەرز کراوەتەوە) بە بەرزایی دوو پێ، قەنەفە لە ژوورەکاندا دەنراون. ئینجا بە لاکێشێکی ئەستوور داپۆشراوە و لە رۆخەکانیاندا حاشیە هەیە کە نیو پێ بەرزدەبێتەوە و بە ئاورێشم داپۆشراوە. ئەمانەش بەپێی زەوق یا توانای مادی خاوەنەکەی دەگۆرێت. حاشیەی پێخەفەکەی من لە ئاورێشمی قرمزی و ریشاڵی زێرین دروستکرابوون و لەسەر دیوارەکان و دەوری حاشیەکە دوو قەد لە تەناف ئاسا (رستە) خرا بوونە سەریەك، قەدی یەکەمیان زۆر گەورە و دوومیان بچووك بوو:

ئالێرەدا تورکەکان گەورەیی خۆیان دەنوێنن.

که عادەت وایە لە چنراوی تەترپز کراو بـە تاڵـە دەزووی زێـرین لەسـەر عەردێك چنراون کە لە قوماشێکی ئەتلەسی سپی دروستکراوە، هـیچ شـتێ لەمانە دڵخۆشکار و خۆشی بەخشتر نابێت. ئەم جێگـە نـەرم و جوانانـە وام لێدەکەن تا مردن نەتوانم لەسەر کورسی دابنیشم. چـنراوەکان (وێنـەی ٦٣) کە لەو سـەردەمەدا گەیشـتە دەسـتمان، بەڵگەیـەکی زینـدووە لەسـەر ئـەو وەسـفانەی کـە کردبـوونی. ئەسـتەنبوڵ، بۆرسـە، دیمەشـق وحـەلب، تۆپـە قوماشی مەخمەلی و ئاورێشمی لە ناوەنـدەکانی دەچـنران وگـەرم و گـوڕی و رازاندنەوە وجوانیان بە ماڵـە عوسمانیـە دەولەمەنـدەکان دەبەخشـی. رەنگـە تەقلیدییەکان کە تێیـدا بـەکاردەهاتن بریتیبـوون لـە ئەرخـەوانی و سـەوزی تۆخ، ئینجا زیاتر بە تاڵە دەزووی زێـڕین و زیـوین لەسـەر شـێوەی نەخشـی شەبەقە گوڵ، قەنەفڵ، زەنبەق ودار سنۆبەر نەخشاو و چنراون.

ئەم چنراوە جوانانە وەکو پەردە یا وێنەی دیواری رازاندنـەوە بـەکاردەهاتن، لەسـەر دیـوار و دەرگـای ماڵـە کـان یـا وەك نـاوبڕە بـۆ جیاکردنـەوەی ژوورە گەورەکانی میوان بەکاردەهاتن، یـانیش وەك قەنـەفڵ کـە بەشـێوەی جۆراوجـۆر دادەنرانو وەك شوێنی دانیشتن و پاڵکەوتن سوودیان لێ وەردەگیرا.

ئینجا لاکێشی جۆراجۆر رادەخران کە لە سوف یا ئاورێشم دەچـنران و لـە هۆڵی پێشوازی و ژوورەکانی دەوری رادەخران. ئەم رایەخانە لە بەرهەمـەکانی کارە دەستییەکانی تورکیا بوون، وەك بنکەی ئوشـك (وێنـەی ٦٤) و جـوردی یانیش لە هاوردە بە نرخەکانی ئێران بوون.

ئینجا بە دیزاینی جۆراو جۆری گژوگیاو نەمام کە گۆشەکانی تیژ یا چوارگۆشە وەکو شێوەی باخچە تەقلیدییەکان دەردەکەوێت، یا نـەمامی هەڵواسـراوە و لقـە لولـدراوەکان کـە لـە دەوری خاڵێکـدا لولیـان خواردوەتەوە، دەنەخشێنران.

ئەم ژوورانە زۆر سەرنج راکێشـبوون وبـەلاکێش و چـنراوی جـۆراو جـۆر رایەخکراون، کە بە ئاسانی دەتوانرا بکرێت بـە ژووری نووسـتن، بـە جۆرێـك

قەرەوێڵە لە چەندین حاشیە و دەسماڵی ئەستور و سەرین و چەرچەف پێکدەهات. ئەمانە هەموویان لەنێو تاقەکانی ژوورەکە کە دەرگای دارینیان هەبوو، هەڵدەگیران.

ئینجا بەپێی پێویست ئەم رایەخانە لە تاقەکانیان دەردەکران و بەکاردەهێنران و لەسەر لاکێشی سەر زەوی، قەرەوێڵەی نزم، یان جێگەی خەوتنی لێ دروستدەکرا. زۆربەی جار سەرینەکان بە سەریانەوە بلاو دەکرانەوە، هەروەها سەرچەف، سەر شان، دەسماڵ، خاولی وجلوبەرگیش لە ناو ئەم باوڵە دیوارییانە دەپارێزران. سەرچەفەکان زۆرترین کەل وپەل بوون کە بۆ کاری جۆرا وجۆر بەکاردەهاتن. سەرچەفی دلڕفێنی ئاورێشمی و مەخمەلی چنراو (وێنەی ٦٥) لەسەر شوێنی تایبەت بە دانیشتنی خێزانی رایەخدەکران، ئینجا لەو خێزانانەدا کە پێگە ومیوانەکانیان لە ئاستە بەرزەکاندا بوون، ئەم رایەخانەیان رادەخست. هەروەها سەرچەف لەسەر قەرەوێڵە و ژێر بەتانی یا بۆ پێچانەوە و هەڵگرتنی جل وبەرگ بەکاردەهات. بەلاّم نەرمترین کەلوپەلەکان کە دەکرا لە دەستەی بچووك و رێکخراو لوولبدرێن، ئەوا بە سەرچەفی چەند ناوپۆش لولدەدران و لەسەریەك دادەنران و لە تاقەکانی ژوورەکە ریزدەکران تا بە بەرچاوەوەبن، بەلاّم کەل و پەلە گوازراوەکان تەنها بۆ زیاتر جوانکردن و رازاندنەوە بەکاردەهاتن و لە تاقەکاندا بەدوای یەکدا ریزدەکران.

لەسەر رەفەکانیش مەرکانەی گوڵ و شوشەی لولەدرێژ کە لە هەر یەکیاندا گوڵێك یا قەنەفلێك و یا زەنبەقێك دادەنران. هەڵگری کتێبی دارین (واتە کتێبخانە) کە بۆ بۆیەکردن دەشیان و زۆربەی جار بە زەخرەفە نەخشێنرابوون وبە عاج وسەدەف تێرکرابوون، بۆ هەڵگرتنی کتێب ودەستنووسەکان بەکار دەهاتن. هەروەها هەڵگری دارینی نزمیش هەبوون بۆ هەڵگرتنی سینی کانزایی و جاری واهەبوو وەکو خوانی ناخواردنیش

بەکاردەهات. لە هەندێ لە ماڵەکان سندوقی دارینی نەخشێنراو بە زەخرەفەی هەڵکەنراو بۆ پاراستنی چنراو و قوماشەکانی خێزانەکە، بەکاردەهاتن. سەرچاوەی سەرەکی بۆ گەرمکردنەوەی ناوماڵ بریتیبوو لە مەقاڵەیەکی دروستکراو لە مادەی سفر[١٥] یا مسی زەخرەفەدار کە بان پۆشی هەیە، ئینجا مەقاڵەکە لە هەموو لایەکی ژوورەکە وەك گەرمکەرەوەیەکی گواستراوە، جێگۆڕکێی پێدەکرا و بەشێوەیەکی بەردەوام خەڵوزی تێدەکرا، کاتێکیش پلەی گەرمی ژوورەکە زۆر نزم دەبووەوە، ئەوا مێزێك بەکاردەهات کە لەسەر قاپێکی پڕ لە پشکۆ قڵپ دەکرایەوە و بە دەسماڵێکی گەورە دادەپۆشرا و دەتوانرا لەلایەکانیەوە رابکێشرێت و بەسەر تاکەکانی خێزان و میوانەکانیاندا، بگێڕدرێت، بۆ ئەوەی گەرمیان بێتەوە. هەروەها جگە لە تیشکی خۆری سروشتی، کە لە رێگەی شووشە رەنگاوڕەنگ و بەر پەنجەرە دارینەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، یا لە حەوشو بەلکۆنەکانەوە دەهاتنە ژوورەوە، ئەوا ئەو رووناکیەی کە لەمۆم و چرا زەیتییەکانەوە دەهاتن، لە باشترین حاڵەتەکانیاندا تەنها دوو بەرابەرییەکی سەرنج راکێشی لە نێوان رۆشناییەکە و سێبەرەکەی دروستدەکرد. کەلوپەلە تایبەتییەکان رەهەندێکی جیاکەرەوەی بە ژوورە تایبەتییەکان دەبەخشی. مەرکان یا تیاهەڵگری شیرینی کە لە فەخار (ئیزنیق)ی لۆکاڵی ورەنگی بریسکەدار دروستدەکران، شان بەشانی فەخاری سپی و شینی هاوردە لە چین، بەکار دەهاتن. بەڵام رشێنەری ئاوگوڵ لە شووشەی میللی یا وەبەرهێنراو لە شاری فینیسیا، دروستکراوە. ئەگەر داهات و سەلیقەی خێزان رێگەی بدایە، ئەوا رژێنەر وتاس وقاپی سابوون و قودوی بوخووروومۆمدان لە زێر یا زیو هەڵدەبژێردران. بەڵام نووسراوە قورئانیەکان کە بەجۆری نووسینی زۆرجوان چنراون، هەروەها کاغەزی خەتی ونووسینی پیتی ئەدەبی کلاسیکی، کە بە وێنەی جوان دەڕازێنرایەوە، ئەم شتانە

لەلایەن دەوڵەمەندە خاوەن سەلیقە ئەدەبیەکانەوە داواکاری لەسەربوو. پاشان ئەم دەستنووسانە بە بەرگی هەڵکەنراو یا کۆپی و رەنگاورەنگ کراو بەرگ دەکرێن. هەروها ئەو دیزاینانە بۆ بەرگی ئەم دەست نووسانە بەکارەهاتن لەگەڵ ئەوانەی لە دیزاینی تەقلیدیدا باو بوو، وێك دەچوون، کە لەسەر سەرچەفی ئاورێشمی چنراوو لاکێشەکان دەچنران. لە دیوەخان جا چ لە سەلامولك یا حەرمولك بێت، ئەوا تاخمە قۆری قاوەی کانزایی و فنجانی شوشەیی کە بە هەڵگرێکی کانزایی تۆڕیی چوارچێوەیی دەورەی گیراوە، دادەنران. هەروەها تاخمی بچووك بۆ پێشکەشکردنی قاوەو ساردی بۆ میوانەکان دەبینرێت. ئینجا ئەو وێنەو جوانکارییانەی بەکارهاتوون، رەنگدانەوە سروشتی جیاوازی بەشی پیاوان و ژنانە. زەخرەفە اریتی هەڵکەنراو —کە زۆربەی بە سەدەف رەنگ یا تێرکراوە— بە دیواری ژوورەکەوە لە نێوان عەمبارو تاقەکانی ژووری سەلامولك هەڵدەواسرێت. ئەمەش بۆ هەڵگرتنی ئەو مێزەرانەی زۆر بەتووندی لوول دەکرێن و پیاوان لە تورکیای عوسمانی لە سەری دەنێن. بەڵام سەبارەت بەشتە تایبەتییەکانی تری پیاوانە، ئەوا بریتین لە کیفی لە پێست دروستکراو یا مەخمەلی چنراو لەبەر ئەوەی بەڵگەنامە و نامەی تری تێدا دەپارێزرێت، ئەمە جگە لەوەی کیسی پارە ونامەو تووتنی تێیدایە. لەلایەکی ترەوە، واتە ژووری حەرمولك، ئەوا ملوانکە، بازنە و ئامرازەکانی خۆجوانکردن لە ناو قودوی زەخرەفەیی جوان کە زۆربەی جار لە زیویهەڵکەنراو یا قالب کراو پێکهاتووە، دەپارێزرا. هەروەها سندوقی داری رەنگ کراو کە شتەکانی ئافرەتانی تێدا هەڵدەگیرا، وەك ئامرازەکانی جوانکاری کە پێکهاتبوون لە ئاوێنەی زیوی و شانەو قاپ و سابوون، هەروەها قوتی بچووك کە ئامرازەکانی جوانکاری تێدایە. قاپ قاپە کە ژێرێکی بڵندی هەبوو و لە حەمام لە پێ دەکرا (وێنەی٦٦). هەروەها چوارچێوەی ئەتەمین و قودوی

داوو دەرزی کـە بـۆ تـەتریز، کـە هونـەرێکی سـەرەکی ناومـاڵ بـوو، بەکاردەهات. لەگەڵ ئەمانەشدا دەرفەت بۆ ژنان رەخسا تـا فێـری هونـەری خۆشنووسی و هونەری وێنەکێشان و قەڵەم و کاغـەز وئامێرەکـانی مۆسـیقا نمونەی ((سـاز)) کـە ملـی درێـژە و (نـای). پاشـان وورەدە وورده دەسـتکرا بەچارەسـەرکردنی ڕووبـەرەکانی نـاوەوەی خـانووی دەوڵەمەنـدەکان، واتـە چۆنیـەتی ڕێکخستنی وەزیفەی هەر بەشـێکی ناومـاڵ، ئەمـەش لـە ڕێگـەی پەیوەندیکردن بە مۆدێلی ئەوروپی لە ڕێکخستنی کەل وپەلی ناومـاڵ. ئـەم حاڵەتە بە ئەندازەیەکی کەم سەرەتا بە دانانی گڵـۆپ وقـۆری وکـتری وقـاپ وقاچاخی شووشەی هاوردە لە (بۆهیمیا)وە مالّی پێ دەرازێنرایـەوە. پاشـان کەلوپـەلی تـر لەناوماڵـەکان بـەکارهاتن، کـە بـووە هـۆی ئـەوەی وەزیفـەی ژوورەکان سنووردار بکات و چوارچێوەکەی تەسکتربکاتەوە. (مەلەکخان)[٦] لەبارەی چونی بۆ کۆشـکی (ئـەسما سـوڵتان)[٧] لەسـاڵی ١٨٤٨ و پێشـواری لێکردنـی، لـە نووسـینەکانیدا وەسـفی ئـەو پێشـکەوتنەی کـە لـە رووی سەلیقەوە بەسەر ناوماڵدا هاتووە، لە دەقێکیدا هاتووە:

لـە سـێ ژوور پێکـدێت، ژوورێکـی دانیشـتن، ئـەویتر ژووری نووسـتن و سێیەمیان ژووری نان خواردن. دیوارەکان بـە گـوڵی سـپی وسـوور رازابوونـەوە، بەڵام پەردەکان لـە سـوفی کشـمیری جـوان وخـەت خەتدروسـتکرابوون هـەروەها لاکێشی گران بـەها زەمینـەکـەی پۆشـیبوو و ئاوێنـەی نـاوازە بـە دیوارەکانـەوە هەڵواسرابوون، ئینجا قاپی زێڕین وتێرکراو بە گەوهـەر کـە پـڕ لـە شـیرینی لـەم لاوئـەولای ژوورەکـە دانـراوون، ڕێـز کـراون. هـەروەها جێگـای دانیشـتنی نـەرم وخۆش ولەسەر دانشی مەچەکدار کـە دەسـتکردی رۆژئـاوایی بـوو، دانرابـوون. چـەندین گڵـۆپ لەگـەڵ مۆمـدانی گـەورە لەسـەر شـێوەی رۆژهـەڵاتی بـەناو ژوورەکەدا بڵاوکرابووەوە، ئەم مۆمدانانە لـەوجۆرە دەچـوون کـە لـە کڵێسـاکانی فەرەنسا بـەکاردەهاتن. دەوڵەمەنـدەکانی قـاهیرە وا راهـاتبوون کـە ماڵـەکانیان

بەکەلوپەل و کاری دەست چنراوی جوان، رایەخ بکەن، بەڵام بەشێوەیەکی تر. ئەو بەر پەنجەرە دارینە نەخشێنراوانەی کە بەری پەنجەرەی ناو تاقە بە ژووورداچووەکانیان دەگرت، بواری نەدەدرەخساند بۆ هەڵواسین و دانانی پەردەی مەخمەلی و ئاورێشمی، بە هەرحاڵ ئەم شتانە بۆکەش وهەوای قاهیرە قورس وئەستوور بوون. بەڵام زەمینەی ناوماڵ، ئەوا بەروخامی رەنگاورەنگ و جۆری جیاواز کە بەشێوەیەکی بەهرەمەندانە تێکەڵاوکراو ولەتەك یەك دانراوە، رایەخکراوە، بەمەش زەخرەفە رەنگاورەنگییەکی زۆر جوانی بە ناو ماڵەکە دەبەخشی. بەڵام لە مانگەکانی زستان بۆ پاراستنی پێیەکان لە ساردی زەمینەی ژوورەکان و فەراهەمکردنی فەزایەکی گەرم وگوڕ بۆ دانیشتن، ئەوا پارچە لاکێشی بچووك رایەخدەکرا. پارچە لاکێشەکان بە تایبەت بۆ ئەو شوێنانە دادەنران کە سەکۆ نیمچە بەرزەکانی لێواری دیواری ژووری پێشوازی و رایەخکردنی ژووری نووستن بەکاردەهاتن. ینجا بۆ هەڵگرتنی لاکێشەکان، لێرەدا هەر وەکو وڵاتی تورکیا هەڵدەگیرا تا ئەو کاتەی پێویستی دەکرد دەربهێنرێت. کەچی ئەو پارچە کەلوپەلانەی کە دەگوازرانەوە، ئەوا کەمتر لە ماڵە تورکیەکان باو بوو، ئەمانە لە هەڵگری دارینی نیمچە بەرز پێکهاتوون و سینی کانزاییان لەسەر دادەنرا، هەروەها لەکاتی نانخواردندا وەکو خوان، هەروەها وەك هەڵگری ماشەی خەڵوز بۆ گەرمکردنەوەی ژوورەکان لەکاتی سەرما و سۆڵە بەکاردەهات. مەرکانە شووشەییەکان و شتە کەسییەکان کە لەسەر رەفەکان بەدرێژایی دیواری ژوورەکان ریزکراون، مۆرکێکی کەسی دەبەخشێت. هەروەك چۆن تورکیا دەستی بە گۆڕان کرد، ئەوا لە دوای پراکتیزەکردنی بەرنامەی نوێ لە حەفتاکانی سەدەی ١٩ قاهیرەش گۆڕانی بەسەردا هات. توخمەکانی زەخرەفەو رێکخستنی ناوماڵ لەسەر شێوەی ئەورووپی ئاست بەرز هاتە ئاراوە -وەکو چۆن ئێلین شینێلز EIIen ChenneIIs دایەنی شازادە زەینەب کچی خدێوی ئسماعیل، وەسفی

ماڵە دەوڵەمەندەکان دەکات: لەناو هۆڵێکی فراوان دابووین و بەشێوەیەکی زۆرجوان کەل وپەلەکانی لەسەر مۆدێلی فەرەنسی ڕێکخرابوون، لەلایەکانیەوە ئاوێنە و قەنەفە و لەسەر دانشی مەچەکدار کە بە ئەتڵەسی دەمقەسی زەرد رووپۆش کرابوون، ریزکراون. پەردەی پەنجەرەکانیش لەهەمان قوماش دروستکرابوون. ئینجا چەندین دەرگا لەم هۆڵەوە بەسەر بەشەکانی ناوەوە دەکرانەوە و وایکردبوو هۆڵەکە لەهاویندا فێنك بێت، بەڵام لەزستاندا زۆر ساردبوو. هەروەها لاکێشی زۆر و گرانبەها راخرابوون و سورەیە (ثریا)ی گەورەش بە بنمیچی هۆڵەکەوە هەڵواسرابوون لەگەڵ مۆمدانی پەل پەل لەو جۆرەی بەدیوارەوە هەڵدەواسرێت. لە ئێران بۆ گۆڕینی وەزیفەی ژوورەکان، تەنانەت جیاکردنەوەی بەشی پیاوان لەبەشی ژنان کە لە رووی وەزیفەوە لەماڵی تورکی یا میسری جیاوازە، رێگەی تایبەتی هەبوو. لەو ماڵانەی کە بیرۆنی وئەندرۆنی لەدەوری حەوشێکی لاکێشەیی یا چوارگۆشەیی دروسکراوون، ئەوا پەنجەرەی ژوورەکان لە بنمیچەوە تا زەوی بە گەورەیی دروستکراون، ئەم پەنجەرانە چەتری دارینیان بۆ دانراوە کە دەتوانرێت بۆ سەرەوە یا خوارەوە بەپێی ئارەزوو بۆ جیاکردنەوەی رووبەری ژووری دانیشتن، رابکێشرێت، هەروەها بۆ کردنەوەو داخستنی رووبەرەکان بەپێی گۆڕانی کەش وهەوای هەر وەرزێك، بەکاردەهات. لە ماڵە ئێرانییەکاندا نەبوونی کەل وپەلی گواستراوە و نەگواستراوە زۆر بەزەقی دەبینرا، بە جۆرێك شتێکی وای تێدا نەبوو وەك ئەوەی لە دیوەخانە تورکی و میسرییەکان بە دی دەکرێت، واتە ئەو لەسەر دانشانەی کە بە درێژایی ژوورەکان (لە دیوەخانی تورکی و میسرییەکاندا هەبوون)، لە دیوەخانی ماڵە ئێرانییەکاندا بوونی نەبوو. هەروەها هەڵگری دارینی بچووك بۆ هەڵگرتنی سینی کانزایی تایبەت بە نانخواردنی تێدا نەبوو، تەنها ئەو قوڕنانە نەبێت کە لەقەد دیوارەکان و بۆ دانانی کتێب وشتی رازاندنەوەی دانسق وەك مەرکانی شوشەیی فەخفوری تێدا دادەنرا. هەندێ جار بۆ پاراستنی کەل وپەل

وجل و بەرگ باوڵ هەبوون، ئەگەرچی هەموو ئەو کەلوپەلانە دەتوانرا هەموویان لەسەر یەك دابنرێن و لەگۆشەیەکی ژوورەکە و بەسەرچەف یا دەسماڵ داپۆشرێن. حاشیە نزمەکان و پێخەف (دۆشەك) بۆ ئەوەی وەك جێگەی نووستن لەسەر زەوی رادەیەخران. بەڵام ژەمەکانی نانخواردن، ئەوا لەسەر خوان و لەسەر زەوی دادەنران. بەکارهێنانی کورسی وەك شوێنی دانیشتن تەنها لە دیوانی پاشاییدا بەکاردەهات. فەتح عەلی شای قاچار وەك چۆن وەسفی دەکرێت، وێنەیەکی کێشراوە، لەو وێنەیەدا شا فەتح لە هۆڵی پێشوازی ولە کۆشکی گوڵستان لەسەر کورسی پاشایەتی دانیشتوە. ئەم کورسیە شێوەیەکی پانی هەیەو لەروخامی سپی دروستکراوە ولە لای شانەکانی شاوە پەیکەری ئاژدڵی داتاشرا وهەیە، بەڵام ئەمە وێنەیەکی بێ هاوتایە. سادەیی لە بەکارهێنانی ژووری دانیشتن کە لەسەر زەوی دادەنیشن، وایکردوە بە ئاسانی بتوانرێت ژوورەکان وەك ژووری نووستن، خواردن و پێشوازی بەکاربهێنرێن. بۆیە ئەوکەل وپەلەی لە کولتوری شارنیشنی ئێراندا زۆر گرنگ بێت، ئەو رایەخانەن کە رووی زەوی دادەپۆشن بەتایبەتیش کەل وپەلی خێزانی، وەك لاکێشی ئاورێشمی و سوفی (وێنەی٦٧). هەروەها جیاوازی لە ئەستوری وبەرزی وجۆری لاکێشەکان و بەکارهێنانیان وەك ئامرازێك بۆ داپۆشینی زەوی و دابینکردنی گەرمی، یا پۆشینی پشتی وسەرینەکاندا هەیە. واتە جۆرە جیاوازەکانی لاکێش وەزیفەی دیاریکراوی خۆیان هەیە. هەموو ئەو لاکێشانەی کە خێزان هەیبوو لەیەککاتدا بەکارنەدەهاتن، بەجۆرێك پارچە لاکیشەکان زۆر بەئاگاییەوە لولدەکراو لەسەر چینێکی پارێزەری دروستکراو لە لباد کە خۆی لە خۆیدا چنراوێکی رازاندنەوە بوو،دادەنرا. د. وێلز Dr0 WiIIs [8] –کە لە بەشی کارگێڕیی تەلەگرافی فارسی کاری دەکرد، یەکێك بوو لە تێبینیکارە هەرە وردبینەکانی کولتووری نەریتی ئێرانی–وەسفی رێکخستنی ناوماڵە دەوڵەمەندەکان لە شەستەکانی سەدەی ١٩ دەکات: ئێرانیەکان هەمیشە بۆ پۆشین و رازاندنەوەی دیواری

ژووره‌كانیان، به‌تایبه‌ت به‌شی سه‌ره‌وه وناوه‌ڕاستی ژووری ماڵه‌كانیان (نه‌مه‌د) لبادیان به‌كارده‌هێنا. هه‌ر ژوورێك سێ دانه‌ی تێدایه‌، دوانیان (كه‌ناره) واته ئه‌وه‌ی له‌ كه‌ناره‌وه راده‌خرێت، مه‌ترێك یا مه‌ترونیوێك داگیرده‌كات (سه‌راندارز)یش، واته ئه‌و پارچه‌یه‌ی كه له ناوه‌ڕاستی ژووره‌كه هه‌ڵده‌واسرێت و ئه‌ستورییه‌كه‌ی دوو سانتیم یا دووسانتیم ونیوه‌، عاده‌ت وایه ره‌نگی خاكی یا زه‌رد باوی هه‌بێت. ئینجا به‌زه‌خره‌فه‌ی ره‌نگ كاڵ رازاوه‌ته‌وه‌، وه‌ك شین، سپی یا سورو سه‌وز ئه‌مانه پارچه سوفی ره‌نگاوڕه‌نگن و له‌ كاتی رستنی لباده‌كه ده‌خرێنه نێوه‌نددییه‌وه‌. ئه‌و شوێنانه‌ی لاكێش و رایه‌خیان لێدروست ده‌كرا و له‌گه‌ڵ هه‌موو زه‌وقێكدا ده‌گونجان كاشان، ئه‌سفه‌هان وكرمان (وێنه‌ی ٦٨) بوون، به‌ڵام هه‌میشه جوانترین زه‌خره‌فه به‌لای ئێرانیه‌كانه‌وه ئه‌و جۆره‌یانه كه دارو دره‌خت و ئه‌مامی چروپری تێدایه‌، چونكه له‌گه‌ڵ دیزاینی ناومالی ئه‌واندا ده‌گونجا، هه‌روه‌ها زه‌خره‌فه‌كان ئه‌خشی باوه‌شێنی حه‌سیری و چه‌پكه‌گوڵی تێكه‌ڵ به‌ئه‌مام كه رایه‌ڵ ولولدراون، هه‌روه‌ها ئه‌و دیزاینانه‌ی ئاراسته‌یان هه‌بوو وه‌ك دارو دره‌ختی گوڵدار و به‌رهه‌مدار شریتی گوڵێن ولقی لێبووه‌وه و دیزاینی نه‌ریتیی كه به‌ده‌سكه گوڵه‌گه‌نم به‌ستراون، له‌خۆی ده‌گرت. ره‌نگی زه‌خره‌فه‌كان له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌مه‌ندی دیزاینی یه‌كه زه‌خره‌فیه‌كان كه ره‌نگی هه‌ناری و پرته‌قاڵی زه‌ردباوی زێڕین و، شین وسه‌وزی كاڵ وتۆخ له سه‌ر زه‌وی ڕه‌نگ خاكی یا سپی شیری تێدا به‌كارده‌هات، ده‌گونجان. ئه‌م دیزاینه ناوازانه‌ی لاكێشه‌كان په‌یوه‌ندییه‌كی گه‌رم وگوڕ له‌گه‌ڵ دیوان و زه‌خره‌فه‌ی گه‌چی ڕه‌نگ كراوو هه‌ڵكه‌نراوی قه‌د دیواره‌كان دروستده‌كات. بۆیه گه‌شه‌سه‌ندنی سه‌لیقه‌ی حه‌زلێبوون له دیمه‌نی گه‌وره به درێژایی سه‌ده‌ی ١٩ شتێكی له‌ناكاو نه‌بوو. ئینجا ئه‌ده‌بی نه‌ریتی وچاپه‌مه‌نی رۆژئاوایی وهه‌ڵكه‌نراوه‌كان و وێنه فۆتۆگرافه‌كان بوونه بابه‌تی وێنه‌ی چه‌ندین جۆر لاكێش. له‌ كۆمه‌ڵگه‌دا وێنه‌ی زه‌یتی گه‌وره‌ی پیاوان و ژنان كه به‌ئالووالای زۆرجوان ده‌رده‌كه‌وتن

هەبوون و هیچ بەریەککەوتنێك لە بەرامبەر پێشکەوتنی سەلیقەی نەخشاندنی وێنەی وەرگیراوی کەسەکان، کە بە هونەرێکی زۆرجوان وناوازە وداهێنەرانە و بەگرێ وگۆڵی زۆر بچووك لەسەر لاکێشەکان نەبوو. ئەو بابەتانەی لە وێنەکان بەکاردەهاتن بریتیبوون لە بابەتەکانی رابواردنی وەکو سەماو مۆسیقا ودارو درەختی گەورە کە ئاژەڵی سەیر سەیری وەك نەمەس و بلاتیبۆس بە دەنووکەکەیەوە کە لە دەنووکی مراوی دەچێت، شێر و بلبل. چنراوو قوماش و هونەری بەهرەدارو جۆراوجۆر بۆ داپۆشینکردنی پەردەی وا کە لەگەڵ مۆدی لاکێشی زەوی ژوورەکاندا گونجاوبێت. ئاورێشمی سپی یا زەرد لەسەر ناو پۆشێکی ئەستوور دەچنراو بە دەزووی باریکی قرمزی، پەمەیی، شین، سەوزو زنجیرێکی پێوە دەکرێت بۆ دیاریکردنی هێڵە دەرەکیەکان و دروستکردنی زەخرەفە کە بەسەر زەمینەی ژوورەکەدا و لەسەر شێوەی یەکەی زەخرەفی نەمام ئاسا بڵاوبوونەتەوە، هەموو ئەمانەش بە چوارچێوەیەکی زەخرەفەیی و لەسەر شێوەی نەمامی هەڵواسراوەی کەوانەیی نەخشێنراون. ئەم چنراوانە وەك سەرچەفی پێخەف یا سەرچەف بۆ ئەو رایەخانەی کە لەسەر زەوی رادەخرێن و بۆ دانیشتن ئامادەکراون، بەکاردەهاتن. رەنگە جوانترین سەرچەف و بەهادارترینینان لەرووی چنینەوە ئەوانەیان بن کە لە مەخمەل یا ئاورێشمی قرمزی کە بە داوی ئاورێشمی رەنگاورەنگ یا زیوی چنراون و وێنەی گوڵ وگولزار و باڵندەی لەسەر دروستدەکرا. لەگەڵ ئەوەی عادەت وابوو کە شتە چنراوەکان وەکو سەرچەف بەکاردەهێنران، کەچی بەڵگە هەیە کە وەکو پەردەی تاقەکان وپەردەی پەنجەرەش بەکارهاتوون. بۆ ئەمەش دکتۆر وێلز لبنیت لە تاران و لە شەستەکانی سەدەی ١٩ دەڵێت: ئەو دەرگایانەی لە دارگوێز دروستکراون بە پەردەی ئاورێشمی ((یەزد)) رەنگ ئاڵ داپۆشراون، کە پانیەکەی نزیکەی ٦ بە ٤ پێ دەبێت و زۆر بەسادەیی لەسەر دەروازەکان هەڵواسراون. ئەم پەردەی پەنجەرانە و پەردەکانی تریش لەسەدەی ١٨، ١٩

نمایشکردنێکی زۆرجوانی هەبوو. هەندێك لە شارەکانی ئێران بە ناوازەیی بەرهەمەکانیان ناوبانگیان دەرکردبوو، کرمان بە دروستکردنی چنراوی جوان ناوبانگی دەرکردوە، تەنانەت کرمان دەیتوانی پێداویستی کەل وپەلی ناومال وجل وبەرگی دروستکراو لە چەندین جۆری جیاوازی لاکێش وچنراو بەرهەم بهێنێت. هەروەها جۆرێکی ناوازە لەقوماشی چنراو دروستدەکرا. زۆربەی جار لەسوفی سوری زۆرچاك و بەدیزاینی زۆر زیندوی زەخرەفی نەمام، حەسیر، باڵندە و درەختی سەرو دروستدەکران، ئەم دیزاینانە زۆر بەووردی و بە سەلیقەیەکی لە رادە بەدەر دەچنران. بەڵام شاری رشتی ناوچەی دەریای قەزوین لە هونەری بەیەك گەیاندنی پارچە پارچەی وورد وناسك کە کاتێکی زۆری دەخایاند پسپۆریی وەرگرتبوو. لەم تەکنیکەدا چەندین جۆر پارچە سوفی رەنگاورەنگ کە هەریەکەو بەویترەوە دەچنران، ئەم کارە دەستییە پێکهاتبوو لە رەنگی سوور، سەوز، زەردو ڕەش هەر هەموویان پێکەوە تێکەڵدەکران، پاشان بە تاڵەدەزوو زەخرەفەی لەسەر دروستدەکرێت و ووردەکاریەکانی زەخرەفەکانیش بە رەنگی جیاواز دەنەخشێنرێت. بابەتی ئەم زەخرەفانە دارودرەخت بوون کە شێوەی وێنەی سروشتی دەبەخشێت یا وێنەی وەرگیراو وەك وێنی مرۆڤ. قوماشی لۆکەی مۆرکراو (واتە ئەوەی وێنەی شتی لەسەر دەنەخشێنرێت) چەندین بەکارهێنانی هەبوو، بۆ نمونە بۆ دروستکردنی پەردە، پەردەی ناوبڕەو سەرچەفی پێخەف وجل وبەرگ بەکاردەهات. ئەسفەهان بەم جۆرە چنراوە ناوبانگی دەرکردبوو، ئەو لۆکەیە بەهۆی قالبی دارینی هەڵکەنراو مۆر دەکرا، کە چوارچێوەیەکی ڕەشی بۆ دروستدەکرد، پاشان یەکە زەخرەفیەکە بە رەنگی سوور یا شین یا زەرد رەنگ دەکرا. ئەم دیزاینی قوماشانە جۆراوجۆر بوون و بە خەیاڵێکی چڕ وپڕەوە بیرۆکەی وێنەکانی دادەرێژرا. چەند شێوەیەکی وەرگیراو لە سروشت وەك دارودرەخت و پڵنگ وتاوس و شێوەی مرۆڤ و وێنەی راو و نێچیرگرتن لەسەر چنراوەکان دەنەخشێنران، کە دواتر وەکو قالبی پەردە

بەکاردەهاتن، لەکاتێکدا دیزاینی یەکە زەخرەفییەکان کە شێوە نەمامی گوڵ وگوڵزارە دووبارە بووەوەیان هەیە، زیاتر لەجل وبەرگدا بەکاردەهاتن. قاپ وقاچاخ وئامرازەکانی رازاندنەوە وکەل وپەلی کەسی تایبەت کە لە رووی شێوە و دیزاینەوە لەگەڵ کەل وپەلی ناومالّی ئێرانی و زەخرەفەو قوماشەکاندا دەگونجێت. قاپ وقاچاخی فەخفوری و دەوری لە قوڕی سپی کە دەنکۆڵەی وردی تێدایەو گوڵ وگوڵزار و زەخرەفە ودرەخت ونەمام بە رەنگی جیا جیا شێن بەپلەی جیاوازی تێدابوو. یا تێکەلاوکردنی رەنگی سوور، سەوز، زەرد و ڕەش، پاشان بە چینێك شوشەی تەنك وناسك ڕووپۆش دەکرێت. خەڵکی زیاتر مەیلیان لەسەر هاوردەی فەخفوری چینی بووە کە بەناوی ((دەستەی گوڵ ئاسان))[٩] FarmiIIe rose دەناسرێت و بە مینتالەسەر شێوەی درەخت نەخشکراوە. هەروەها قاپ وقاچاخی هێنراو و دروستکراوی کارگەکانی رۆژئاوا، وەك ویدجیوود Wed geWood و، مینتۆن Miton و، وسڤریز Sevres. سفری نەخش کراو نمونەی دانسقی رازاندنەوەی پێکدەهێنا، وەك مۆمدان، قاپ وقاچاخی رووپۆش کراو هەندێك شتی ناوەزە و دەگمەن لەسەر شێوەی تاوس. کورخانی دارینی ناومالّە ئێرانیەکانبەهۆی کاریگەری هونەری رۆژئاواییەوە، نوێکاری بەسەرداهات. رەفەی سەرەوەی کورخانەکان بۆ نمایشکردنی ریزبەندی مەرکانە وچرای مسی و ئاوێنەی چوارچێوە زێرینی و وێنەی رەنگاوڕەنگ، شوێنێکی گونجاوە. لەئێران بۆ چەندین ئامرازی جۆراوجۆری رازاندنەوەی ناو مالّەکان، تەکنیکی کاغەزی کارتۆنی بەکاردەهات. ئەو وێنانەی بەم تەکنیکە دەکێشران، پەیوەندییەکی زۆر توندیان لەگەڵ وێنەی دەستووسە مێژووییەکاندا هەبوو، بەجۆرێك رەنگی ئاوی بۆ وێنەی دیزاینە وردەکان بەکاردەهات، پاشان ئەم وێنانە بەچینێکی پارێزەر لە وارنیشی ناسك کە لە ماددەیەکی چەسپی پێکهاتووە، رووپۆش دەکرا. ئەم کاغەزە کارتۆنییانە وەك قودو بۆ پاراستنی زێرو گەوهەرو دۆکیومێنتەکان و

بەرگی کتێب و شوێنی تایبەت بە دەرزی قایمکردن و بازنە و ملوانکەی بچووك وقودوی ئاوێنە بەکاردەهات. یەکێك لەو سیفەتانەی کە زۆر سەرنج راکێش بوون بابەتی وێنەکانن، واتە چیرۆکی وێنە بۆ کێشراو وەك ئەو رووداوە خۆشانەی لە چیرۆکی یوسف (سلاوی خوای لێبێت) و زولێخادا هاتووە. ئەم بابەتانە وێنەیەکی جۆراوجۆر لە بەهاو داب ونەریتی ژیانی شارنشینی وکولتووری ئێرانی دەخاتەڕوو. تەکنیکی دروستکرنی کارتۆن لەڕووی وردەکارییەوە، تەواوکەری کارێکی دەستی هاوشێوەیە ئەویش مۆزاییکە، کە ئامراز وئامێری زۆر دەرازێنێتەوە، وەك رووی دەرگا، ناوبڕەکان، قودو وئامرازی تایبەتی وەك شانە و قودوی ئاوێنە. ئەم تەکنیکە بریتییە لە نووساندنی پارچە ئێسك، عاج وداری رەنگاوڕەنگ هەریەکەو لەگەڵ ئەویتر، ئەویش بە بەکارهێنانی مادەی چەسپ، بەم پێیەش یەکەی رازاندنەوەی زۆرجوانی لێ دروستدەکرێت. پاشان کۆمەڵێ توێژاڵ بەهۆی چەسپێکەوە کە لەسەر بنچینەیەکی دارین دادەنرا و بەیەکەوە چەسپ دەکران، دواتر بە وارنیشێکی شەفاف رووپۆشدەکرا. دیزاینی کۆتایی ئەم بەرهەمە بریتییە لە یەکەی زەخرەفی تێکەڵاو وەك شێوەی شەش لایی وئەستێرەیی. لە کۆتاییدا لە رایەخکردنی ناوماڵی سەرکردە قاچارەکان، و ناوماڵی دەستوپێوەندە دەوڵەمەندەکان، شێوازی رۆژئاوایی بەکاردەهات. بە تایبەتی دوای رێکخستن ونۆژەنکردنەوەی تاران لەلایەن ناسرەدین شا لەشەستەکان وحەفتاکانی ١٩، بەجۆرێك زەخرەفەی رۆژئاوا لە رووی دیزاینی فیکتۆریایی و رەنگەوە، ئەوا بەبێ دوو دڵی لەگەڵ دەروازەی ناو ماڵە ئێرانیە دەوڵەمەندەکان بەکاردەهات.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

(١) ئێدوارد ویلیام (١٨٠١-١٨٧٦). زمانناسە و زمانی عەرەبی خوێندوە. لە هێرفۆرد هاتۆتە دنیاوە و کوڕی پیاوێکی ئاینی بووە. سەرەتای ژیانی بە هەڵکەندنی دار و ئاسن دەستی پێکردوە، بەڵام پێویست بوونی بە کەش و هەوایەکی گەرم هانی دا کە بچێت بۆ میسر و، پاشان هەموو ئیش و کارەکانی تری بە میسرەوە پەیوەست بوو. بەرهەمی هەردوو گەشتەکەی یەکەم (١٨٢٥- ١٨٢٨) و دووەمی (١٨٣٣- ١٨٣٥) کتێبەکەی بوو بەناوی (دابوونەریتی میسرییە نوێخوازەکان). کە چەندین جار لە چاپ دراوەتەوە و بووە بە سەرچاوەیەکی بەهادار و بە دوایدا وەرگێرانی هەزار شەوە (١٨٣٨-١٨٤٠)یە کە یەکەم وەرگێرانی ووردوو هەڵسەنگێنراو و بە پەراوێز کراوە، پاشان هەڵبژاردەی قورئانی (١٨٤٣) وەرگێراوە. سەردانی سێیەمی لین بۆ میسر لە (١٨٤٣) بوو بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەك لە پێناو کارە گەورەکەی کە کۆتایی بەژیانی هێنا، ئەویش فەرهەنگی عەرەبیە و خۆی لە ٥ بەرگدا دەبینێتەوە (١٨٦٣- ١٨٧٤) کە دواتر ئەوەی خوشکەکەی کارەکەی تەواوکرد.

(٢) خاتوو ئیلاسایکس گەشتیاری بەریتانی کە لەگەڵ براکەی بێرسی سایکس لە نێوان یابان و تورکیا و ئێران و هند لە چارەکی کۆتای سەدەی ١٩ گەشتی کردوە.

(٣) قوماشی قنب یان ئەوەی ئێستا بە کەنفا دەناسرێت، بریتییە لە چنراوێکی شێوە کەتانی، بەکاردێت لە دروستکردنی چادری بەلەم و کەشتی و ڕەشماڵ، هەروەها لە پشتی وێنە زەیتیەکان و کاری دروومان بەکاردەهات.

(٤) فەرماندە فریدریك گۆڵد سمیت (١٨١٨– ١٩٠٨) لە كۆلێژی كینجز لە لەندەن خوێندنی تەواوكردووە، پاشان پەیوەندی بە سوپای بەریتانی لە قوتابخانە هیندیەكان لە ١٨٣٩ كردووە، هەروەها بەژداری كردووە لەو شەڕانەی كە لە چین ڕوویانداوە لە نێوان ساڵانی ١٨٤٠ و ١٨٤١. هەروەها لەگەڵ هێزی عوسمانی لە شەڕی كریمیا ١٨٥٥– ١٨٥٦ بەشدارییان كردووە. بەڵام ناوی زیاتر بە دەزگای تەلەگرافی فارسییەوە بەستراوەتەوە. هەروەها لەبەر ئەو ڕۆڵەی لە دانووساندنە گرانەكەی لە نێوان سنوری ئێران– بلۆشستانیا و ئێران، ئەفغانستاندا هەیبوو.

(٥) سفر، بریتیە لە مسی زەرد.

(٦) خانم مەلك. لە بارەی میواندارێكردنیەوە لە بەشی میوانان لە كۆشكی (ئەسما سوڵتان) لە ساڵی ١٨٤٨ دەدوێت.

(٧) ئەسما سوڵتان: شازادەیەكی عوسمانیە و كچی محەمەدی سێیەم (١٥٦٧– ١٦٠٣)، خوشكی مەحمودی دووەم و هاوسەری سوقولوم ئەحمەد پاشا بوو.

(٨) پزیشكێكی ئینگلیزی بوو لە دەزگای تەلەگرافی فارسی كاری دەكرد.

(٩) فەخموری (جۆری گوڵی): جۆرێك لە ڕازاندنەوەی فەخفورییە بە مینایەكی ڕەنگ گوڵی كە لە چین و لە سەردەمی بنەماڵە یۆنگ زینگ (١٧٢٣– ١٧٣٥) دەركەوت. لە سەردەمی بنەماڵەی كیانگ لۆنگ (١٧٣٦– ١٧٩٥) كاركردن لەسەری بەردەوام بوو. ئەم فەخفورییە بەوە جیادەكرایەوە كە بە فەخاری مینایی ڕوو پۆشكراوە، هەروەها ڕەنگی ئاڵ و واڵای تێدا زاڵ بوو وەك ڕەنگی سوور و پەمەیی و پرتەقاڵی.

## بەشی چوارەم: ژیانی خێزانی

ناکرێ ئەگەری ئەوە دابنرێت کە ژنان رۆڵێکی دیاریکراویان هەبووەو کاریگەریان نەبووە.

(خانم شیل) خێزانی وەزیری بەریتانی لە کۆشکی پاشای ئێرانی وەسفی سەردانەکەی لە دوانزەی یەنایری ١٨٤٩ دەکات و نووسیویەتی: ئێستا من ئامادەم بۆ پێشکەشکردنی رێزو پێزانینم لەبەرامبەر کاربەدەستی دایکی شا، دایکی شا شاژنێکی زۆر سەرنجڕاکێش و جوانە، پێناچێت تەمەنی لە سی ساڵی تێپەڕی کردبێت و وا پێدەچێت ئەم ژنە زیرەکە لە بەڕێوەبردنی حکومەتدا نفوزێکی زۆری هەبێت. دایکی شا ژیانی شا هەمووی هەڵدەسوڕێنێت، بۆیە شتێکم هەیە کە پاساو بۆ ئەم بۆچوونەم بێنێتەوە بەوەی کە مێشکی ئەو خانمە زۆر شتی تێدایە تا سەرقاڵی بکات. شا سێ ژنی هەبوو.

ئەم تێبینیانە بەشێوەیەکی نادیار ئاماژە بەوە دەکەن کە ژیانی خێزانی لەناو ماڵە گەورەکانی چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتیدا سروشتێکی ئاڵۆزی هەیە. ئەم ژیانە بەشێوەیەکی نەریتی وەستاوەتە سەر تۆڕێك لە پەیوەندی خزمایەتی، دروستبوونی ئەم پەیوەندیانەش لە رێگەی ژن و ژنخوازییەوە دەبێت.

هەبوونی ماڵێکی گەورە پێویستیەکی سەرەکییە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کارا وەزیفەکانی تێدا ئەنجام بدرێت. هەمیشە دوو یا سێ نەوە لە ماڵێکدا دەژین. پێکهاتەی خێزان لەم کۆمەڵگەیانەدا بە شێوەیەکی فەرمی باوکانەیەو لە ماڵێکدا ئەندامی نێری تەمەن گەورە دەسەڵاتی رەهای بەسەر ئەندامەکانی تری خێزاندا هەیە. ماڵە دەوڵەمەندەکان هەمیشە خێزانەکانیان لە باوك، ژنەکەی یا ژنەکانی، کوڕ بە ماڵ و ژنەکانیەوە، ئەو

کوڕانەی سەڵت و ئەو کچانەی کە شوویان نەکردووە یاخود تەڵاقدراون، خزمەتکارەکانی بنەماڵە پێکهاتووە. زۆر ئاساییە کە پێکهاتەی خێزانی جیاواز لەم جۆرەدا هەبێت، ئەمەش بەپێی توانای مادی و بارودۆخی کەسی دەگۆڕێت، بۆ نمونە ڕەنگە داپیرەیەکی بێوەژن لە ماڵی کوڕەزاکەی بژی و سووچێکی ئەو ماڵە کە لە چەند ژوورێك پێکهاتبێت، ئەوا دانەیەکیان بۆ ئەو داپیرەیە تەرخانکراوە.

لەلای چینە باڵاکانی تورکیا ئەمە حاڵەتێکی سروشتیبوون، بەڵام ئەو چینانەی کە زۆر دەوڵەمەندن، ئەوا خانوویەکی تایبەتیان بۆ کوڕان و کچانیان هەبوو، وەك ئەو خانووە گەورەیەی کە سوڵتان ئەحمەدی سێیەم بۆ (فاتمە)ی کچی لە ساڵی ١٧١٨ لەسەر کەناری دەریای بەسفۆر دروستی کرد. هەروەها خدێوی ئیسماعیل لە حەفتاکانی سەدەی ١٩ خانوویەکی لە قاهیرە بۆ منداڵەکانی دروست کرد.

زۆربەی جار لەناو یەکەی خێزاندا خزم و کەسی ئەو خێزانەش لە گەڵیاندا دەژیان، وەك خوشکی سەرۆك خێزان کە تەڵاقدراو یا بێوەژن بێت. هەروەها ئامۆزا بە پلەی جیاواز (وەك ئامۆزای پیاوەکە)، ئەوەش کەمترین خێر و بەخشندەییەك بوو کە بەرامبەریان دەکرا، چونکە داڵدەدانی خزم و کەسوکار ئەرکێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی بوو.

هەرچەندە قەبارەی خێزان گەورە بوایە یاخود داهاتی هەرچەندێك بوایە، ئەوا عورفێك ڕەچاو دەکرا، ئەویش جیاکردنەوەی پیاوان و ژنان بوو لە ناو ماڵ. ئەم عورفە لەگەڵ تێکەڵاوکردنی نەریتە ڕۆژهەڵاتییە دێرینەکان و فێرکردنەکانی ئیسلام پەرەی سەند، کە پێداگیری لەسەر داوێن پاکی دەکات، ئەوەش خۆی لە دابەشکردنی ماڵ بۆ بەشی جیاکراوە دەبینیەوە، بەجۆرێك پیاو بە ژیانی گشتیەوە دەبەستەوەو ژنیش بە ژیانی تایبەتی کە کاریگەری لەسەر تەرخانکردن و نەخشەدانانی ڕووبەری ماڵەکان هەبوو. لە

هەمانکاتدا پاساوی کۆمەڵایەتی و کولتووریش ڕۆڵیان لـە چۆنیەتی خـانوو دروستکردندا هەبوو.

ئەو دەستەواژانەی بۆ ئەو بەشەی خانووبەرە کە بـۆ پیـاو تـەرخانکرابوو بەکاردەهاتن، بەڵگە لەسەر ئەو قسانەی سەرەوە.

بـە جۆرێـك ئـەو بەشـە لـە تورکیـا بـە (سـەلامولك) و لـە عـەرەبی بە(مەنزەرە) و لە فارسی بە (بیرۆنی) ناو دەبرا. هەموو ئەو دەسـتەواژانەش پەیوەندییان بە سڵاوکردن و کرانەوە بەڕووی جیهـانی دەرەوە هەیـە، چـونکە ئەم دەستەواژانە پێداگیری لەسـەر ئـەوە دەکـەن کـە بەشـی پیـاوان شـوێنی پێشوازیکردنە لە میوانی پیاو، ئینجا ئەو میوانە چ خزم و کەس یا غەیرەو هەمکارو بێگانە بن. لەگەڵ ئەوەی هەریەکە لە سەرۆکی خێزان و پیاوەکانی خێـزان دەیـانتوانی لـەو شـوێنەدا بخـۆن و بخـەون و کـاتێکی زۆری دەسـت بەتاڵیانی تێدا بەسەر بەرن، بەڵام ئەو بەشە ماڵێك نـەبوو بـۆ ئـەوان، ئەمـە لەلایەك لەلایەکی ترەوە ژنانی خێزان بـەهیچ شـێوەیەك نەیانـدەتوانی بچـنە بەشی پیاوانەوە.

لە زمانی تورکیدا دەستەواژەی (سـەلامولك) تـەواو مانـای سـڵاوکردن دەدات و ئەم دەستەواژەیە لەبەرئەوەی بۆنەکە (پێشوازیکردن لە میوان) زۆر لە شوێنەکە گرنگتربوو، بۆیە بـە هـەموو هـۆڵێکی پێشـوازیکردنی فـەرمی دەوترا سەلامولك. هەروەها ئەم دەستەواژەیە بۆ وەسفکردنی ڕێوڕەسمـەکانی هاتنی سوڵتان بۆ نوێژی هەینی لە مزگەوتەکان، بەکاردەهات.

بـە پێچـەوانەوە بەشـی ژنـان لـە ماڵەکانـدا زیـاتر وەکـو شـوێنێکی نیشتەجێبوون ئامادەکرابوو، کە هەموو ئەندامانی خێزان بە ژن و منـداڵ و خزمەتکارەکانیەوە لەم بەشەدا دەبوون. ڕێپێدان و هاتنە ژوورەوە تـەنها بـۆ سەرۆك و ئەندامە پیاوەکانی خێزان و خزمە نزیکەکان ڕەخسابوو تـا لەوێـدا بژین و بخەون. ئەم دەستەواژەیەی کە بۆ بەشی ژنان بەکاردێت مەبەسـتدارە،

ئـەوەتا کـە بـە عـەرەبی (حـەریم) و بـە تـورکی (حـەرمولك) بـەکاردێت و هەردووکیان بە ناڕاسـتەوخۆ ئامـاژە بـە ناوچـەیەکی قەدەغـەکراو، پـیرۆز و جیاکراوە دەکەن، لەکاتێکدا ئـەم دەستەواژەیە بـە فارسـیەکەی (ئـەدرۆن)ە بەمانای بەشی ناوەوەی ماڵ دێت.

هەروەها ئەم دەستەواژەیە (حـەریم) کـە وەسـفی ژن دەکـات، کاریگـەری لەسەر رۆڵی ژن لەناو ماڵدا هەبوو، بـە شـێوەیەك کـە بازنـەی چـالاکیەکانیان لەدانیشتن لە ناو ماڵ کورتکرابووەوە. کاتێك ژنان لە ماڵ دەدەچوون خۆیان بە جلوبەرگی پان و پۆڕو سەرودەم و چاویان بەپێچە دادەپۆشـی تـاوەکو سـەرنجی دەوروبەر بۆ لای خۆیان رانەکێشـن، بـەم رەفتارەیـان پارێزگاریـان لـە خۆیـان دەکرد... بەڵام لەناوەوەی ماڵدانەریتی فرەژنی ئاڵۆزیـەکی دیکـەی دەخسـتە سەر پێکهاتەی ژیانی خێزانییەوە. ئیسلام رێگـە دەدات بـە هێنـانی چـوار ژن بەپێی مەرجی شەرعی خۆی و بە شێوەیەکی فەرمی کـە دەبێـت پیاوەکـە بـە شێوەیەکی دادپەروەرانە مامەڵە لەگەڵ هەریەکێکیاندا بکات. ئەمە جگە لـە ژنـەکانی سـوڵتانی عوسـمـانی و شـای ئێرانـی کـە ئـەم یاسـایەیان بـۆ خۆیـان پراکتیزە نەدەکرد، بێگومان ئەم دووانەش لە پیاوانی ئاسایی جیاوازبوون.

هەموو ژنەکان لە یەك ماڵدا دەژیان، بـەڵام لـە بەشـی جیـاکراوە لـەناو (حەریم) هەر یەکێکیان لەگەڵ منداڵ و خزمەتکارەکانی خۆیدا دەژیـا. ئـەم بارودۆخـە شـێوازی بیناسـازی ئـاڵۆزی هەنـدێ لـە شـوێنی نیشـتەجێبوونە تەقلیدیەکان روونەکاتەوە. (حەریم) بریتییە لـە کۆبوونەوەیـەکی زۆر ئـاڵۆز لـە یەکەیـەکی سـەربەخۆ و بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆش ئـەم حەریمانـە بەیەکەوە بەستراون.

ئـەو خانووبەرانـەی کـە لەسـەر رووبـەرێکی فـراوانتر دروسـتکرابوون، ئـەوا پەیوەندییە خێزانیەکانیان ئاسانتربوون، بۆ نمونە لە حەفتاکانی سـەدەی ١٩ سـێ لە خێزانەکانی خدێوی ئیسماعیل بەیەکـەوە لـە کۆشـکی (عابـدین)دا دەژیـان،

بەڵام هەریەکەیان بەشی تایبەت بەخۆیان هەبوو، بەپێی ئەو گێڕانەوەیەی کە خانمە ئەوروپییەکان گێڕاویانەتەوە، ئەم خێزانانەیان بینیوە وەك **ئێلین شێلز** (وێنەی ٦٩) کە دایەنی خانم زەینەبی کچی خدێوی بووە، لێرەدا وەسفی ژنەکانی خدێوی دەکات کە پێکەوە و بە شێوەیەکی ئاسایی دەژیان.

لە کاتی بوونی ناکۆکیەك تەنیا رێگە جیاکردنەوەی ئەو ژنانەو دروستکردنی خانووبەرەی جیاکراوە بوو بۆ هەر یەکێکیان. ئەم حاڵەتە لە میسرو تورکیا پەیڕەودەکرا کە زۆر پێیان باش بوو، بۆ نمونە ژنی چوارەمی خدێوی ئیسماعیل لە کۆشکێکی جیاکراوە لەوانیتر لەگەڵ کوڕەکەیدا تۆفیق پاشا کە میراتگری شەرعی خدێوی بوو دەژیا. بەڵام لە پێشوازییە فەرمیەکاندا ئەمیشیان (ژنی چوارەم) لەگەڵ ژنەکانی تر پێشوازی لە میوانەکان دەکرد.

فرەژنی مەسەلەیەك بوو پێویستی بە لێکتێگەیشتن و توانایەکی ئەقڵی زۆر هەبوو، ئەمە جگە لە هەبوونی ماڵ و سامانێکی زۆر، بۆیە ئەم شتە لەناو خەڵکی ئاساییدا دیاردەیەکی باو نەبوو. شتێکی زۆر نابەجێیە گەر وا دابنرێت ژنان رۆڵێکی دیاریکراویان نەبووە و هیچ کاریگەریەکیان نەبووە بە تایبەتی لەناو چینی باڵاو ناوەندی کۆمەڵگە. جیاکردنەوەی نێوان ژن و پیاو مانای ئەوە بوو کە ژنان پێگەیەکی بەرزتریان هەبوو لەناو خێزان و سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی ماڵ و حەریمەکان لە ئەستۆی ژن و لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا بوو. خانم شێل مەودای دەسەڵاتی دایکی نەسرەددین پاشای تێبینی کردبوو،بەهەمان شێوە تێبینی دایکی سوڵتانی عوسمانی و دەسەڵاتی بەسەر حەرمولکدا کردبوو، کە لە هەمانکاتدا دەسەڵاتێکی سیاسی راستەقینەشی هەبوو. ئەم پێگەیە وایکردبوو کاریگەرییەکی زۆری لە بڕیارەکاندا هەبێت. لەبەر ئەوەی ژنی موسڵمان رێیان پێدرابوو کە موڵك و ماڵ بەڕێوە بەرن و دایکی سوڵتانیش زۆرێك لەو ماڵ و سامانەی کە بریتیبوون لە ماڵ و

دوکـــانی بازرگـــانی، بـــەڕێوە دەبـــرد، ئەمەشراســـتەوخۆیا لـــە ڕێگـــەی وەکیلەکانیـەوە بەڕێوەدەچـوو. هەمیشـە قـازانجی کارەکانیـان بازرگـانی تـر یانیش بۆ خێر تەرخانیان دەکرد یانیش سەرمایەگوزارییان پێدەکرد.

لەناو ماڵدا پەرستنە و سرووتە ئیسلامیەکان کاریگەریان بەسەر ژیـانی تاکەکانـەوە هەیـە و هـەر بـەویش تـەواو دەبێـت. موسـڵمانی پابەنـد بـە ئاینەکەی لـە ڕۆژێـکدا پێـنج جـار نوێـژ دەکـات، کاتـەکانی نوێـژکردنیش دابەشـــکراون و ڕێوشـــوێنی ژیـــانی ڕۆژانـــەی خێـــزان دەستنیشـــان دەکـــات مەرجەکانی نوێژکردنی موسڵمان زۆر توند نیە و ڕێگـەی پێـدەدرێت لەهـەر شوێنێك کە شیاو بێت بۆ نوێژکردن تـا نوێـژی نەچـێت، بیـکـات. مزگەوتـە گەورەکانی شار بەدرێژایی ڕۆژ کراوەبوون، بەڵام مزگەوتە بچـووکەکانی تێـو ماڵەکانە تـەنها بـۆ نوێـژی نیـوەڕۆو بۆنـە ئاینیـە تایبەتـەکان دەکرانـەوە. زۆربەی جار نوێژ لە ماڵ یا لە شوێنی کارکردن دەکرا کە ئاماژەیەك بوو بـۆ ملکەچی تاکی یا گرووپی بۆ فەرمانـەکانی پـەروەردگار. پیـاوان لـە نوێـژی کۆمەڵی جـەماعی دا بەشـدارییان دەکـرد بـە تایبـەتی لـە نوێـژی نیـوەڕۆی ڕۆژانی هەینی و لە ووتاری هەینیدا ئامادە دەبوون، بـەڵام ژنـانن لـە ماڵـدا نوێژیان دەکـرد، ئەگـەریش بچـوونایە بـۆ مزگـەوت ئـەوا لـە بـەلکۆنێك یـا سوچێکەوە خۆیان جیادەکردەوە. لە ناوماڵـدا ئـەو ڕوویـەرەی بـۆ نوێـژکردن تەرخانـدەکرێت، جیـاوازبوو، چـونکە خێزانـە دەوڵەمەنـدەکان دەیـانتوانی شوێنێکی بچووك کە تایبەت بێت بە نوێژکردن دروستبکەن. لەبـەر ئـەوەی مەرجەکانی نوێـژکردن لەسـەر زانینـی ڕووی قیبلـە و بـوونی بڕێـك ئـاو بـۆ دەست نوێژهەڵگرتن و بەرماڵێك یا هەر شتێکی خاوێن بـۆ ئـەوەی نوێـژکار نوێژی لەسـەر بکـات، کورتکرابـووەوە، ئـەوا دەکـرا نوێـژ لەهـەر ژوورێکـی ماڵەکەدا بێت ئەنجام بدرێت. لەگەڵ بوونی ئەم مەرجە سـادانەی نوێـژکردن، ئەوا خێزانەکان قاڵی دەستکردو چنراوی دەستی بچووك یا پارچـە قوماشـی

چنراو بە شێوەیەکی جوان بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەن، ئامادە دەکرد. هەموو ئەندامانی خێزان بەیانیان زوو بۆ نوێژی بەیانی لە ماوەی نێوان سپێدە و پێش ڕۆژهەڵاتن هەڵدەستان. و لە دوای گۆڕینی جلوبەرگ و خواردنی نانی بەیانی خۆیان بۆ کاروباری ڕۆژانە ئامادە دەکرد..

پیاوان بۆ سەرکار دەڕۆیشتن، یانیش دەچوونە (سەلاموڵك) بۆ پێشوازیکردن لە میوانان. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەرپرسیارێتی ناو ماڵ لە ئەستۆی ژنان بووەو کارەکانی ناو ماڵیان رادەپەڕاندو زۆربەی کاتەکانی دەست بەتاڵیان لە (حەرموڵك) بەسەر دەبرد. وەکو هەموو کۆمەڵگەکانی پێش شۆڕشی پیشەسازی ئەنجامدانی کاروباری ناو ماڵ کاتێکی زۆری دەویست. خۆش بەحاڵی خێزانە دەوڵەمەندەکان کە دەیانتوانی ژمارەیەکی زۆر خزمەتکاریان هەبێت بۆ ئەنجامدانی هەموو کارە گشتی و تایبەتیەکانی خێزان. کارە سەرەکیەکان بریتیبوون لە پاککردنەوەو شووشتنی زەوی و پککردنەوەی بەشەکانی ماڵ لە تۆزو خۆڵ و شووشتنی جلوبەرگ و پێخەف و کڕینی پێداویستی خواردن، کارەکانی سڕینەوەو شووشتنی زەوی و ئامرازەکانی ناو ماڵ بە بەکارهێنانی گسك یا فڵچەو چەمچەی خۆڵ، کارێکی بێ کۆتاو زۆر ماندوو کار بوو هەروەها ئازاریشی بە پشت دەگەیاند. ئەو زەویانەی لە ڕوخام دروستکرابوون بە ئیسفەنج پاکدەکرانەوە.

ئیلا سایکس لە (کرمان) و لە کۆتایی سەدەی ١٩ دا تێبینی گرفتەکانی ناو ماڵی کردووە.. پێکهاتەی زەوی و ژوورەکان وەکو هەموو بەشەکانی تری خانوو لە بەردی بەیەکەوە چەسپکراو پێکهاتووە، جگە لەوەی کە ئەو زەوییە بە (لباد) داپۆشرابوو، لەسەر ئەو لبادەشەوە بە لاکێشی خەت خەت کە هیچ کاتێك لە تۆزو خۆڵ ڕزگاریان نەدەبوو. گرینگیدان بە پاککردنەوەی قوژبن و گۆشەی ژوورەکان بۆ ئەوەی لە مەترسی پێوەدانی دووپشك و جاڵجاڵۆکەی گورگی بە دووربن؛ کارێکی پێویست بوو.

تەنیا ئـەو جلوبەرگانـەی کـە لەبـەردەکران ودەتـوانرا بـە ئاسـانی وەکـو جلوبەرگی ناوەوە، ڕاخـەر، بـەرگی سـەرین، دەستەسـڕو خاولیـەکان کـە بـە بـەردەوامی دەشـۆران، دەکـرا بشـۆرێن و ئوتـوو بکـرێن. بـەڵام جلوبـەرگی ڕازاندنەوەی وەکو (ئەتەمین) یاخود چنراوی بە تاڵـە دەزووی کـانزایی، ئـەوا بە شێوەیەکی خولی (ساڵانە) یاخود (وەرزانە) بە فلچـە دەشـۆران و، دواتـر دەدرایە هەتاو و بە شـێوەیەکی لوولـدراو لـەناو پێچـەر هەڵـدەگیرا. کڕینـی خـواردن کـارێکی زۆر گـرنگ بـوو هـەروەها.بـۆ خێزانـە درێـژەوەبووەکان پێویسـتییەکی سـەرەکی ژیـان بـوو. کڕینـی خواردەمـەنی پێویسـتی بـە بەهرەیـەکی زۆر بـاش هـەبوو بـۆ ناسـین و دۆزینـەوەی ئـەو شـوێنانەی کـە خواردنی تازەو نوێی تێـدا دەفرۆشـن. کڕینـی پێداویسـتییەکان ئـەرکی ئـەو خزمەتکارانە بوو کە شارەزاییەکی زۆریان لەم بارەیەوە هەبوو.

ڕۆنی شل بۆ چێشت لێنان، گۆشتی قاورمە، ماسی، میـوەی پـارێزراوو وشـککراو، شیرینی و دانەوێڵـەو بـرنج کـە دەکـڕان، تـا ماوەیـەکی زۆر لـە کۆگای ماڵەکان بـۆ مانگـەکانی پـاییزو زسـتان دەپـارێزران و سـوودیان لێ دەبینـرا. زۆرێـك لـەو میـوەو سـەوزەیەی لـە وەرزەکـانی بـەهارو هاوینـدا هەبوون، بە تازەیی و لە وەرزەکانی خۆیاندا دەستدەکەوتن. هەندێ شوێن بە هەبوونی بەرهەمی تازەو بەتام وەك: شیری(رائب) لە (کانلیکا) یەکێك بـوو لە ناوچەکانی دەوروبەری بەسفۆر، شووتی بـەتام لـە (مەشـهەد) و، فسـتقی (ڕەفسەنجانی) ئێرانی، ناوبانگیان پەیداکردبوو.

کاتێك کە پێداویستییە سەرەکییەکانی ناو ماڵ ئامادەدەکرا، ئەوا ژنان چەند کارو ئەرکێکیان پێشـدەهات و دەبـوو هەنـدێك لـەو کارانـە هـەم وەك ئەرکێك و هەم وەك چێژوەرگرتنێك ئەنجام بدری.

سەرپەرشتی کردن بۆ فێرکردنی چەندین منـداڵ و لاو جـا چ لـە خـزم و کـەس بـن یـاخود ناسـیاوی خێـزان، ئـەوا یـەکێکبوو لـە بەرپرسـیارێتییە

سـەرەکیەکان، ئەمـەش لەبـەر ئـەوە بـوو کـە منـداڵ حـەزیان لێبـوو و بنەماڵەکەش سەری پێیانەوە بڵندبوو و بە خۆشەویستی و بایـەخ پێـدانێکی زۆرەوە مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـردن. ئـەم منداڵانـە لـە(حـەریم) گـەورە و فێردەکران دەکران، بۆیە هەر زوو لە دایـك و خزمەکانیانـەوە فێـری زمـان و داب و نەریتی ئیسلامی دەبـوون. ئـەو خۆشەویستی و سـەر بڵندییـەی کـە ژنان بۆ منداڵەکانیان هەبوو بە درێژایی ژیان بەردەوامبوو.

سەرباری ئەو هەموو چاودێری و خۆشەویستییە لە رادەبـەدەرە، منداڵـەکان لەسەر ئەخلاقە کۆمەڵایەتییەکان و رێزگرتن لە گەورەو بە تەمەنەکان، پەروەردە دەکران. ئامۆژگاریکردنی منـداڵ لـە رێگـەی دایـك و بـاوك و ئەنـدامانی تـری خێزانــەوە دەبـوو، ئـەم جـۆرە پەروەردەکردنـەش دەبـووە هـۆی دروسـتبوونی دەروونێکی تێکەڵ و سەرسام بە مرۆڤایـەتی و ئاسـانی دروستبوونی. جگـە لـەم شتە بنچینەییانە، ئەوا جۆری فێرکردنەکە جیاواز بوو، ئەمەش بـە پێـی توانـای مادی و باری کۆمەڵایەتی و بەهرەی تاکەکەسی دەگۆڕا.

منـداڵی خێزانـی پاشـایی بـە شـێوەیەکی تـەواو لـە لایـەن مامۆسـتای تایبەتی بە پێی سستمی کۆشك فێردەکـران، بـەڵام سـەبارەت بـە منـداڵانی چینەکانی تر، ئەوا فێرکردن لە مـاڵ یـا لـە قوتابخانـە ئەنجامـدەدرا. ئەمـە سەبارەت بە کوڕان و کچان وەکو یەك بـوو، چـونکە جیاکردنـەوەی ئـەو دوو رەگـەزە لـە دوای تەمــەنی حـەوت سـاڵیەوە پـەیڕەو دەکـرا. منداڵـەکان خوێندنێکی فەرمیان لەبارەی نووسـین و خوێندنـەوەو، خوێنـدنی قورئانـەوە وەردەگرت، جا چ لـە رێگـەی مامۆسـتای تایبەتـەوە بوایـە یـا لـە رێگـەی قوتابخانەی سەرەتایی کە پاشکۆی مزگەوتـەکان بـوون، بـەڕێوە دەچـوو. لـە دوای تـەواوکردنی حـەوت سـاڵی تەمـەن، کـوڕان ئەگـەر بیـان ویسـتایە لـە دامەزراوە یاسایی و ئایینیـەکان وەزیفـەیان دەسـتکەوێت، لـە قۆناغـەکانی قوتابخانەو پـەیمانگاو پاشـکۆکانی مزگـەوت لـە خوێنـدن بـەردەوام دەبـوون.

لەگەڵ ئەوەشدا کوڕان ڕۆڵێکی کاراتر دەگێڕن لە ژیانی سەلامولك، کوڕان لە ڕێگەی کارلێککردن و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ میوانەکانی باوکیانەوە، بەهرە کۆمەڵایەتی و دبلۆماسییەکانیان پێدەگەیەنن.

لەگەڵ ئەوەی فێرکردنی کچان لە پانتاییەکی تەسك و لە چوارچێوەی حەرمولکدا ئەنجام دەدرا، ئەوا بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی کە لەم بارەیەوە هەبوو، فێرکردنێکی فرە ڕەنگبوو. لە حەرمولك کچان لەسەر بەڕێوەبردنی ماڵ و سەرپەرشتی ئەو هەموو خزمەتکارەو دروومان و چنین و چێشت لێنان رادەهێنران. زۆربەی ئەو کچانەی کە بنەماکانی ئیسلامیان دەزانی دەیانتوانی چەند بەشێك لە قورئان لەبەر بکەن. بەڵام کچانی ماڵە دەوڵەمەند و کۆشکەکان و کچی زاناکان ڕۆشنبیربوون و وانەی ئەدەبی عەرەبی، فارسی، تورکی و هەروەها لەسەر دەستی مامۆستای تایبەتی موزیکیشیان دەخوێند. ئەم جۆرە خوێندنە ئاسۆی بیری کچانی چینی باڵای فراوانکردەوە. دواتر لە کۆتایی سەدەی نۆزدە دەستکرا بە دامەزراندنی دایەنی بێگانە بۆ فێرکردنی زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی، پێش ئەم ماوەیە کچان بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو بوارەیان بۆ نەڕەخسابوو تا بتوانن بەهرەو تواناکانیان لە بواری گشتیدا تەوزیف بکەن و بتوانن لە دەرەوەی ماڵەکانیان کار بکەن، تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی گۆڕانی بەسەرداهات. سەرەڕای سەرقاڵ بوون بە کاری ئەدەبی، کچان و خانمان زۆربەی کاتەکانیان بە دروومان و چنین بەسەر دەبرد. ئەم چالاکیانە لە کولتووری شارنشینیدا ئەرکێکی سەرەکی بوو، چونکە لە شاردا بۆ رازاندنەوەی ناو ماڵەکان پشت بە قوماش و چنین دەبەسترێت. هەندێ لەو کارەدەستیانە بە شێوەیەکی زۆر جوان چنرابوون وەك مەخمەلی چنراو بە تاڵی زێڕو زیو و پەمۆی کۆپی لە قاڵب دراوو پەمۆی موسڵی نەرم کە لە ڕێگەی بازرگان و فرۆشیارە گەڕۆکەکانەوە بۆ ماڵەکان دەهێنران.

کچان هەر لە منداڵییەوە فێری ئەو کارانە دەکران کە دەرزی تێدا بەکاردەهات، زۆربەی کاتەکانیان تەرخاندەکرد بۆ دروستکردن و چنینی کەرەستەکانی ناو ماڵ و ئامادەکردنی ئەو بارگەیەی کە کچان لە کاتی بووکێنی لەگەڵ خۆیان بۆ ماڵە مێردیان دەیانبرد. بۆیە لە رێگەی ئەو کارە دەستیانەی کە ژنان دەیانکرد، پێداویستییەکان لە سەرچەف، خاولی، سەرشان، مل پێچ، سەرپۆش، دەستەسڕ، بەرگە سەرین، راخەر، رایەخی ژێر سینی خواردن و بەرماڵ ئامادە دەکران (وێنەی ٧٠). لەو ماڵانەی کە خزمەتکاریان زۆر بوو، خانمی گەورە سەرپەرشتی بەرهەم و فێرکردنی کچانی دەکرد. هەندێ لە خزمەتکارە ژنەکانکاری درووممانی سادەیان ئەنجامدەدا.

چنینی جوان کارێکبوو تایبەت بە کچان و هەندێ خزمەتکاری شارەزاو بەهرەمەند. بۆ ئەندازەی جوانیکارە دەستییەکان پێوەر دانرابوو و بوارێکیان بۆ دەڕەخسا تاکو بەهرەو توانا تەکنیکییە ناوازەکانیانی تێدا بخەنە ڕوو، لە هەمانکاتدا چنین هۆکارێك بوو بۆ دەستەبەرکردنی داهاتێکی سەربەخۆ وەك چۆن ئێدوارد لین لە قاهیرە لە سیەکانی سەدەی ١٩ تێبینی کردووە. (زۆربەی خانمەکان تەنانەت ئەوانەش کە دەچوونەوە سەر خێزانە دەوڵەمەندەکان داهاتی تایبەت بە خۆیان هەبوو، ئەم داهاتەش لە رێگەی چنینی دەستەسڕو دەستماڵ و شتی ترەوە دەستیان دەکەوت، بەهۆی دەلاڵەکانیان دەبردران بۆ بازاڕ یان دەیانبرد بۆ حەریمی ماڵەکانی تر بە مەبەستی فرۆشتنیان). لە رووی هەرێمیەوە جیاوازییەکی بەرچاو لە چنینی قوماش و کارە دەستیەکان بەدیدەکرا، بەڵام بەرچاوترین شوێن کە چنینی بەکاردەهێنا، تورکە عوسمانیەکان بوون، ئەمانە رووی هەموو قوماشێکیان بە شێوازی خەیاڵی و تێکەڵ بە شێوەی چنینی راکێشراوو چنینی بە دواییەك لەسەر ئاورێشمی رەنگ کاڵ و هێمن دەنەخشاند.

خانم ماری وێرتلی مۆنتگیۆ لە نامەکەی کە بۆ (خانم مار) لە ١٠ی مارسی ١٧١٨ نووسیویەتی دەڵێت: ((چەقۆکان لە زێڕ دروستکرابوون و دەسکەکانیان بە ئەڵماس تێرکرابوو، بەڵام ئەو شتە ناوازەی کە حەسرەتم بۆی کێشا رایەخی سەر مێزەکەو دەستەسڕی ناخواردن بوو، کە لە ئاورێشمی تیفانی دروستکرابوون. زۆر بە لێزانی و بە تاڵی زێڕ چنرابوون و شێوەی گوڵی سروشتی تێدا نەخشابوو. بە داخەوە لەکاتی ناخواردن دەستەسڕی بە نرخی ناخواردنم بەکارهێنا کە زۆر جوان دروستکرابوو، وەك ئەو دەستەسڕانەی کە لەو وڵاتەوە دەنێردرێن و، پێت دەڵێم پێش تەواوبوونی ناخواردنی ئێوارە هەموویان پیس بوون)). هەروەها داب و نەریتەکانی جلوبەرگ تەواو ئامادەکرابوو بۆ نمایشکردنی قوماش و چنراوەکان. کەش و هەواوو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان وای پێویست دەکرد لەشی مرۆڤ بە چەند چینە قوماشێك داپۆشرابێت.

لە کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتیدا جلوبەرگ بەلای پیاوان و ژنانەوە زۆر گرنگە، بەتایبەت لای چینی دەوڵەمەندەکان. بەجۆرێك کە جلوبەرگ یەکێکبوو لە بەڵگە بەهێزەکان بۆ دیاریکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی تاك لە ژیانی گشتی و بازنەی تایبەتی ژیانی خێزانی. بایەخی جلوبەرگ لە بەکارهێنانی جۆرە جیاوازەکانی ئەو قوماشە رستراوانەی کە دەستدەکەوتن، دەردەکەوت. هەر لە ئاورێشمی بە نرخ کە لە کۆشکی سوڵتان یا پاشا بە شێوەیەکی تایبەتی بەکاردەهات، تا دەگاتە ئاورێشمی ئاسایی و سوف و پەمۆو کەتان کە بریتیبوون لە بەرهەمی لۆکاڵی یا هێنراو لە دەرەوەی وڵات و لە بازاڕەکان دەفرۆشرا یا دەهێنران بۆ ماڵە گەورەکان و بۆ فرۆشتن نمایشدەکران. دەستە جلکی نیزامی کە ووردەکاری زۆری پێویستە بۆ دوورینی ئەم جۆرە جلوبەرگانە دروومانکاری لێزان دەیان دووری، ئەوا زۆربەی جلوبەرگەکانی بنەماڵە

لەناو ماڵدا دەدووران. ئامینە فەوات تۆغای وەسفێکی داب و نەریتی خێزانی عوسمانیمان بۆ باس دەکات لە سەرەتای سەدەی ۲۰.

لە بەهارو پاییزدا تۆپە قوماش و قوماشی لە پەمۆ دروستکراوو فانیلا دەگەیشتنە ماڵەکان بۆ ئەوەی جلوبەرگی خزمەتکارو بەردەستەکانی لێ بدوورن. هەموو خزمەتکارەکان (ژن و کچ) جلوبەرگی وەك یەکیان بۆ دروستدەکرا، بەڵام ئەوانەی کە پلەی زۆرباش یا باش یان هەبوو، ئەوا دەیانتوانی ئەو جلوبەرگانەو ئەو چنراوە تایبەتیانە هەڵبژێرن کە بە دڵی خۆیانە. دروومانکارە یۆنانییەکە لە هەمان گەڕەك دادەنیشێت و کۆنترۆڵی ژووری دروومانی ماڵەوەی کردووەو لەگەڵیدا خزمەتکارە کارامەکان کە دەستی دروومانیان هەیە یارمەتی دەدەن. ئەمانە جلوبەرگی ئەوانەی لە ماڵەوە کاریان دەکرد دەدووری و هەر خزمەتکارێك چوار دەستە جلی لە لۆکە دروستکراوی هاوینەی بۆ ئامادە دەکرا، دوو دەستە جل بۆ کارکردن و دوانەکەی تر بۆ کاتەکانی دوای نیوەڕۆ، هەروەها چوار دەستە جلی فانیلەیی و دەستە جلێکی سوفی بۆ زستان. ئەمە ئەو سستمە بوو کە لە سەدەکانی پێشوو پێش بەکارهێنانی بەرهەمی گشتی بۆ دروستکردنی جلوبەرگی ئامادەکراو پەیڕەو دەکرا. چینی باڵا بەشێکی زۆری کات و توانایان بۆ ئامادەکردنی جلوبەرگ و رێکخستنیان تەرخاندەکرد، چونکە پارێزگاریکردن لە شێوەو رێکی جلوبەرگ، خۆ جوانکردن بە خشڵ، زیو ئەوا پێگەی کۆمەڵایەتی خانەوادەکانیان بەرزدەکردەوە.

شێوازەکانی جلوبەرگ بە پێی ئەو قوماشە نەخشراوانەی بەکاردەهاتن، جیاواز بوون کە ئەمەش بووە هۆی رەخساندنی بوارێکی فرەڕەنگی بەرامبەر بە زەوقی تاکەکەسی. شێوازو جۆرەکانی جلوبەرگ لە کۆشکدا پێوەرێك بوو بۆ پێگەی تاك لە ئەستەنبوڵ و شارە گەورەکانی تری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. جلوبەرگەکان هەندێ پاشکۆیان بۆ زیاد دەکراو زۆر بە رێکی

ڕێکدەخران کە بە قەمیسی سپی فەقیانەدار دەست پێدەکات (وێنەی٧١)، و لە ئاوریشمی ناسکی لۆچ لۆچ دروستکراو یا لە پەمۆی میللی بە (دانتێلا) کە زۆر کارامە دروستکرابوون، دواتر شەرواڵێکی پان و پۆڕو بەرگی درێژ کە زۆر بە جوانی دووراون و دامەنەکەی لە چەند چینێك پێکدەهات، هەندێ جار چاکەتێکی بچووك و تەسك لەبەر دەکرا. جۆری قوماش و رەنگ و چنینەکەی لە ئاوریشمی نەخشێنراو بە یەکەی زەخرەفی لەسەر شێوەی گوڵی گەورە یا لەسەر شێوەی هێڵی کێشراوو ستوونی باریك دەچنرا یاخود ئاوریشمی چنراو بە زێڕو زیوی رەنگ تۆخ وەك سوورو سەوزو شەرابی پێکدەهات (وێنەی ٧٢). ناوقەد بەهۆی پشتێن یا شاڵی لولدراوی تێرکراو بە خشڵ و بەردی بە نرخ دەبەسترا. چەند شاڵێکی چنراو لولدەدرێت و لایەکانی بە دانتێلاو بە شێوەیەکی زۆر کارامە چنراوەو کراوە بە کڵاوی سەر. دوای ئەوەی کە بازن و تەوقەی قژو سنجاقی جوانی لە سەرپۆش یا کڵاوەکە دەدرا، لەناو کۆشك پێڵاوی دروستکراو لە مەخمەلی چنراو یا قاپ قاپی بن بەرز لە پێدەکرا. دوا بەدوای ئەمانە خۆجوانکردنەکە بە ڕێکخستنی قژو ئارایشتکردنی دەم و چاو تەواو دەبوو. قژ بە چەند هۆنینەوەیەك ڕێکدەخرا، ئەم قژە هۆنراوانەش هەر هەمووی بەهۆی زنجیرەی زێڕو زیوەوە تێکەڵاو دەکران. ئینجا دەم و چاو بە بۆدرەو سوورکردنی رومەتەکان ئارایشدەکرا. چاوەکان کل ڕێژ دەکران و برۆکانیش ڕەش دەکران، هەروەهاناو لەپ و پێیەکانیش بۆ جوانکردنیان لە خەنە دەگیران.

خانم ماری وێرتلی مۆنتگیۆ وەسفی ئەو هەموو هیلاکەتیە دەکات کە تاکەکان بۆ خۆڕازاندنەوە دەیانکردو لە ساڵی ١٧١٨ نووسیویەتی: قەفتانی بە ئاوریشمی کۆپیکراو لە سەرشێوەی وێنەی گوڵ دروستکراو بە زێڕ چنرابوو، لە لەش و لاری دەهات، کە تەنها بە قەمیسێکی تەنکی لەشاش دروستکراو داپۆشرابوو و، فەقیانەکانی رەنگی پەمەیی کاڵ بوو، هێلەگە

بچووکەکەشی ڕەنگی سەوزو زیوی و پێڵاوەکانیشی سپی و زۆر بە جوانی چنرابوون، هەروەها قۆڵە ناسکەکانیشی بە بازنەی ئەڵماس ڕازێنرابوونەوە. ئەم بازنانە ناوەڕاستەکەیان بە ئەڵماس تێرکرابوو. سەرپۆشێکی تورکی ڕەنگ پەمەیی و زیوی لەسەر بوو، قژە ڕەشە درێژە ئاورێشمینەکەی هاتبووە خوارەوە و تەوقەیەکی دروستکراو لە بەردی بە نرخ بەلایەکی سەریەوە کردبوو.

خانمەکانی چینی باڵا لە قاهیرە هەمان شێوە جلوبەرگیان لە بەردەکرد، چونکە بە مۆدێلی عوسمانی زۆر کاریگەر بوون. خانمە ئێرانییەکانی سەدەی ١٩ ئەوان بە زێڕو ئارایشکردنی دەم و چاویان خۆیان دەڕازاندەوە، بەڵام ئەمان لەسەر قەمیسی تەنکی لەشاش دروستکراو هێلەگێکی بچووك و تەسکیان لەبەر دەکرد و تا ناوقەدیان دەهات، جا لەسەر تەنورەیەکی پان و درێژ کە دەگەیشتە سەر پێیەکانیان یا لەسەر شەڕوالی پان و پۆڕ لەبەریاندەکرد. ئەم جل و بەرگانەش لە ئاورێشمی قامیشی دروستکرابوون. سەرپۆشە جوانەکانی سەر کە بە گەوهەر تێرکراون یا لە شاڵێکی سادە لە دەوری دەم و چاو زۆر بە توندی گرێدرابوو، پێکدەهات.

وەك چۆن لە وەسفەکانی خانم شێل دا دەردەکەوێت، کاتێك باس لە جلوبەرگی دایکی شا نەسرەددین دەکات، جلوبەرگێکی تەواو سەرسوڕهێنەرو زۆر سحرێکی بێوێنەی هەبوو.

((دایکی شا زێڕو گەوهەری زۆری بەخۆیەوە کردبوو، ئەو جۆرە شەڕواڵەی لەبەری دابوو بە زێڕ چنرابوو. ئەم شەڕواڵە فارسیانە هەمیشە - وەکو لە پێشتر ئاماژەم پێکرد زۆر پان و پۆڕ بوون، هەر پێیەکی شەڕواڵەکە بۆ کەسێك دەوڵەمەند بێت لە پانی تەنورەیەك پانتربوو، بۆیە شێوەی لە تەنورەیەکی زۆر پان دەچوو، لەبەر ئەوەی تەنورەکانی ژێرەوە ڕوخەکانی تێلی تێدا دانەدەنرا، ئەوا خانمە زۆر پوختەکان دە شەڕواڵ یا یازدە

شەرواڵیان لەبەر دەکرد، هەریەکەو لەسەر ئەویتر بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو داهێنانە گرنگە بکەنەوە کە پێشتر باسکرا. بەڵام با بگەڕێینەوە لای دایکی شا: کۆتایی شەرواڵەکانی لە شریتێکی چنراو لە گەوهەر دروستکراوە (وێنەی وێنەی۷۳)، هەروەها قەمیسێکی شینی لەبەر دابوو کە لە ئاورێشمی ناسکی چینی دروستکرابوو، رۆخەکانی ئەمیشیان بە گەوهەر رازێنرابووەو هێلەگێکی لە مەخمەر دروستکراوی لەسەر قەمیسەکەوە لەبەر دابوو، بەڵام لە پێشەوە دانەخرابوو. سەرپۆشێکی بچووکی بەسەرەوە بوو کە لە خوار چەناگەیەوە بە دەرزیلەیەك قایم کرابوو. لەسەر ئەو سەرپۆشەوە تاڵی گەوهەری گەورەو دەرزیلەی بچووك کە سەرەکانیان ئەڵماس بوو، هاتبوونە خوارەوە و هەردوو دەستەکانی بازنی زۆر جوانیان تێدا بوو، هەروەها ملوانکەی جۆراو جۆرو گرانبەهای لە ملدا بوو))..

ئەم هەموو گرینگیدان و خۆرێکخستنە لە ناو ماڵدابوو نەك لە دەرەوە. هەروەها جلوبەرگی چوونە دەرەوەش بەپێی ناوچەکان دەگۆڕا. ژنانی ئەستەنبوڵ بۆ چوونە دەرەوە چاکەتی درێژو رەنگ تاریکیان لەبەر دەکردو سەرو دەم و چاویان بە دەسماڵ و سەرپۆش یا بە یەشمەك دادەپۆشی. بەڵام ژنانی قاهیرەو ئێران لە سەرەوە تاکو قولە پێیەکانیان بە عەبا داپۆشرابوو و دەم و چاویشیان بە پێچەیەکی درێژو لاکێشەیی پێچرابوو.

لەگەڵ بەردەوامبوونی ئەو جیاکردنەوەیەی کە لە جلوبەرگی بۆنە تایبەتی و گشتیەکاندا دەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەری کولتووری ئەورووپی لایەنی پلاندانانی شارو بیناسازی و جلوبەرگیشی گرتبووەوە (وێنەی ۷٤). شێوازی ئەورووپی وردە وردە دزەیدەکردە ناو حەرەمولکی چینە دەوڵەمەندەکانی ئەستەنبوڵ و قاهیرە، بەشێوەیەك ئارەزوو بۆ جلوبەرگی ئامادەکراو تا جلوبەرگی نەریتی زیاتر بوو، ئەو جلو بەرگانە لە پاریس و ڤیەنناوە بۆ کچی سوڵتان و پاشاکانی رۆژهەڵات دەهێنران. بەڵام ژنانی تر

بـه هاوشـێوەی ئـەو جلوبەرگـە ئەوروپیانـەی لـەلای ئـەو بەرگـدرووە ڕۆژهەڵاتیانەی کە خاوەن پڕۆژەی بازرگـانی بـوون داوایانـدەکرد، ئیکتفایـان دەکرد. بەهەمان شێوە شێوازەکانی جلوبەرگی ئـەوروپی هـەمان کاریگـەری لەسەر جلوبەرگی پیـاوانی دیـوانی پاشـایەتی و خـاوەن وەزیفـە فەرمیـەکان هەبوو. جلوبەرگەکانیان گۆڕانی بەسـەر داهـات و کـڵاو و دەسماڵی نـەریتی سەریان بۆ تاخمێکی تر گـۆڕا، کـە بریتیبـوو لـە چاکەتێکی درێـژ تـا سـەر ئەژنۆو پانتۆڵی تەسك، ئینجا لە چنینی دەسماڵ و کـڵاودا، ئـەوا کڵاوێکـی ڕەشی دروستکراو لە پێستەی مەڕیان لەسەر دەکرد.

بـەڵام دروسـتکردنی چێشـت و پێشکەشـکردنی ژەمـەکان، ئـەوا چالاکییەکی سـەرەکی بـوو و زۆر گرنگـی پێـدەدرا. کولتـووری خـۆراك لـە ڕۆژهەڵات بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەیسەند و بەوە جیادەکرێتەوە کـە شـتی تازەو نوێ لەکاتی خواردن دروستکردندا بەکاردەهێنن و بـە باشـترین شـێوە لێیدەنێن بێ ئەوەی زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی بەهارات و گژوگیا کە تامی خواردن دەگۆڕێت، بکەن. هەروەها بـە جیـاوازی لـە فرەڕەنگـی ژەمـەکان و جۆری خواردنـەکان جیادەکرایـەوە. مەرجـەکانی خـۆراك ببـوو بـە کـارێکی ڕۆژانە و سـادە، بـە جۆرێـك گۆشـتی بـەراز حەرامـە، لەبـەر ئـەوەینایینی ئیسلام وایداناوە و لەبەر تەندروستی تاکیش، خواردنی پەسەندکراو نییە.

خواردنی پێشکەشکراو وەکو چۆن پێشتر بەکاردەهات لە جیـاتی زبـدە، بە زەیتی زەیتون ئامادە دەکرا، چـونکە دوای دروسـتکردنی خواردنەکـە بـە زبدە بۆن و بەرامێکی ناخۆشی لێدەهات. هەروەها لەمەودوا شیریش دەکـرا بە ماستی رائب یا پەنیر. ژەمی خواردن لە چێشتخانەیەك ئامـادەدەکرا کـە دەکەوتە نێوان حەرمولك و سەلاملك، یا ژوورێکی سـەربەخۆی لەحەوش بۆ تەرخاندەکرا کە ئەمەش بە پێی قـەبارەو ڕووبـەری زەوی ماڵـەکان دەگـۆڕا. هەموو ماڵە گەورەکان چێشت لێنەری خۆیان هەبوو و کاری چێشت لێنـانی

لە ئەستۆ دەگرت، ئینجا هەبوو چێشتلێنەرەکە ڕۆژانە کاری دەکرد یا لە بۆنە تایبەتییەکان بە کرێ دەهێنران.

کاتی ژەمەکانی نانخواردن لەگەڵ کاتەکانی نوێژکردن یەك بوو، بۆیە نانی بەیانی یەکسەر دوای نوێژی بەیانی دەخورا، بەڵام ژەمە سەرەکییەکان کە نانخواردنی هەموو ئەندامانی خێزان بوو، ئەوا درەنگ و لە دوای نیوەڕۆ یا دوای نوێژی مەغریب دەخورا. سەبارەت بە پێوەرە ئەورووپییە هاوچەرخەکان، ئەوا ژەمەکان نارەسمی بوون و لە ڕووی شوێن و چۆنییەتی پێشکەشکردنیانەوە شوێنێك یا پانتاییەك بۆ نانخواردن دیارینەکرابوو. هەموو ژوورەکانی ماڵی نەریتی لە میسر وتورکیای عوسمانیدا بۆ نانخواردن بەکاردەهاتن. خواردن لەسەر سینیەکی گەورە دەهێنرایە ژوورەوە، ئینجا لەسەر دەرخۆنە یا شتێك لە شێوەی مێزێکی بچووك و بڵند دادەنراو کەسەکان لەسەر زەویەکەو لە دەوری خواردنەکە کۆدەبوونەوەو نانیان دەخوارد، هەریەکەو دەستەسڕێکی سەرخوانی لە تەنیشتدا بوو (وێنەی٧٥).

لە ئێران خوان لەسەر زەوی رادەخرا. ئینجا خواردنەکە لەناو سینی داپۆشراو دەهێنراو لەناو قاپی کانزایی یا لەسەر پارچە نانی گەورە دادەنران و، بە دەستی ڕاست دەیانخوارد. تەنها ئامرازێك کە بۆ نانخواردن بەکارهاتبێت کەوچك و کەوچکی شلەبوون. بەڵام جۆری خواردنەکان ئەوا بە چاو پۆشی لە پێکهاتەی هەر یەکەیان پێکەوە یا دوا بە دوای یەك و بە خێرایی پێشکەشدەکران. ئەم جۆرەی خواردن پێشکەشکردنە لە هەموو ئاستە کۆمەڵایەتییەکان بەدیدەکرا، تەنها لە دیوانی پاشایی و چینە دەوڵەمەندەکان نەبێت کە بەهۆی جیاوازی لە جۆری قوماشی سەر خوان و دەستە سڕەکان و ئەو ئامرازانەی کە بۆ نانخواردن و پێکهاتەی خواردنەکان بەکاردەهاتن، جیاوازبوون. تەنها لە سەدەی ١٩ بەدواوە کە شێوازی ئەورووپی بۆ نانخواردن و ژەمەکان لە چینە باڵاکانی کۆمەڵگە پەیڕەودەکرا،

ئیتر خواردن لەسەر مێزو لە شوێنی دیاریکراو بۆ نانخواردن و لیستی خواردنی جۆراو جۆر پێشکەشدەکرا.

ژەمە نانی بەیانیان خواردنێکی سووك و سادە بوو و پێش ئەوەی ئەندامانی خێزان هەریەکەو بۆ سەر کاری ڕۆژانەی خۆی بڕوا، نان دەخورا. ئەم ژەمەی خواردن لە نان و پەنیرو ماستی رائب و چا و میوەی وەرزی پێکهاتبوو، هەروەها جاری وا هەبووهێلکەو مرەبای دروستکراوی ماڵەوەشی لەگەڵ دادەنرا.

لە میسر ژەمێك پاقلەی چەور بۆ ژەمی بەیانیان دادەنرا، کە بریتیبوو لە تێکەڵەیەك لە پاقلەی کوڵاو لەگەڵ زەیتی زەیتون و زەردەچۆ.. ئامادەکردنی خواردنی ئێوارە لە دوای نوێژی نیوەڕۆ و دوای ژەمە خواردنێکی سووك بریتیبوو لەو خواردنەی کە پێشتر مابووەوە. ژەمە خواردنی ئێوارەو ئامادەکردنی وەزیفەیەکی زۆر گرنگبوو، چونکە ئەو خواردنە بۆ هەموو ئەندامانی خێزان، خزمەتکارەکان، هەژارو نەدارانی مزگەوتەکان دروستدەکرا. جۆری خواردن سەبارەت بە خێزانە دەوڵەمەندەکان لە گۆشت و شلە یا ماسی و سەوزە پێکهاتبوو. هەروەها جۆری سەرەکی خواردن بریتیبوو لە برنج یا نان و میوەی وەرزی، ئامادەکردنی ئەمانە بەپێی هەرێمەکان دەگۆڕا. شلە هەمیشە لە سەوزەی کوڵاو لەگەڵ ئاوەکەی یا نیسك دروستدەکرا. بەڵام شلە لە ئێران لە میوەی ووشککراوو سرکەی هەنار چاکدەکرا. گۆشتەکەش گۆشتی مەڕو مالآت بوو و هەندێ جاریش گۆشتی ئەو نێچیرانەیان دەخوارد کە ڕاویان دەکردن. هەروەها گۆشتی مریشك و پەلەوەری سوورکراو بۆ ژەمە سەرەکیەکان، کە هەندێ جار گوێزو بادام و کشمیشیان تێدەئاخنی (وەکو قوزی ئەم سەردەمە) ئامادە دەکران.

گۆشتەکە تێکەلاو بە سەوزەی وەك پیاز، گێزەر، سپێناغ، باینجان و گژوگیا دەکرا، ئینجا لەگەڵ زەیت یا زبدە یا ڕۆنی تر دەکوڵێنرا. وەکو چۆن لە

جـۆره خـواردنی (فسـنجون) کـه یەکێکـه لـه خواردنـه خۆشـەکانی ئێـران بەکاردەهات. چێشتی فسنجون لـه مریشـك یـا مـراوی یـا ماسـی حەفش کـه لەسـەر ئـاگرێکی کـز دادەنرێـت و لـەناو شـەربەتی هـەنارو گـوێز نغـرۆ دەکـرا، پێکدێت. بەهەمان شێوه سەوزەواتیش وەك ژەمێکی سەرەکی لێـدەنران، لەوانـه باینجان بە شـێوەی جۆراوجـۆر لێـدەنرا، پیـازو تێکەڵەیـەك لـه بـرنج و گۆشـتی سوورکراوو گژوگیاو میوەی وشـککراوی تێـدەئاخێنرا وەك: پـۆرگی تـورکی کـه بریتیە لە پارچەی پەنیر یا گۆشت یـا سـپێناغ کـه لـەناو پارچـه هـەویرێکی زۆر تـەنکی لـوول دراو لەسـەر شـێوەی سێگۆشـه یـا خـڕ یـانیش چوارگۆشـه دەپێچرایەوە. هەروەها کوکوی ئێرانی ئەمیشیان هەویرێکـه لـه ئـاردو هێلکـەو ڕۆن یا زەیت دروست دەکرێت، ئەسـتوورەو لـه سـەوزەو گیـاو پەتاتـەو باینجـان پڕدەکرێـت. ئینجـا لەگـەڵ ئـەم هـەموو خواردنانـەدا بـرنج وەکـو خـواردنێکی سەرەکی پێشکەش دەکرا، یانیش ئەو برنجە بـه شـێوەیەکی زۆر خـۆش لێـدەنرا، وەك پلاویتورکی کە گێزەرو کشمیش و باینجـان و جـەرگی مریشـك لـه برنجـه پلاوەکـه دەکـرا. چێشـتخانەی ئێرانـی لێنـانی برنجـی پەرەپێـداو لـه هونـەری چێشتلێناندا کردی بە هونەرێکی زۆر جوان، بۆ نمونە زەردەلوو گێلاس، تـوێکڵی پرتەقاڵ، سپێناغ، پاقلەی سەوز یـا مریشـك یـانیش گۆشـتیان ئامـاده دەکـرد، ئینجا برنجەکە لەسەر شێوەی گردۆلکەی ڕەنگاوڕەنگ ڕۆدەکراو بـه زەعفـەران و فستق دەڕازێنرایەوە. هەروەك چەندین خواردنی لاوەکی بەتام لەگـەڵ ئـەم ژەمـه خواردنە سەرەکیانەدا پێشکەشدەکران وەك زەڵاتـەی وەرزی، خـەیاری سـوێرکراو لەگەڵ دۆی رائب و ئەو ترشیاتەی لە ماڵان ئامادەدەکرا. خواردنـەوەکان لـه ئـاو یـا دۆ یـا هـەر خواردنەوەیـەکی میللـی تـر پێکـدەهاتن، وەك شـەربەتی لیمـۆ، پرتەقاڵ، هەنار، ئاوی گوڵ و گێلاس تێکەڵ بە شەکر دەکران و پێشکەشدەکرا.

هەمیشـــه دوای ژەمـــه نانخواردنـــەکان جۆرەهـــا میـــوەی وەرزی پێشکەشدەکران وەك شەمامە، پرتەقاڵ، گێلاس، زەردەلوو ترێ. لە زستاندا

کۆتایی ژەمەکان میوەی هەڵگیراو لەناو شەکراو وەك مرەبای هەنجیر، شووتی وباینجان یا هەر شتێکی تری وشککراو پێشکەشدەکرا. هەرچی قاوەیە، ئەوا تەنها لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا و لەگەڵ شیرینی پێشکەش بە میوانان دەکرا. بەهۆی ئەو کاریگەرییەی کە شێوازی ئەورووپی لەسەر چۆنیەتی پێشکەشکردنی خواردەمەنی دروستیکرد، ئەوا قاوەو شیرینی بوو بە نەریت و لەدوای نانخواردنی ئێوارە پێشکەشدەکرا.

دوای نانخواردنی ئێوارە لە هۆڵی سەرەکی حەرەمولك ئیتر دەستدەکرا بە قسەو باس، کە دیسان خواردنی سووك پێشکەشدەکرا وەك: شیرنەمەنی و میوەی وشککراو کە رەنگە هەندێ جار پیاوان بچوونایەتە سەلامولك بۆ ئەوەی قسەو باس و گفتوگۆ لەسەر ئەو مەسەلانە بکەن کە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، ئینجا لەگەڵ ئەو دانیشتنانە پێشکەش دەکرا.

بە پێی ئەو بەهرەو فێرکردنانەی کە منداڵان لە ماڵەوە فێری دەبوون چالاکییەکی زۆر لە ماڵدا هەبوون، بۆ نمونە خانمان وکچانی تورکی و ئێرانی سەرباری سەرقاڵبوونیان بە چنین، ئەوا شارەزاییەکی زۆر باشیان سەبارەت بە دروستکردنی خواردنی بەتام و خۆش، چۆنیەتی ئامادەکردنی خواردنی سەرەکی، خواردنە نەریتیەکان و خواردنی نوێ هەبوو..

خانم شێل لە نووسینەکانیدا دەڵێت: یەکێك لە شازادەکان کە پیاوەکەی لە پلەی پیاوەکەی مندا بوو و لەگەڵ یەکتر زۆر برادەر بوون. شازادە واراهاتبوو هەموو ئێوارەیەك جۆرەها شتی سوورکراوە بۆ ماڵمان بنێرێت. هەموو جارەکان چەند دەستەواژەیەکی ناسك و جوانیشی لەگەڵ خواردنەکەدا دەنارد، وەك ئەوەی ئەم خواردنە لە دروستکردنی خانم شازادەیە. جاری واش هەبوو بەرخێکی بچووکی سوورکراوەی دەنارد کە بە گوڵ و گوڵزار رازابووەوە، ورگی بەرخەکە بە فستق ئاخێنرابوو، ئەمەش سەبارەت بە ئێمە رووداوێکی زۆر خۆش و ناوازە بوو.

لەو خێزانانەی کە پلەیەکی بەرزی خوێندنیان بەدەست هێنابوو، هەردوو ڕەگەز (نێر ومێ) هەندێ کاتی خۆیان بۆ خوێندن و نووسین و خەتجوانی تەرخاندەکرد.

لە سەدەی ١٦ بەدواوە ناوی ژنان هاتە ناو نووسینی شعری کلاسیکی، تەجریبی و لە کۆپیکردنی کتێبە ئاینییەکاندا کە بە جۆرەها خەت و بە جوانترین شێوە دەیاننووسی، دەستێکی بالاّیان هەبوو. ئینجا پێش ئەوەی ئەندامانی خێزان بخەون، چالاکییەکانی ڕۆژانە لەگەڵ ئەنجامدانی نوێژی عیشا تەواو دەبوون.

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

(١) هاوسەری باڵیۆزی بەریتانی لە ئێران ئۆستن شیل. یەکەم ژن بوو لە بارەی ئێرانەوە نووسیبووی. تێبینیە ووردەکانی خۆی لە ماوەی نێوان مانەوەی لەو ناوچەیە لە نێوان ساڵانی (١٨٤٩– ١٨٥٣) تۆمارکردووە. (وەرگێری عەرەبی).

(٢) خاتوو ماری خوشکی ئەدەبناس ماری وێرتلی مۆنتگیۆ و، کۆنتێسەی هەرێمی مار بوو. (وەرگێری عەرەبی).

(٣) ئاورێشمی تیفانی کە ئاوریشمی فەرەنسی ناسك و نیمچە شەفافە، لە سەدەی ١٧ لە فەرەنسا و بەریتانیا لە دروستکردنی پێچە و دەسماڵی دەمووچاو بەکارهێنانی باو بوو.

(٤) ئامینە فەوات تۆغای (١٨٩٧– ١٨٧٥) کچی باڵیۆزی عوسمانی محەمەد موختار پاشا. وانەی وێنەی لە زیۆرخ و ئەڵمانیا خوێندوە. شوی بە ئەحمەد هۆلۆس تۆغانی کردووە. (وەرگێری عەرەبی).

(٥) واتە قلفەکان. دەستەواژەیەکی تورکیە بەمانای سەرپەرشتیاری خزمەتکارەکان دێت. (وەرگێری عەرەبی).

(٦) دەستەواژەیەکی تورکیە بەمانای گەورەی خزمەتکارەکان. (وەرگێری عەرەبی).

## بەشی پێنجەم: ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵک

نووسەر: بۆ بۆنە ئاینییەکان، نمونەکان لە نێوان نەریتەکانی ڕۆژانەی خێزان و مانگ ژمێری ئیسلامی بوو بوون بە سستمێك و ئاوازێکی نەگۆڕاو کە جێگیری ژیانی ڕۆژانەی خەڵك دیاریدەکەن.

هاوسەری (ئەلکت خدا) لەسەر جێگەکەی کە ٣ پلیکانە لەسەر ڕووی زەوییەوە بەرزەو لەسەر کورسیەکەی کە بە فەرشێکی زۆر جوان داپۆشرابوو، دانیشتوەو شانی داوەتە حاشیەیەکی کە لە ئەتلەسی سپی چنراو دروستکراوە، لای پێیەکانیەوە دوو کچۆڵەی تازە پێگەیشتوو دانیشتوون کە گەورەکەیان تەمەنی هەر دوانزە ساڵان دەبێت، ئەوەندە جوانن وەکو دوو فریشتەن. ئەوانە بە جلوبەرگی زۆر نایاب دەردەکەوتن، کە هەر هەمووی بە گەوهەر داپۆشرابوون. خانمەکە بۆ پێشوازیکردنم هەستایەوە و بە شێوازی خۆیان سڵاوی لێکردم، زۆر بە لوتفەوە دەستی لەسەر دڵی دانا. دواتر فەرمانیدا بە پێشکەشکردنی یەکە بەیەکەی حاشییەکەی و خەریکی ڕێزلێنانی من بوو. لە گۆشەیەك داینیشاندم و جێگەی ڕێزلێگیراوان بوو. پاشان پێی ووتم کە ئەو دوو کچۆڵەیە کچی خۆین، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو زۆر لەوە بچووکتر دەردەکەوت کە دایکی ئەو دوو کچۆڵەیە بێت. دواتر کەنیزە ناسکەکانی ئەو خانمە لە دەوری جێگاکەی ڕیزبوون، کە ژمارەیان خۆی لە (٢٠) کەنیز دەدا.

ئەم کەنیزانە لەسەر ئەژنۆ دەوەستان و لەناو فنجانی بچووك کە بە زیو ڕووپۆشکرابوو، لە باشترین جۆرەکانی فنجانی چینی بوون کە لە یابانەوە هێنرابوون، قاوەیان پێشکەشم دەکرد.

ڕاپۆرتەکەی خانم ماری وێرتلی مۆنتگیۆ لە سەردانەکەی بۆ لای هاوسەری قارەمان سوڵتان ئەحمەدی سێیەم لە ١٧١٧ وەسفێکی زۆر جوان لە بارەیچۆنیەتی میوانداریکردنییەوە دەکات.

بۆنـەکانی پێشـوازیکردن و میوانـداری تاکـەکانی خێـزان بەتایبـەتی ئافرەتـان، وایکربـوو سـنووری چوارچێوە تایبەتیەکـەیان ببـەزێنن. زۆربـەی خانمەکانی چینی باڵا لە سەردەمی عوسـانیەکاندا ڕۆژێکیـان لـە هەفتـە بـۆ پێشوازیکردن لە زۆرێك لە دەستە خوشکەکانیان لە حەرمولك، دیاریدەکرد. ئەم ڕۆژانە هەلێك بوون بۆ نمایشکردنی قوماش و جلو بەرگە نایابـەکانیان و ئاڵوگۆڕکردنی دیـاری چـنراو. لـە دوای سـڵاوکردنە فەرمیـەکان، قـاوەو چـا پێشکەش بە میوانەکان دەکرا. سەرەڕای پێشکەشـکردنی میـوەی شـیرین و شیرینیە سووکەکان کە ناواخنەکەی بە گوێزی ووردکراوو فستقی تێکەڵکراو بە هـەنگوین ئـاخێنرابوون، ئەمـەش بـەپێی چـەند هـەنگاوێکی ڕێکخـراوو دیاریکراو بە درێژایی میوانداریـیەکە پێشکەشدەکرێت. قاوە لـە چێشـتخانە بچووکەکانی پاشکۆی حەرمولك و سەلامولك لە ڕێگـەی چـەند کەسـێکەوە ئامادە دەکرێت. بە جۆرێك ئەم چێشتخانانە بۆ برژاندنی دەنکـە قاوەکـان و پاشـان هـاڕینی ئـەو دەنکانـە بـۆ هارڕاوەیـەکی زۆر وورد مەقاڵـەیان ئامادەکردبوو. قاوە لە شـێوەی تێکەڵەیـەکی چـڕو سـەخت لـەناو دەفرێکـی مس ئامادە دەکرا، کە دەسـکێکی درێـژو شـوێن تێکـەرێکی هـەبوو. دوای ئامادەکردن قاوەکە دەخرایە ناو فنجانەی بچووك، تامی ئەو قاوانە بە پێـی جیاوازی جۆری تۆیەکـەو ڕێـژەی شـەکرو بـەهاراتی بۆنـدار کـە تێکـەڵاویان دەکرد؛ جیاوازییـان هەبوو.

جاری وا هەبوو میوانەکان منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا، ئەمـەش بە ئەنـدازەی فـەرمیبوونی ئـەو سـەردانەی یـا ئـەو شـوێنەی بـۆی دەچـوون دەگۆڕا، ئەم میوانانە لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا دەستیاندەکرد بە کاری چنین و ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵ و بـاس و خواسـتی خـەڵکی تـر. جـاری واهـەبوو لـەو کاتانـەدا دەلاڵـەکان دەهـاتن، ئەمانـە هـەموو ڕۆژەکـانی سـەردانییان لەگەڕەکـەکان دەزانـی و لەگـەڵ دەسـتی خۆیانـدا تۆپـە قومـاش و شـتی

دروستکراویان دەبرد. ئەمانە زۆر دڵنیابوون لەوەی کە دەتوانن لە ڕێگەی ئەم دەڵاڵییەیانەوە قازانجی مادی باش دەکەن. پێش داهێنانی ئامراز و شێوازەکانی گواستنەوە لە سەدەی حەڤدە، هەروەها پێش بەکارهێنانی چوارچەرخە یا چەرخەی لندوییە[٢]، ئەوا زۆربەی کاتەکان میوانەکان شەو لە ماڵی خاوەن ماڵ دەمانەوە.

هیچ کاتێك پێشوازیکردن لە میوانێکی زۆر کێشە نەبووە، جا چ لە حەرمولك بێ یا سەلامولك، بەجۆرێك کە هەموو کەلوپەلە پێویستەکان لە پێخەف و کەلوپەلی حەسانەوە لە کۆگەی تایبەت بە خێزان دەردەهێنران و سەر زەوییان پێ ڕایەخ دەکرد. لە سەلامولکیش ژیانێکی کۆمەڵایەتی تارادەیەك هاوتای ئەو ژیانەبوو کە لە حەرمولك موممارەسە دەکرا، بەڵام پیاوەکان هەردەم هەلی بەیەکگەیشتنیان زیاتر بوو، زۆربەی جار لە چایخانەکان کە لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتدا زۆر باوبوون، دەیانتوانی یەکتر ببینن. لەم شوێنانەدا پیاوان لەگەڵ موزیکژەن و سەماکارو چیرۆك گێڕەوەکان کاتەکانیان دەگوزەراند. لەگەڵ ئەوەی هەردوو ڕەگەزەکە بە شێوەیەکی کردەیی ژیانێکی لە یەك دابڕاوییان بەسەر دەبرد، بەڵام سەبارەت بە ژنان جگە لە ڕێوڕەسمی سەردانیکردنی یەکتری، هەلی تریان بۆ چوونە دەرەوە لەو تەنهاییەو لەنێو حەرەمی ماڵەکانیان و چوونە ناو بازنەیەکی گشتیتر، هەبوو. یەکێك لەو ڕێوڕەسمە مللیانەی ژنان، سەردانی هەفتانەبوو بۆ حەمامە گشتییەکان کە بە درێژایی ساڵ موممارەسەدەکرا. سەبارەت بە خانمانی کۆشك تەنیا ڕێیان پێدەدرا لەو حەمامە تایبەتییانەی کە لە پاڵ ژوورەکانیان دروستکرابوون، خۆیان بشۆن. بەڵام خانمانی ئەو خێزانانەی کە سامانی زۆریان هەبوو ودەیانتوانی حەمامی تایبەت بە خۆیان دروستبکەن، ئەوا حەزیاندەکرد بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆش سەردانی حەمامە گشتییەکان بکەن. لە هەموو شارەکانی ڕۆژهەڵاتدا ژمارەیەکی بەرچاو حەمامی گشتی

هەبوون، کە لە شێوەی باڵەخانەی گەورەو وەقفکراو -واتە بۆ کاری خێر بەکاردەهات- بوونیان هەبوو.. بۆ نمونە حەمامی (بەدیع) کە گومبەزی هەیەو لەلایەن حورەیمەی خێزانی سوڵتان سلێمانی قانوونی فەرمان دەرکرا بە دروستکردنی ئەو حەمامە. لە تەنیشت تەویە قابی سەرای لە سەدەی شانزە وەکو باڵەخانە حەمامی سادە لەهەر گەڕەکێك دروستکرا.

ژنان پێیان وابوو چوونە حەمام گەشتێکەو ڕۆژێك دەخایەنێت، بۆیە کە دەچوون بۆ حەمام هەموو پێداویستییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد وەکو ڕاخەر، خاولی، دەستە سری چنراو، پشتەماڵ، دەسماڵ، تاس حەمام، سابوون، قاپ قاپەی حەمام، ڕۆنی بۆندارو خواردنێکی سووك، هەروەها کەرەستەی چنینیشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد.. لەگەڵ ئەوەی کە لە ماڵەکاندا بۆ هەر ژوورێك جامی ئاوی تایبەت بە خۆی دابین دەکرا، کە بۆ دەستنوێژهەڵگرتنی نوێژی بەیانی و ئێواران بۆ بەجێگەیاندنی بنەماکانی دەستنوێژ پێش نوێژکردن، بەکاردەهاتن. هەروەها بۆ دەست شووشتنی پێش و پاش نانخواردن سوودی لێوەردەگیرا، ئەوا حەمام بۆ حەسانەوە زیاتر لە ڕووی پاکییەوە ئامادە دەکرا. هەموو حەمامێك لە چەندین ژووری لە پاڵ یەك کە پلەی گەرمییەکانیان بەرەو بەرزی دەڕویشت پێکهاتووە، هەروەها ئەم ژوورانە بە ژوورێکی سەرەکی دەگەن کە دەکەوێتە ناوەندەوەو سەکۆیەکی لە ناوەڕاست دایە و زۆر گەرمەو لە دەوریدا حەوزو نافورەی ئاو هەن. ئالێرەدا ئەوانەی حەمامیاندەکرد قژو تووکیان لێدەکرایەوە، دەشێلران، بە سابوون دەشۆران، هەروەها قژەکان خاوو بۆیە دەکران و نوخان و نێو دەست و پێیەکان لە خەنە دەگیران. لە نێوان ئەم هەموو کارانەدا بۆ پشوودان کاتی حەسانەوەش هەبوو، کە تێیدا ژەمێك قاوەو خواردن دەخورانەوەو دەخوران لەگەڵیشیاندا باس و قسەو دروومان دەکرا. بەهەمان شێوە پیاوانیش چێژیان لە حەمامکردن وەردەگرت. لە ڕاستیدا پیاوان

بەشێوەیەکی ڕێك و پێك سەردانی حەمامیان دەکرد، بەڵام بۆ ماوەی کەمتر، واتە کەمتر لەو کاتەی کە ژنان لە حەمام بەسەریان دەبرد. هەروەها حەمامکردنی پیاوان کەمتر بۆ حەسانەوە بوو، بەجۆرێك شووشتنێکی زۆر توندو شێلانێك کە بە سزادان دەچوو و بریتیبوو لە خۆ نووشت کردن و تەقاندنی قۆڵ و باڵ و پشت بۆ نەرم کردنەوەی جومگەکان..

هەر لەگەڵ داهێنانی ئامرازەکانی گواستنەوەو گەیاندنی کاراو ئازاد بوونی ڕێژەیی لە دەست دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکان و ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر بەرنامەی بیناسازیدا هاتن لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی نۆزدە. ئەمانە وایانکرد پیاوان و ژنان کاتی خۆش لەگەڵ ئەو گەشتانەی کە ماندوو بوونی کەمتربوو، بەسەر بەرن. ژنانی چینی باڵاو ناوەند کە جاران شتومەك و پێداویستییەکانیان دەهاتە ماڵەکانیان تا بیکڕن. وایلێهات دەیانتوانی لەژێر عەباو پێچە بچنە دەرەوەو بۆ ماوەیەکی کەم بازاڕییانیا سەردانی ئەو دوکانە نوێیانەیان بکردایە کە مۆرکێکی ڕۆژئاواییان پێوەبوو. بۆ نمونە لە ئەستەنبوڵ خۆشترین کات بەسەر بردن ئەوە بوو کە سەردانی گەڕەکی پیرایان دەکرد، بە شێوەیەك ئەم لاو ئەولای شەقامی گەورەی پیرا (Grand Ruede Pira) دوکان و بازاڕگەی پلەیەك ڕیزبووبوون، کە جلوبەرگی زۆر جوانیان تێدا هەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا گەشتکردن بۆ سەیرانگا سروشتییەکانیش دیسانەوە جێگای خۆشحاڵی خەڵکی ئەم دوو چینە بوو. لە ئەستەنبوڵ ژنانی چینی باڵا بەهۆی چوارچەرخە هاتووچۆیاندەکرد. ئەم چوارچەرخانەش بچووك بوون و بە پارچە قوماشی نەخشێنراو داپۆشرابوون. بەهۆی ئەم چوارچەرخانەوە ژنان بۆ تەماشاکردنی نمایشە گشتیەکان وەك نمایشی سەربازەکانی سوڵتان و تەماشاکردنی ئەو ڕازاندنەوەو ڕووناکییەی کە بە دەوری کۆشك و خانووە گەورەکانی دەوری دەریای بەسفۆر دروستکرابوون، دەچوون. هەروەها چێژوەرگرتن لەو پیاسە دوو کەسیانەی بۆ ناوچە جوانەکانی سەدەی زێڕین

(وێنەی ٧٦) دەکران. بەهەمان شێوە دەرچوونە خێزانییە نافەرمیەکانیش یەکێکبوون لە کاتە خۆشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە ئێران (وێنەی ٧٧). وەکو چۆن دکتۆر (سی جی وێلز) لە کۆتیی سەدەی ١٩ لە ئەسفەهان چێژی لەم دەرچوونانە وەردەگرت.

نەریت وایە بانگکردن بۆ سەیرانێکی نافەرمی، پێشتر خۆی بۆ ئامادە ناکرێت، بۆ نمونە لە کاتی سەردانکردن و دوای قبولکردنی ئەو بانگکردنە، دەستبەجێ جێبەجێ دەکرێت. لەم شێوە سەردانانەدا هەندێ لاکێش لوولدەدرێن و دەخرێنە سەر وڵاخ و سەماوەری (دروستکراوی رووسی) لەناو بەرگێکی لە پێست دروستکراو ئامادەدەکرێت لەگەڵ تاخمی چا، کە لەناو قووتی تایبەت بە خۆی دادەنرێت و چێشت لێنەر لەسەر وڵاخە بچووکەکەی ئامادە دەبێت، لەگەڵ کەرەستەکانی چێشت لێنان، خێرا روو دەکاتە ئەو باخەی کە خێزانەکەی دەستنیشانی کردووە، رەنگە لە کاتی تێپەرینی بەناو بازاردا لە شوێنێکدا بۆ کرینی بەرخێکی بچووك یا هەندێ باڵدار بوەستێت. دواتر خاوەن میواندارییەکەو ژن و منداڵەکانی (ئەگەر پەیوەندی نێوانیان باش بوو) بەرێدەکەون، پیاوەکە لەسەر ئەسپەکەی خۆیی و ژن و منداڵەکان لەسەر کەری رەنگ سپی بە سووکییەك بۆ باخەکە بەرێدەکەون. خزمەتکارەکانیش هەر هەموویان دەم بە پێکەنین، چونکە ئەمانیش وەك ئاسوودەیی خێزانەکە بەدەم گەشتەکەوە دڵیان ئاسوودە دەبێت. ئەم خزمەتکارانە بەپێ یانیش لەسەر پشتی ئەسپ لەگەڵ خاوەن میواندارییەکە دەرۆن بەرێوە. ئەمانە (نەرگەلەکان) و چەترەکان و پێویستییەکان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و لەکاتی گەیشتن بە باخی دەستنیشانکراو، دەستدەکرێت بە میوەخواردن. پاشان میوانەکان و خاوەن میواندارییەکە لەسەر رێگاکان پیاسەدەکەن تا ئەو کاتەی چا ئامادەدەکرێت. ئەو کاتەی چا ئامادەکرا موزیك ژەنێك یانیش گۆرانی بێژێك یانیش چیرۆك خوێنێك دەردەکەوێت و سەرنجی هەمووان بۆ لای خۆی

رادەکێشێت. دەشێ یەکێك لە خزمەتکارەکان دەنگێکی خۆشی هەبێت و گۆرانی بلێت و یانیش شمشاڵی بۆ لێبدات.

هەندێ لەو سەیرانانە دوو مەبەستی لە دواوەیە: ئارەزوویەك بۆ چێژوەرگرتنی کۆمەڵایەتییە و مەبەستێکی تری تێرکردنی لایەنی ئایینییە بەوەی پێویستە سەردانی مەزارە میللیەکان و کەسانی ئایینی بکرێن. بەجۆرێك لە ئەستەنبوڵ هەڵبژاردنەکان زۆر بوون لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە سەردانیان دەکرا، هەر لە مەزاری ئەیوب ئەلئەنساری هەڵگری ئاڵای پێغەمبەر موحەمەد (د. خ) لە لوتکەی سەدەی زێڕینەوە تا دەگاتە مەزارە سادەکانی وەك مەزاری (کللی بابا) لەسەر لوتکەی (روملی کافاجی) کە ئەو دایکانەی ڕاڕابوون و ئەو کچانەی بە دوای مراز ودەسگیرانی گونجاودا دەگەڕان، هاواریان بۆ ئەم مەزارانە دەبرد. هەروەها لە باشووری تاران مەزاری (بەهی) هەبوو هی (شا عەبدولعەزیم) لە ناوچەی (ڕەی). لە کاتێکدا لەناو خودی تاران مەزارگەی بچووك بچووکیش هەبوون.

ئەمەو تێکەڵاویەك لە نێوان داب و نەریتی ڕۆژانەی خێزان و ڕۆژژمێری ئیسلامی بۆ ڕێوڕەسمە ئاینییەکان کرابوو، کە جۆرێك لە ڕێکخستن و هارمۆنیەتی دیاریکراوی لەسەر نەگۆڕی ژیانی ڕۆژانە وەرگرتبوو. ئەم ڕێوڕەسمانە هەلێکبوون بۆ ئەوەی ئەو میوانداری و سەردانییە زۆرەی هەبوون ڕوویەك بن بۆ زیندوکردنەوەی سروتەکان لەناو دامەزراوە مەزنەکان.

ئاهەنگە خێزانییەکان بە نەریتی خۆی بریتیبوون لە کارلێك و تێکەڵاوییەکی نەرم و نیانی نێوان دەوروبەری تایبەتی و گشتی (واتە خێزان لەگەڵ خزم و کەس و کەسانی غەیری ئەوان). ئەم جۆرە ئاهەنگانە بریتیبوون لە چالاکی تایبەت و لە چوارچێوەیەکی سروتی (طقوس) دابوون بۆ پێشخستن و دواخستنی میوانداری. گرنگترین ئەو سروتانە ڕێوڕەسمە نەریتییەکان بوو بۆ تێپەڕین (لە دایکبوون، خەتەنەکردن، زەماوەندکردن و

ڕێوڕەسمی ناشتنی مردوو). سروتی منداڵبوون بوارێکی تایبەتبوو بە ژنانی بنەماڵەکە هەر لە کۆشکی پاشاییەوە بگرە تا دەگاتە ماڵە هەژارەکان. کۆمەڵگەی ڕۆژهەلاتی زۆر ڕێزی لە منداڵان دەگرت، لەگەڵ ئەوەی کە لەم کۆمەڵگەیانەدا منداڵی کوڕیان لەلا باشترو بە بایەختر بوو تا منداڵی کچ، بەڵام بوونی هەر منداڵێك و هاتنی بۆ دونیا بە خۆشبەختییەکی زۆرەوە پێشوازی لێدەکرا. لە چینە باڵاکانی کۆمەڵگەی عوسمانی، منداڵ هەر کە لە دایك دەبوو یەکسەر دەشۆراو لەناو قۆنداغ دەپێچرایەوە، دوای ئەو قۆنداغکردنەش بە قوماشی نەخشێنراوو چنراو دادەپۆشراو دەبرا بۆ لای دایکی،دایکەکەیشی بە هەمان شێوە بە باشترین جلوبەرگ پۆشتەکراوەو لەسەر جێگایەك ڕاکشاوە کە بە باشترین فەرشی ماڵەکە ڕایەخکراوە.

جولیا پاردۆی Julia Paradoe باسی کاریگەری ئەم جۆرە ڕووداوانەمان بۆ دەکات کاتێك وەسفی سەردانەکەی دەکات بۆ لای ژنی قازی بۆرسە ساڵی ١٨٣٨:

لەبەرامبەر دەرگاکەوە ڕاستەوخۆ قەرەوێڵەی خانم دانرابوو و پەردەکانی دەوری لادرابوونەوە و لە شاڵی کشمیری سپێبەرێك لەسەر سەری قەرەوێڵەکە دروستکرابوو، هەر دانەیەك لەو شاڵانە لەسەر شێوەی شریتی و بەهۆی چەندین شاڵی زێرین و زیوینی بەیەکەوە بەستراو، لوولکرابوون. خانمەکە زۆری لەم شاڵانە هەبوو، بەجۆرێك نەدەکرا بەشێوەیەکی گونجاو لە شوێنێکدا و بەم ووردەکارییەوە ڕێکبخرێن. هەروەها شریتێکی حەریری بە لێواری فەزای ژوورەکەدا لەم سەر بۆ ئەو سەر ڕایەڵکرابوو، کە لەم چنراوە بە نرخانەی پێدا هاتبووە خوارەوە و لەلایەکانی ئەو شاڵانە بە سەرپۆشی دروستکراو لە شاشی ڕەنگاوڕەنگ بەسترابوون، ئەمانیش بە گوڵ چنرابوون یا هێڵی زێرین و زیوینیان پیا هاتبوو، کە دەنکە پرتەقاڵ و لیمۆو میوەجاتی پێداهاتبووە خوارەوە. دوو ملپێچی بچووکی دەقکراوی

دروستکراو لە ئەتڵەسی گوڵ ڕەنگ کە بە لباد تێرکرابوو لەلای پێیەکانی قەرەوێڵەکەوە دانرابوون. هەروەها کیسەیەکی دروستکراو لە حەریری هێڵدار کە لایەکانی دەگەیشتنە زەوی و بە چەند ریشاڵێکی زێرینی چڕ کۆتاییان دەهات، هەڵواسرابوو.

شیرەخۆرەکەش لەسەر پێخەفێك دانرابوو کە لە ئەتڵەسی سپی چنراو بە تاڵی ئاورێشمی ڕەنگاوڕەنگ دروستکرابوو و بە چەند ریشاڵێك کۆتایی دەهات وەك ئەو جۆرەیان کە بە کیسەکەوەبوو. خودی شیرەخۆرەکەش بە کۆمەڵێك قوماشی خەتخەتیتێرککراو بە ئەڵماس دەهاتە بەرچاو.

هەر لە سێیەم ڕۆژی منداڵبوونەوە تا حەوتەم ڕۆژ دایکەکە پێشوازی لە میوان و دەسوو دیارییەکانین دەکات. دیارییەکان لە خشڵ، قوماش و شیرینی پێکهاتبوون، ئەمانە هەمووی لەناو شتی چنراو دادەنران. لە ڕۆژی حەوتەمی لە دایکبوون، منداڵ دەخرایە ناو لانك و ئەو ئالووالایەی کە بە قەرەوێڵەی دایکەوە بوو هەمووی لێدەکرایەوە. بەڵام سروتی کۆتاییی لە چلەدا ئەنجامدەدرا، کاتێك دایك و منداڵەکەی دەچن بۆ حەمام وەکو ئاهەنگێکی بچووکی لێدەهات. دەستە خوشك و خزمەتکارەکانی ئاگاداریی خانمیان دەکرد و سەریان دەشوشت و ڕێکیان دەخست. ئەم جۆرە سروتە وەکو لە دایکبوونی منداڵەکانی سوڵتانە، بەڵام بە هەندێ جیاوازییەوە. لێرەدا دایك لەسەر جێگە خۆشەکەی رادەکشێت کە پێکهاتووە لە ئەتڵەسی سوور و نەخشێنراو بە یاقوت و گەوهەر، ئەم گەوهەرانە بەردی بە نرخن و هێمایەکن بۆ بنەماڵەی عوسمانی. هەروەها سروتەکانی بنەماڵەی عوسمانی تەواو تایبەتیش نەبوون، کاتێك بنەماڵەکە ناچار دەبوو پێشوازی و میوانداری عەوام بکات بۆ نانخواردن و چوونە دەرەوە.

منداڵی پاشا سێ لانکی پێشکەشدەکرا، یەکەمیان لەلایەن خەزێنەی پاشاوە بوو و دوانەکەی تر لەلایەن دایکی سوڵتان و وەزیری باڵادەستەوە

بوو. ئەم دوو لانکەی کۆتایی لەگەڵ دیاری و زێڕو گەوهەروو شاڵەکانیان لەسەر ئەو ڕێگایەی لە بازاڕەوە دەهات و بە قەراخ مزگەوتی (تایە سۆفیا) بە دەوری پەرژینی (تەوبەقابی سەرای) نمایشدەکرا و دەبرا بۆ حەرمولك.

بەڵام خەتەنەکردنی کوڕی موسوڵمانان نیشانەیەك بوو بۆ چوونە ناو ژیانی پیاوانەوە. هەندێ جار منداڵە کوڕەکان لە چلەدا لە ئاهەنگی حەمامکردنی دایکەکە خەتەنە دەکران. نەریت وابوو کە ئەم ڕێوڕەسمە زۆر گرنگ بووو زۆربەی کوڕان لەتەمەنی حەوتساڵیدا خەتەنەدەکران. بۆ ئامادەکردنی منداڵ بۆ ئەم پرۆسەیە، ئەوا جلوبەرگی تایبەتییان لەبەر دەکراو بە گەڕەکدا دەیانگەڕاندن (وێنەی٧٨).

لەم بارەیەوە ئێدوارد لین تێبینییەکانی خۆی لە قاهیرە تۆمارکردووەو نووسیویەتی: ئەسپێك بە کرێ دەهێنرێت و بەکورتەیەکی جوان داپۆشراوە و گوریسەکەی بە کوڕەکە دەگەیەنرێت و دەستەسڕێکی چنراوی نوشتراو بە دەستیەوە دەگرێت، منداڵەکە بۆ شاردنەوەی بەشێك لە رووی، بەردەوام بە دەستی ڕاستییەوە لەسەر دەمی دایدەنێت، بەمەش خۆی لە چاوی حەسوود بەدوور دەگرێت. خزمەتکارێك و سەرتاشێك پێشی دەکەون، سەرتاشەکە ئەوەیە کە خەتەنەیدەکات، سێ موزیکژەنیش کە ئامرازەکانیان بەزۆری لە دووزەلەو تەپڵ پێکهاتووە، هاوەڵییان دەکەن.

دوای خەتەنەکردن کوڕە لەسەر جێگایەکی جوان کە قوماشی نایابی پێوە هەڵواسراوە رادەکشێت و تەواو وەك ئەوەی دایکی لە کاتی لەدایکبوونی منداڵەکەدا ئەنجامیدەدا، ئاواش کوڕە پێشوازی لەو کەسانە دەکات کە دیاری بۆ دەهێنن. ڕێوڕەسمی خەتەنەکردن بۆ خێزانی کوڕە سەرچاوەی سەربەرزی و فەخربوو. خەتەنەکردنی کوڕی سوڵتان ئاهەنگێکی گشتیبوو و کۆمەڵێك خەڵك لە دارو دەستەی کۆشکی پاشایەتی و بازرگانان کۆدەکرانەوەو بەناو شەقامەکانی ئەستەنبوڵدا دەگەڕان و دەیانکرد بە هەراو

بەزم، خەڵكیش بە ڕۆڵی خۆیـان بـە چنراوە دەسـتییەكانیان شـەقامەكانیان دەڕازانـدەوەو بــە ڕیزێكــی ڕێــك و پێكــەوە بــە دەروازەی ماڵەكانیانــدا هەڵیاندەواسی (وێنەی ٧٩).

بەڵام هاوسەرگرتن وەكـو گرێبەسـتێك لـە نێـوان دوو خێـزان دەبەسـترا، نـەریت وابـوو خواسـتن لێپرسـینەوەو قسـەو باسـی چـڕوپڕی لەسـەر دەكـرا، لەكاتێكدا كە كوڕەو كچە ڕۆڵێكـی زۆر بچـووكیان لـە بڕیاردانـدا پێـدەدرا. بێگومان ئـەم دووانـە تـا ڕۆژی كۆتـایی زەماوەندەكـە یـەكتریان نـەدەبینی. ژنهێنانی كوڕان شتێكی مسۆگەر بوو، چونكە ئایینی ئیسلام هانی كـوڕانی نەدەدا كە بە سەڵتی بمێننەوە.

دایكان لە هـەموو چـینەكانی كۆمەڵگـە بـە بـەردەوامی ووردی خـزم و ڕەفیق و دەستە خوشكەكانیان دەبوونەوە و ئەگەری هەڵبـژاردنی یـەكێك لـە كوڕەكانیان دەكرد بۆ كچەكانیان، ئەمەش لەڕێگەیپێشوازی، میوانـداری و بەردەوام چوونە حەمامـەوەبوو. لە حەمامەكاندا كچە جوانەكان دەخرانە ڕوو لەبەرامبەر ئـەو ژنانـەی كـە بـۆ سـەیركردنی كچـان دەهـاتن، دواتـر لـەلای بنەماڵەی كوڕەكە وەسفی ئەو كچانە دەكرا. دوای ئەوەی هەردوو خێزانەكـە ڕێكدەكەوتن، دەستدەكرا بە ئامادەباشی بـۆ پێداویسـتییەكانی مـارەكردنی فـەرمی. لـە كـاتی مارەكردنـدا گفتوگـۆ لەسـەر جهـازی بـووك و شـیربایی دەكرا،ئەمەش لە ئیسلامدا بەشداریكردن و ئەركێكە لەسەر زاوا. لە پاشان زاوا لەسەر بڕێك پارە ڕازی دەبێت و ئەو پارەیـە دەكرێـت بـە دوو بەشـەوە، بەشـێكیان بـۆ پێداویسـتییەكانی زەماوەنـدو مـاڵی تـازە خـەرج دەكـرا، بەشەكەی تریش دەدرا بە بووكێ كـە ئەمـەش مـافی ڕەوای خـۆی بـووو بـە ئارەزووی خۆی خەرجی دەكرد. بەڵام ئەگەر حاڵەتی تەڵاق ڕوویبدایـە، ئـەوا وەكـو نەفەقـە دەدرا بـە ژنەكـە. لـە كۆتـایی مارەكردنەكـەدا گرێبەسـتەكە مۆردەكراو و بووك و زاوا دیارییان ئاڵوگۆڕ دەكرد. دیاری زاوا بریتیبـوو لـە

قوماشێك بۆ جلی بوكێنی، تاخمێك لـە زێڕ وگەوهـەر، ئاوێنەیـەك، جـامی حەمام و قاپقاپەی حەمام. نەریت وابو كە راستەوخۆ دوای مارەكردن بـووك گواستنەوە ئەنجامبدرێت، لەگەڵ ئەوەی هەندێك جار گواستنەوە لەبەر چەند هۆكارێك دوادەخرا، بۆ نمونە بچووكی تەمەنی كوڕو كچەكە.

ئاهەنگەكانی ژنهێنان هەفتەیەكی دەخایاند كە تێیدا خـوانی نـانخواردن و ئاهـەنگێڕان لـە هەریـەك لـە سـەلاملوك و حـەرمولك درێـژەی دەكێشـا (وێنەی ٨٠). ئەم نەریتانە لە بنەماڵە دەوڵەمەندەكانیشـدا بوونیـان هـەبوو (وێنەی ٨١). ئەم سرووتانە بۆ ماوەیەكی دورو درێژ لـە رۆژهـەلأت پـەیڕەو دەكرا و بە چاوێكی پیرۆزەوە تەماشادەكران. گومانی تێدانیە ئـەم سـروتانە سـەبارەت بـە بنەماڵـەی عوسمـانی رێـزی زیـاتری لێـدەگیرا وبـە فـراوانتر گوزارشـتی لێـدەكرا. پرۆگرامـی زەماوەندەكـە لـە دووشـەممەوەو بـە هـاتنی جهازی بوكێ دەستی پێدەكرد، كە بەشەقامەكاندا دەسوڕایەوە تا دەگەیشتە مـاڵی زاوا. ئـالێرەدا بەرهـەمی كـارە دەسـتییەكانی ئـەو سـاڵانەی بووكـێ دروسـتی كـردوون، دەخرانـەڕوو كـە بریتیبـوون لـە شـتی دووراو، چـنرا، نەخشاندنی سەرچەف، سـەرین، دەسمـاڵ، پەشـتەماڵ (پارچـەیەك قوماشـی جـوان بـوو كـە ژنـان لـە حـەمام بەكاریانـدەهێنا، ئـەم پارچـە قوماشـە لەناوقەدیان تاسەر چۆكیانی دادەپۆشی، و. كوردی)، پەردەی قەرەوێڵە، جل وبەرگەكان. ئەم شتانە لەسەر دەستگێڕێكی دانەپۆشراو دادەنران بـۆ ئـەوەی خەڵكی بیانبینن. دەتوانرێ نمونەی جوانی ونمایشی ئەو شـت و مەكانـە لـەو وەسفەی جولییا پاردۆی بۆ جلك هەڵگرتنی (مهریاە) كچی سـوڵتان محمـدی دووەم لە سیەكانی سەدەی ١٩ كردوویەتی تێبینی بكرێت.

بەڵام جوانترین نمایش ئەوەبوو كە لەخوارەوەباسـی دەكـەم. دەسـتە سـرە چـنراوەكان بەتاڵـە دەزووی زێـڕین وزیـوینی تێكـەڵكراو بـە ئاورێشـمە رەنگاوڕەنگەكان كە ڕووی چنراوەكە زۆر نـەرم و ناسـكبوو دووراببـوون، وەك

قوماشی سوخمەی مەخمەلی رازێنراوە بە زێڕو خشڵ لەسەر گەردەنو سنگ، هەروەها شەرواڵی جوان کە بە ئەستێرەی زێڕین و زیوی نەخشێنرابوون. جل وبەرگی ژێرەوە لە ئاورێشمی سپی کە زێڕو خشڵی پیاهاتۆتە خوارەوە، دروستکرابوون. ئێلەگی ئەتلەسی نەخشێنراو بە گەوهەری زۆر بچووك و قاپقاپەیەکی بچووك وەك ئەوەی (ساندرێلا) لەپێی دەکرد بە ریشاڵی ئاورێشمی چنراو بە یاقوت، رازێنراونەتەوە. هەروەها شازدە کۆڵ هەڵگر چەند قەفەسێکی دروستکراو لە ڕایەڵەی زیوی کە چەند شاڵێکی مەخمەلی سووری لەسەرە زێڕو خشڵی بووکێی لەسەر نمایشکرابوو. ئەم شتانە کە بە بەردەمئێمەدا دەهاتن لەژێر تیشکی هەتاودا زیاتر دەدرەوشانەوە، وایلێهاتبوو هەندێ جار لەبەر درەوشانەوە و بریسکەی شتەکان ئەستەمبوو تەماشایان بکرێت.

خزم وکەس وکارو رەفیقانی بووکێ ژوورەکە بە قوماشی ئالآووالآ رووپۆشدەکەن. ئەو رۆژانەی ئاهەنگەکەش کە ماون بۆ رازاندنەوەی بووك تەرخاندەکرێت. سێ شەممە بووك دەشێلرێت و لەشی نەرمدەکرێتەوەو بۆنرێژدەکرێت. چوارشەممە پێشوازی لەخزم و کەس و کاری خێزانی زاوادەکات. ئامادەباشی و رێکخستنی زەماوەندەکە لە ئێوارەی رۆژی چوارشەممە و سپێدەی پێنج شەممە دەگاتە کۆتاییەکەی و بووك ئامادە دەکرێت و بەشێوەیەکی تەواو کۆتایی بەرێکخستنی دێت. بەڵام شەوی خەنەبەندان، کە چوارشەممە ئەنجام دەدرێت نەریتێکی رۆژهەڵاتییەو پێش ئیسلام لەم شوێنەدا وەکو نەریت پەیرەوی لێ کراوە، ئەمە نیشانەیەکە سەبارەت بەوەی بووك ماڵئاوایی لە تەمەنی منداڵی خۆی دەکات. ئەم ئاهەنگە زۆرخۆشە، ئینجا گەر خێزانەکە دەوڵەمەند بێت، سەماکارو موزیکژەن بەشداریتێدا دەکەن (وێنەی۸۲). خەسوی بوك دەستووپێی بوکێ بە خەنەی گیراوە دەنەخشێنێت. لەهەمان کاتدا زاوا لەگەڵ رەفیق و خزم

وکەسیدا سەرگەرمی ئاهەنگی خۆیان دەبن. سەر لەبەیانی پێنج شەممە و دوای ئەوەی خەنەکە ووشك بوو و دەستوپێکان شۆران، شوێنەکەی بە ڕەنگی سووری مەیلەو پرتەقاڵی دەردەکەوێت. ئینجا بووکبەجلی بووکێنی دەڕازێنرێتەوەووەکو دیارییەك بۆ زاوا دەنێردرێت. لەتورکیا نەریت وابوو جل وبەرگی بوك لە مەخمەلی سوور یا ڕەنگێکی تێری تۆخ دروستدەکرا، زێڕو زیوو گوڵی گەورەی بەشێوەیەکی چڕوپڕ لەسەر دەچنرا (وێنەی٨٣). بەڵام لەسەدە نوێییەکاندا ئاورێشمی ڕەنگ کاڵ بۆنموونە ڕەنگی سەدەفی،پەمەیی کاڵ و بنەوشەیی کاڵ بەکاردەهات، زێڕ و زیویش بوکێیی جوانترو رازاوەتر دەکرد. زێڕەکان وەکو تاڵە دەزووی باریك بەسەر قژیدا دەهاتنە خوارەوە و بۆدرەی سپی بریسکەدار دەموچاوی سپی دادەپۆشی و ڕوومەتەکانی بەڕەنگی سوور بۆیە دەکران. ئینجا خێزانی زاوا هاوەڵیی بووکیان دەکرد و بوکێ عەبایەکی سوور دراوە بەسەر شانیدا و بۆ ژووره ڕازاوەکەی لەماڵە نوێکەیدا ڕێی پیشاندەدرێت. بووك نیشانی میوانە ژنەکان دەدرێت. ئیتر ئەو ئێوارەیە بە بەزمو ئاهەنگ لە هەریەك لە سەلاملك و حەرملك بەڕێدەکرێت. ئینجا ڕۆژی هەینی ڕۆژی کۆتایی زەماوەندەکەیە و بووك و زاوا لەبەردەم خێزان دەردەکەون و خوانێکی گەورە ئامادە دەکرێت، کە پێکدێت لە دەورییەکی گەورەی برنجیبووکێنی رەنگدار بەڕەنگی زەعفەران و شلەی گۆشت و چەندین شیرنەمەنی و میوەجات.

بەڵام مردوناشتن (وێنەی ٨٤) سروتی بە ڕێکردنی کۆتاییە، بەشێوەیەکی ڕێژەی ڕێورەسمێکی سادەبوو و لەگەڵ ڕۆژئاوابووندا، ڕۆژی تازییەکەش دەست پێدەکات. تەرمی کەسە مردووەکە دەبرێت بۆ گۆڕستان. لەسەر تەرمەکە کڵاو یا جامانەی پیاوەکە یا سەرپۆشی ژنەکە دادەنرێت. لە هەریەك لە ئەستەنبوڵ و بۆڕسە ژووری گۆڕستانی بنەماڵەی پاشای عوسمانی بەردی تاشراو لەسەر گۆڕەکان دادەنرا، کە زۆر بە بەهرەمەندی تاشراون و

پاشـــان بەقوماشیچـــنراو نەخشـــێنراون و دەســـتەواژەی ئـــایینی (ئایـــەتی قورئانی) لەسەر دەنوسرا. تەرمەکە دادەپۆشرێت، جاری واش هەیە بەشتێك لە جلوبەرگی مردووەکە دادەپۆشرێت. ئەمەو سوننەتیئیسلامی بە پێیڕۆژ ژمێری مانگی دەڕوات کە (١٢ مانگ )ە و پشت بە وەرزەکان نابەستێت.
ئـەم دوانـزە مانگـە چـەند بۆنەیـەکی تێدایـە، هەنـدێك لـەو بۆنانـە بۆنـەی ئاهەنگ گێـڕان و خـوان ئامـادەکردنن، هەنـدێکی تریـان بۆنـەی ڕۆژەکـانی تەعزیە، هەندێکی تریشیان ئاوا بەبێ گوێپێـدان بەڕێـدەکرێن. ڕۆژی سـەری سالْ –کۆچی- ڕۆژی یەکەمە لە مانگی یەکەم، ئەمە ڕۆژێکی دیارو بەرچاو نەبوو، تێیدا تـەنها پیرۆزبـایی و خۆزگـەی بـاش دووبـارە دەکرایـەوە. واتـە ئەوەندە گرنگ نەبوو. ئەم ڕێزگرتنە سادەیە لە سـەری سـالْ دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەوەی کە ڕۆژی سەری سالْ ڕاستەوخۆ دەکەوتـە دوای تازیـەو یادکردنـەوەی دەیەمین ڕۆژی شـەهیدبوونی (ئیمام حوسێن) لە شەڕ. ئەم ئیمامـە کچـەزای پێغەمبـەر موحەمـەد (د. خ) بـوو. ئـەم یـادکردن و تازیەیـە دەگەیشـتە ئەوپەڕی کاتێك خەڵکەکە لە کۆبوونەوەیـەکی گـەورەدا لـە ڕۆژی دەیـەم یـا عاشورا یادیان دەکردەوە.
یادکردنـەوەی ئـەم ڕووداوانـە بەشـێوەیەکی تایبـەتی لەلایـەن ئیسـلامە شیعەکانی ئێرانـەوە زینـدوو دەکرێتـەوە. ئـەم ڕێوڕەسمانـە شـانۆگەری درامـایی سنووورداری لەسەر ژیانی شەهید ئیمام حوسێن نمـایش دەکـرد. بـۆ ئـەم بۆنەیـە خـواردنێکی تایبـەتی ئامـادەدەکرا، کـە پێکهـاتبوو لـە خـواردنێکی میللـی دروستکراو لە برنج یا گەنم یا دانەوێڵە (گەنمە گوتـاو لەسـەر شـێوەی هەلیسـە) کـە لەگەڵیـدا میـوەی ووشـکراوو شـیرینی و هـەنگوین و شـەکر تێکـەڵاو دەکرا،لەسەر شێوەی شیرنەمەنییەکی زۆر بەتام پێشکەش بە خەڵکەکە دەکرا.
ئێرانیەکان ئاهـەنگێکیان دەگێـڕا بـەهۆی سـاڵی نـوێی دووەم، ئـەویش ئاهەنگ گێرانێکی دێرینە بە بۆنەی نەورۆزەوە، واتە ڕۆژێکی نوێ. ئەم بۆنە

خۆشه له ٢١ ی ٣ دەست پێدەكات و پشت بە ڕۆژ ژمێری ئیسلامیەوە نابەستێت. یادكردنەوەی ئەم بۆنەیە سەبارەت بە خێزانە دەوڵەمەندەكان، لەسەر شێوەی گۆڕینەوەی دیاری بە نرخی وەك جلوبەرگی نوێ گوزارشتی لێدەكرا. له ساڵی ١٨٥٠(نادرەدین شا) هەندێك لە داهاتەكانی بەسەر خەڵكی شانشینەكەیدا بەخشیەوە، ئەم دیارییە بۆ تاكەكانی چینی باڵا شاڵی كشمیری و بۆ چینی خوارەوە پاڵتۆی دروستكراو لە قوماشی ئاسایی و قوماشی (موسلی) بریسكەدار پێكهاتبوو. لە ڕۆژی نەورۆزدا خێزانەكان لە ژەمێكدا كە هەموو جارێك بریتییە لە تەڕەو میوەجات، كۆدەبنەوە. دوای ٢١ی مارس هەفتەیەك پشوو دەست پێدەكات و كات بۆ سەردانكردنی خزم و كەس و كارو ڕەفیق و گەڕان و گەشتكردن دەڕەخسێنێت.

بۆنەیەكی تر لە سونەتی ئیسلامدا هەیە، ئەویش بۆنەیەكی خۆشە، یادكردنەوەی لەدایكبوونی پێغەمبەر موحەمەد (د. خ) لە ڕۆژی ٢٧ی مانگی سێ. لەم ڕۆژەدا بۆ زیندوكردنەوەی ئەم یادە لە هەموو مزگەوتەكاندا ئاهەنگ دەگێڕدرێت و تێیدا شیعر لەسەر ژیانی پێغەمبەر دەخوێنرێتەوە و لەلایەن پاڵەوانە نمایشكارەكانەوە ئاهەنگەكە ڕازاوەتر دەبێت. لە توركیا خێزانە دەوڵەمەندەكان ماڵ و باخچەكانیان بە چراو فانۆس دەڕازاندەوە و لەناو پێچراوی دروستكراو لە ئاورێشمی ئەتڵەسی چنراو شیرینیان دەبەخشیەوە. ئەو ساڵە بە یادكردنەوەی بۆنە پیرۆزەكان دەڕوات، وەك ئاهەنگ گێرانی ساڵانە بە بۆنەی موعجزە گەشتەكەی پێغەمبەر بۆ ئاسمان (شەوی ئیسراو معراج) و شەوی قەدر، كە ئەو شەوەیە تێیدا قەدەری ئادەمیزاد دارێژراو خوای گەورە لە هەموو گوناهەكان خۆشبوو.

بەڵام گرنگترین مانگ مانگی ڕەمەزانە (مانگی نۆ). تێیدا لەسەر هەموو موسڵمانان پێویستە لەپێش ڕۆژهەڵاتن تا ڕۆژئاوابوون بە ڕۆژوو بن. هەروەها ئەم مانگە هەلێك بوو بۆ پشوودان و خۆشگوزەرانی. هەموو

شارەکان لە شەودا سەرقاڵی چالاکییەکانیان دەبوون. مزگەوتەکان ڕۆشن دەکرانەوەو بە درێژایی شەو خەڵکی لە شەقامەکان کۆدەبنەوەو سەردانی خزم و برادەران و بازاڕ دەکەن. هەرچی ژەمی ڕۆژو شکاندنە لەکاتی ڕۆژئاوابوون ئەوا بۆ خێزانە دەوڵەمەندەکان وەك بۆنەیەك بوو تا پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان بەهۆی پێشوازیکردن لە میوانان بەهێزتر بکات. ئەم نەریتە تا کۆتایی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو، وەك چۆن ئامینە فەوات تۆگای لەبارەی خێزانەکەیەوە دەیگێڕێتەوە:

لە ماڵەکەماندا ئیمامێك و بانگ خۆێنێك بە درێژایی مانگی ڕەمەزان میوانداریيان دەکردین، بانگ خۆێنەکە لەسەر ئەو پێپیلکەیەی بۆ باخچەکەمان دەچوو، لەگەڵ تۆپ تەقاندنەکە کە نیشانەی خۆر ئاوابوون بوو، بانگی ڕۆژئاوابوونی دەدا. بە زەیتون و نان ڕۆژو دەشکێنرا، ئەمە پێش نوێژی مەغریب، دوای نوێژ هەموو خێزانەکەو میوان و بێگانەکان کە لە ماڵدابوون بۆ نانخواردن دادەنیشتن، کە دوای ڕۆژێك لە ڕۆژوگرتن ئەمە یەکەم ژەمە دەخورا. لە سەلاموڵك خواردن پێشکەشی پیاوان دەکرا، هیچ جیاوازییەك نەبوو ئەگەر ئەوانە لە ناسیاوی باوکم بوونایە یان نە. باوکم لەگەڵ میوانەکانی ژەمە نانە کەی دەخوارد، بەڵام خواردنەکە هەمان خواردن بوو کە پێشکەش بە هەمووان دەکرا. لەگەڵ ئەوەی ژنی بێگانە لەکاتی ڕۆژو شکاندن نەدەهاتن، کەچی هەردەم خوانێك بۆ (میوانەکانی خوا) ئامادەکرابوو. ئەو خواردنە تایبەتییانەی کە لە ژەمی ڕۆژو شکاندندا ئامادەدەکران بریتیبوون لە پارچە نان کە لە پیتزا دەچوو، هەویرکاری نەرم و ناسك و (کۆلاش) کە لە هاڕراوەی برنج دروست دەکرێت. مانگی ڕەمەزان بەم جۆرە دەڕوات، تا دەگاتە شەوی قەدر لە ڕۆژی ٢٧ی ڕەمەزان کە تێیدا قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەر (د. خ) هاتۆتە خوارەوە. لەم شەوەدا خێزانەکان هەمووی دەچن بۆ مزگەوت و بەشداری لە گوێگرتن و تەواوکردنی (خەتمی)

قورئاندا دەکەن. پاش ئەوەی ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان کۆتایی دێت، سێ ڕۆژی دواتر کەوەك بۆنەیەك بۆ نوێ بوونەوە دانراوە بە (جەژنی ڕەمەزان) ناودەبرێت. لەم ڕۆژەدا جلوبەرگی نوێ لەبەر دەکرێت و دیاری لە نێوان خێزان و برادەران و هەژاران دەگۆڕدرێتەوەو بازنەیەکی بەردەوام بۆ سەردانکردنی ناسیاوو خزم و کەس و برادەران هەیە.

ئینجا لەگەڵ گرنگترین ڕووداوی ئایینی سوننەتی ئیسلامی کۆتایی دێت، ئەویش جەژنی قوربانە یا (کوریاکس پیرمی) جەژنی خۆشبەختی، کاتێك ڕەشەوڵاخ و مەڕ دەکرێنە قوربانی، ئەمەش لە ڕۆژی دەیەمی مانگ بۆ ڕێزگرتن لە یادکردنەوەی پێغەمبەر ئیبراهیم (خوا لێی ڕازی بێت) ئەنجام دەدرێت. کاتێك مەڕێك لەبری کوڕەکەی ئیسحاق دەکاتە قوربانی -لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە ئەو قوربانییە لە بری ئیسماعیلە نەك ئیسحاق. و:کوردی- وەکو لە ئینجیل باسکراوە. هەروەها یادکردنەوەی ئەو قوربانییە دەکەوێتە ڕۆژەکانی حەجکردن بۆ مەککە. حەجکردن لەسەر موسڵمانان ئەرکێکی پیرۆزە ئەگەر بۆیان بکرێت. هەرچی ئەندامانی خێزانی کەسی حەجکردووە، ئەوا بە بۆنەی حەجکارانەوە ئاهەنگ دەگێڕن، دواتر کە دەگەڕێنەوە زۆر بە خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێدەکەن..

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم

(1) ئەلکتخدا. دەستەواژەیەکی فارسیە بەمانای پاڵەوان یان قارەمان. (وەرگێری عەرەبی).

(2) چوار چەرخەیەکی سەرگیراوەو سەرداپۆشەرەکەی بۆ دوو بەش دابەشکراوە، بە جۆرێك دەتوانرێت لوولدرێت یان لابیرێت. (وەرگێری عەرەبی).

(3) جۆلیا باردۆی (1806– 1862) نووسەرێکی ئینگلیزە. یەکەم دیوانی شیعری لە تەمەنی 14 ساڵیدا نووسیوە. گەشتی بۆ فەلەستین لە 1835 کردووە و، چەند کارێکی لە بارەی ئەزموونەکانی خۆی لەوێ بڵاوکردۆتەوە. (وەرگێری عەرەبی).

(4) بە پێی داستانەکانی جوولەکە و مەسیحیەکان. (وەرگێری عەرەبی).

## ببلۆگرافیا


- Quotations have been taken from the following books: CHANNELLS, E .Recollections of an Egyptian princess by her English Governess .Edinburgh and London; William Blackwood and Sons, 1883.
- GOLDSMID, Sir JF.Telegraph and Travel. London; Macmillan, 1874.
- JAMI. Yusuf and Zulaikha.Transgated by RTH Griffith .London; Trubners Oriental Series, 1882.
- LANE, EW.Manners and customs of the modern Egyptians .London; Everymans Library edition, 1908.
- MELEK HANIM (MALIK_KHANAM).Thirty years in the harem .London; Chapman and Hall, 1872.
- PARDOE, J. The City of the Sultans and Domestic Manners of the Turks in 1836. London, 1837.
- SHEIL ,LADY M. Glimpses of Life and manners in
- SYKES, E, Persia and Its people. London; Methuen and Co. Ltd, 1910.
- WILLS, CJ. In the Land of the Lion and Sun. London; Macmillan, 1891.
- WORTLEY MONTAGU, LADY MARY .The Turkish Embassy Letters. Edited by Malcolm Jack. London; Virago press Linuited, 1994.
- Further Reading

- ADLE, C and HOURCADE, B(Ed). Teheran Capitale Bicentenairc.paris; Institut Francais de Recherche en Iran, 1992.
- ATIL, E(Ed). Turkish Art .Washington DC; Smithsonian Institution press, 1980.
- ATIL, E, NEWTON, C and SEARIGHT, S. Voyagcs and visions, nineteenth-Century Images of thc Middle East from the Victoria and Albert Museum. Seattle and Washington DC; University of Washington press, 1995.
- BLUNT, W.Isfahan pearl of Persia. London; Elck Books, 1966.
- CHARDIN, SIR JOHN.Travels in Persia. Editcd by N panzer.London; The Argonaut press, 1927.
- DAVIES, F.Thc Ottoman Lady, aSocial History From 1718 to1918. Westport, Connecticut; Greenwood press, 1986
- FERIER, R(Ed).The Arts of Pcrsia .New Haven; Yale University press, 1989.
- HELLIER, C. Splendours of the Bosphorus, Houses and Palaces of Istanbul.
- London; Tauris parke Books, 1993.
- KELLY, L.Istanbul. A Travellers Companion. London; Constablc, 1987.
- LEWIS, R.Everyday Life in Ottoman Turkey.London; Batsford, 1971.
- MANSEL, P.Sultans in Splendour, the Last years of the Ottoman World .London; Andre Deutsch Limited, 1988.

- MANSEL, P.Constantinople, City of the Worlds Desire, 1453_1924.London; John Murray, 1995.
- MOURAD, K (and others).Living in Istanbul. Pans and New York; Flammanion, 1994.
- NECIPOGLU, G.Architecture, Ceremonial and power, the Topkapi palace in the fifteenth and sixteenth centuries. Cambridge, Massachusetts and London; MIT Press, 1991.
- PICK, C. Egypt, aTravellers Anthology .London; John Murray, 1991.
- RODEN, C.A new Book of Middle Eastern Food. London; Viking, 1985.
- SCARCE, J.M.Womens Costume of the Near and Middle East. London; Unwin Hyman, 1987.
- SEAPLIGHT, S.The British in the Middle East. London; East_West publications, 1979.
- WELCH, A.Shah Abbas and the Arts of Isfahan. New York; the Asia Society Inc, 1973.
- WILBER, DN.Persian Gardens and Garden pavilions. Vermont and Tokyo; Charles E Tuttle, 1962.
- WULFF, H E.The Traditional Crafts of Persia. London; MIT PRESS, 1966.
- ZUBAIDA,S and TAPPER,R(eds). Culinary Culture of the Middle East.
- London;I B Tauris, 1994.



(وێنەی 1)

خانێکی خەڵکی قاهیرە، کەنیزەکەی خزمەتی دەکات

ای. پێرسی، 1848



(وێنەی 2)

دوو کەنیزی حەبەشی چاودێری شیرەخۆرەی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند دەکەن

ای. پێرسی، 1848

(وێنەی 3)

ئافرەتێك خەڵكی باشوری میسر كۆمەڵە دارێكی لەسەر سەرە

ئێدوارد لین، 1833- 1835



(وێنەی 4)

ئافرەتی چینە هەژارەکانی قاهیرە کە منداڵ و گۆزەکانیان هەڵگرتوون

ئێدوارد لین، 1833- 1835



(وێنەی 5)

کچۆڵەیەکی خەڵکی قاهیرە زەیت لە دوکانی زەیت فرۆشێك دەکڕێت

ای. پێرسی، 1848



(وێنەی 6) حەوشەی خانوویەك هەروەك خانووەكانی تری قاهیرە، كە تایبەتمەندی
خۆی هەیە و بەشی تایبەت لە گشتی جیاكردووەتەوە
ئێدوارد لین، 1833-1835



(وێنەی 7) شازادەی لاو (ڕۆستەم خانی زەند) لە جلو بەرگە جوانەکەیدا
کە واژۆی هونەرمەند محەمەد سادق (یا صادق الوعد)ی لەسەرە،
شیراز، نزیکەی 1779ز



(وێنەی 8) دوو پیاوی چینی ناوەند و باڵای خەڵکی قاهیرە،
کە چەند قەدە جلیان بەسەر یەکەوە لە بەردایە
ئێدوارد لین، 1833-1835



(وێنەی 9)

دوو پیاوی چینی هەژاری خەڵکی میسر، کە جلوبەرگی سادە و

هەرزانیان لەبەردایە.

ئێدوارد لین، 1833-1835



(وێنەی 10)

قاهیرە، سەربازی عوسمانلی و ئەرناۆتییەك کە خەنجەریان لە بن پشتێنە

ای. پێرسی، 1848



(وێنەی 11)

شێوەی مێزەری چاوشێکی عوسمانی و بازرگانێکی میسری لە قاهیرە

ای. پێرسی، 1848



(وێنەی 12)

وێنەیەکی زەیتی کە پۆلێکی ئینکشارییەکان لە نێو شەقامەکاندا بەرجەستە دەکات.

ئەلێکساندر گابرێێل دیکامب 1828



(وێنەی 13) سوڵتان سەلیمی سێیەم، پێشوازی لەو وەفدانە دەکات، کە بە بۆنەی بە سوڵتان بوونییەوە پیرۆزبایی لێدەکەن. لە وێنەکەدا جۆراوجۆری و جیاوازیی مێزەرەکان لە نێوان گەورە فەرمانبەر و دەست و پێوەندەکانی سوڵتاندا دەردەکەون قوستەنتین کەبید گلی، نزیکەی 1789



(وێنەی 14)

جلو بەرگی فارسی و نەریتی سمێڵ بەردانەوە وەك ئەوەی گەشتیار (شاردان) لە گەشتەکەی بۆ وڵاتی فارس لە ساڵی 1669 بینیویەتی



(وێنەی 15) یەکێك لە شێوەکانی سەرپۆشی ئافرەتان
لە وڵاتی فارس، کە گەوهەر لەسەر شێوەی پەڕەی پێوەیە و ژێر چەنەیەکی
گەوهەری بە ژێر چەناگەی هاتوەتە خوارەوە
هونەرمەندی نادیار، ئەسفەهان 1704-22



(وێنەی 16)

ئافرەتێکی فارسی کە دوبرۆی تێکەڵی هەیە و دەستەکانی لە خەنە گرتوون

هونەرمەندی نادیار، ئێران، چارەکی یەکەمی سەدەی 19



(وێنەی 17)

وێنەیەکی سروشتی کە ژەمە خواردنێکە و بریتییە لە میوەجات و بەروبومی ئاژەڵی و نان، هەموویان لە چوارچێوەی کۆشك وێنەیان کێشراوە

هونەرمەندی نادیار، ئێران، سەرەتای سەدەی 19



(وێنەی 18)

پشودانی قافڵە. بازرگانانی تورك کاتی پشوویان بە خواردنەوەی قاوە و

سەبیلە(پایپ) و نێرگلەکێشان بەسەر دەبەن

تۆماس ئەلۆم، تورکیا 1840



(وێنەی 19)

سەربازانی سوپا سەبیلە دەکێشن

ای. پێرسی، 1848



(وێنەی 20)

جەند خانمێك لە حەرەم لە قاهیرە خەریکی سەبیلە و نێرگلە کێشانن، کە بە (شەبك)

یان دار جگەرە ناودەبرا

ئێدوارد لین، 1833-1835



(وێنەی 21)

خانمێکی قاهیرە نێرگلە دەکێشێت

ی. پێرسی، 1848



(وێنەی 22)

خانمێکی ڕەشۆك-عەوام- ی قاهیرە لە حەمام دەگەڕێتەوە

ای. پێرسی، 1848



(وێنەی 23)

چیرۆکبێژ لە چایخانە لە ئەستەنبوڵ

تۆماس ئەلۆم، تورکیا 1840



(وێنەی 24)

ماڵیکاری ئاژەڵ سەما بە مار دەکات

ئێدوارد لین، 1833- 1835



(وێنەی 25)

وێنەی کچێك لە شاخەکانی یەمەن لە کاتی قاوە چنیندا

کارستن نیبۆر، 1761- 1762







(وێنەی 26)

نمونەیەك لە نەخشی ئیسلامی یان ئەوەی بەشێوەی زاراوەیی بە ئارابیسك ناسراوە، کە تێیدا یەکەی زەخرەفی جۆراوجۆری باوەشێنی حەسیری و هەڵواسەری شێوەی ئەندازەیی تێدا بەکاردێت



(وێنەی 27)

قورئانی پیرۆزی شا ئەرگۆن

قاهیرە لە نێوان 770- 790ک/ 1368- 1388ز



(وێنەی 28)

خەتی بزوێن، کە قوتابخانەیەکە و هونەرمەندی موسڵمان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران و لە سەدەی 11و تا سەدەی 13 هەوڵیدا وێنەی مرۆیی و ئاژەڵی لە کۆتایی پیتەکان دابنێت.

ئەو شتە نووسراوە: بە خێرو بەرەکەت و دەوڵەت و سەلامەتی.



(وێنەی 29)

(خربة المفجر)، کە وێنەی داری ژیان بەرجەستە دەکات، بەڵام ئاژەڵگەلێکی دڕندە بەدەوریەوەیە.

ئوردن، نزیکی 724- 743ز



(وێنەی 30)

کۆشکی -نەلحیر- ی ڕۆژئاوا. پشتێنەی (أرضیة) لە گەچ دروستکراو

سوریا، نزیکی730ز



(وێنەی 31)

لە کتێبی گیای پزشکی ((ماتیریا میدیکا))، دیسقۆریدس و یەکێك لە قوتابیەکانی باکوری عێراق یان سوریا، 626ك/ 1229ز



(وێنەی 32)

کتێبی دەرمان (الترياق)

باکوری عێراق، نزیکی595ك/ 1199ز



(وێنەی 33)

، کتێبی مەقامەکانی ئەلحەریری: ئەوزەید لە کۆبوونەوەی نەجراندا وتار دەخوێنێت

(مەقامی چل و دووەمین)

لە ئەلحتمل سوریا، 619 ك/ 1222 ز



(وێنەی 34)

چنراوێکی قەد دیوار کە لە چنراوێکی سوفی تەتریزکراو پێکهاتووە

ئێران، ڕەشت، سەرەتاکانی سەدەی 19



(وێنەی 35)

قاهیرە: شەقامێك و مزگەوتێكی نزیك قەڵا

كۆنت ئەمادیۆ بریزیۆسی، نزیکی 1850ز



(وێنەی 36)

دەروازەی قۆچی زێڕین لە ئەستەنبوڵ

کۆنت ئەمادیۆ بریزیۆسی، نزیکی 1850ز



(وێنەی 37)

مەیدانی شا لە ئیسفەهان

ئیۆژین ناپلیۆن فلاندان 1841ز



(وێنەی 38)

ئەستەنبوڵ: حەوشی کۆشکی تەوپەقابی سەرای

گاسپارد فوساتی 1852ز



(وێنەی 39)

فەتحعەلی شا. کاری شازادە عەلی

ئێران. 1224ك / 1809- 1810 ز



(وێنەی 40)

تاران، باڵەخانەکانی کۆشکی گوڵستان

مەحموود سەبا، 1864ز



(وێنەی 41)

چەند ئافرەتێك سەردانی بازاڕی حەریر لە ئەستەنبوڵ دەکەن

کۆنت ئەمادیۆ بریزیۆسی، نزیکی 1850ز



(وێنەی 42)

ڕێگای ئاو لە ئەستەنبوڵ، لای (تۆفانی)

ولیام بیگ، 1829ز



(وێنەی 43)

وێنەیەکی ناسرەددینی شا (1848-96) کە لە ساڵی1873ز وەرگیراوە



(وێنەی 44)

ئەستەنبوڵ، دەروازەی کۆشکی (دۆڵمەی باخچە)



(وێنەی 45)

سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەم (وێنەیەکی زەیتییە)

رۆبن ماناس، 1855-60ز



(وێنەی 46)

ئەستەنبوڵ، وێنەی ئافرەتێك و منداڵێك کە سەردانی گۆڕستان دەکەن

کۆنت ئەمادیۆ بریزیۆسی، 1853ز




(وێنەی 47)

ئەستەنبوڵ، دیزاینی حەرمولك لە كۆشكی تەوبەقابی سەرای. كێشانی تیم سمیت، لەو وێنە بڵاوكراوەیەوە وەریگرتوە كە لە كتێبی (بیناسازی، ئاهەنگە فەرمییەكان و، دەسەڵات) لە نووسینی جۆلرۆ نیسی بۆگی

1- حەوشی بەشە خانووی دایكی سوڵتان

2- هۆڵی پێشوازی، بەشە خانوی دایكی سوڵتان

3- حەمامی بەشە خانووی دایكی سوڵتان

4- هۆڵی پێشوازی بەشە خانوی سوڵتان

5- حەمامی بەشە خانووی سوڵتان

6- ژووری سوڵتان مرادی سێیەم (1574-95)

7- ڕاڕەوی ژوورەكانی سوڵتان مرادی سێیەم

8- ژووری سوڵتان ئەحمەد (1603-17)

9- بەشە خانوی ژنی یەكەمی سوڵتان

10- بەشە خانوی ژنی دووەم

11- بەشە خانوی ژنی سێیەم

12، 13- ژووری نوستنی ئافرەتانی دیوان

14- بەشە خانوی شازادەكان

15- قوتابخانەی شازادەكان

16- 17 ژووری نوستنی تایبەت بە كۆیلە



(وێنەی 48)

ئەستەنبوڵ، خانودکانی سەر دەریای بەسفۆر، فرانك پارتلت، 1835




(وێنەی 49)

قاهیرە، دیزاینی خانووی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند. کێشانی تیم سمیت لە کتێبی (جوانییەکانی قاهیرە)، نووسینی ج.س.ب فریمان-جرینفیل. ئەوە وەریگرتوە

نهۆمی یەکەم

1- دەروازە

2- 9 ژووری پیاوان

2- ڕاڕەو

3- حەوش

4- هەیوانی پێشوازی

5- فەوارە

6- هۆڵی پێشوازی

7- ژووری خزمەتکارەکان

8، 9- تەویلە

10- دەروازەی حەرملك

11- ژووری دانشتنی خێزانی

12- ڕووبەرێك بۆ نوستن

13- چێشتخانە

14- ژووری تەنوور

نهۆمی دووەم

1- دەروازە

2- هۆڵی هاوینە

3- ڕووبەرێك بۆ نوستن

4- ژووری میوان

6، 5- ژووری دانشتنی خێزانی

9، 7- ژووری ئافرەتان




(وێنەی 50)

ەهران، کۆشکی گوڵستان. لەو وێنەیەی کە د. فۆفریە (پزیشکێکی فەرەنسیبوو لە دیوانی کۆشکی شا نادر لە ماوەی نێوان1889 و1892) کێشاویەتی، وەرگیراوە.تیم سمیت.

- ژووری میوانخانەی پاشا
- تەویلەی پاشا
- ژووری پاسەوانانی کۆشک
- وەزارەتی شەڕ و کۆشکی شازادەی سێیەم کە بە جێگری سەڵتەنە ناودەبرا
- ئەندرۆنی پاشایی
- بەشی تایبەتی ناسرەدین شا
- باخچەکانی کۆشک
- ماڵی تایبەت
- تاوەری هەواگۆڕ

10- شانۆیەك کە ناسرەددینی شا دروستی کردووە
11- ماڵێك بۆ د.فۆفریە
12- تۆمار
13- گۆڕەپانی ناوچەی (ئەرك)
14- مزگەوت
15- عەمباری چەك و تەقەمەنی
16- دەزگای هونەر- پەیانگای هونەری تاران



(وێنەی 51)

ئێران، کۆشکی هاوینەی فەتحعەلی شا ناسراو بە کۆشکی قاجار،

باسکال کۆستە.1839-41



(وێنەی 52)

تاران، هەیوانی پێشوازی فەتحعەلی شا لە کۆشکی گوڵستان.

ئیۆگین ناپلیۆن فلاندین 1839-41



(وێنەی 53)

قاهیرە، خانووی تایبەتی سییەکانی سەدەی 19

ئێدوارد لین، 1833- 1855



(وێنەی 54)

ئێران، ماهان، گومبەزی مەنزڵگای وەلی نعمەتوڵڵا کە بە (القیشان) ڕووپۆشکراوە، سەدەی 17



(وێنەی 55)

پارچەیەکی داری کە بە شێوەیەکی ئەندازەیی لە تێکەڵێکی دارو

مینا دروستکراوە. قاهیرە، سەدەی 14



(وێنەی 56)  وێنەی نێرگلەیەکی فەخفوری، کە لە ژێر شوشەبەندەوە بە
ڕەنگی شین نەخشێنراوە، ئینجا هەر بەیەك ڕەنگ لە سەرەوەی شوشەبەندەکەوە
وێنەی سوارێك کە جلوبەرگێکی جوانی لە بەردایە لە نێو باخێکی گوڵو
گوڵزاردا ڕەنگ ڕووکراوە، ئێران، ئەسفەهان، سەدەی 17



(وێنەی 57)

ئەستەنبوڵ، بەشێك لە کۆشکی ئەسما سوڵتان

تۆماس ئەلوم، نزیکی 1840





(وێنەی 58)

پارچە کۆنکریتێك کە بە زەخرەفەی نەمامی لاولاوی و گەڵای

تێکەڵاو نەخشێنراوە

ئیزنیق، سەدەی 16- سەدەی17



(وێنەی 59) ئەستەنبوڵ، دیوارێکە کە بە گوڵ وگوڵزارو میوە، لە ساڵی1790 وێنەی لە قەد کێشراوە، کە دەکەوێتە بەشی تایبەتی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم لە کۆشکی تەوپەقابی سەرای



(وێنەی 60)

قاهیرە، ناو ماڵی شێخ سادات

فرانك دیلۆن، نزیکی 1875



(وێنەی 61)

ئێران، وێنەیەکی قەد دیواری، کە زەخرەفەی گەچی لەسەر نەخشێنراوە (باغی فیردەوس)، ئەمە لەسەر دیواری ماڵێکی دەرەوەی شارە لە ناوەدانییەکانی باکوری تاران. کۆتاییەکانی سەدەی 19



(وێنەی 62)

ڕازاندنەوەی بنمیچێك، کە بە وێنەی ئافرەت لە جل و بەرگی جواندا ڕازاونەتەوە لەگەڵ وێنەی فریشتە و بورجەکانی بەخت لەنێو گوڵ و گوڵزار و نەمام، نەخشێنراوە، مێژوونوسێك لە 1846



(وێنەی 63)

چەرچەفێکی ئاورێشم کە نەخشی نەمامی لاولاوی تێکەڵاوی لەسەر نەخشاوە

ئێران، سەدەکانی 18 و19



(وێنەی 64)

لاکێشێک ((أوشك)) ی دروستکراو لە سوف

تورکیا، سەدەی17



(وێنەی 65)

چەرچەفێکی مەخمەلی کە بە نەخشی گوڵی جۆراوجۆری قەنەفڵ تەتریز کراوە،

تورکیا، سەدەی 17



(وێنەی 66) کۆمەڵێك ئامرازی خۆڕازاندنەوە، سندوقی زێڕو گەوهەر، شانەیەك و تەوقە سەر، ئاوێنە، جامی سابوون و قاپ قاپەی حەمام، ئەمانە کاری (منۆك جۆلدری)ن لە ئەستەنبوڵ و لەسەر تەرزی تەقلیدی دروستکراوەن، 1990- 92



(وێنەی 67)

لاکێشێکی سوفی کە وێنەی درەختی تێدایە، هەروەها ئەم وێنەیە لە زەخرەفەکانی دیوانی پاشایی و لە خانووەکانی ماوەی نێوا ن 1829 و 1900 دەبینرێن. ئێران، قوم، نزیکی 1960



(وێنەی 68) قەد دیوارەیەکی لە سوفی تەتریزکراو بە سیۆر و میلالیۆن-دوو مادەی بەکارهاتوون لە چنین- زەخرەفەی نەمام و گەڵزاری تێدا نەخشێنراوە و زۆر بەهرەمەندانە کاری تێداکراوە

ئێران، کرمان، سەدەی 19



(وێنەی 69)

وێنەیەکی خاتوو ئێلین شنێلز، یاوەری شازادە زەینەب کچی خدێوی ئیسماعیل. ئەم وێنەیە لە قاهرەو لە ساڵی 1873 وەرگیراوە



(وێنەی 70)

دەستە سڕێکی کەتانی تەتریزکراو

تورکیا، سەدەی 19- 20 سەدەی بیست



(وێنەی 71)

قەمیسێکی ئاورێشمی قۆڵ درێژ



(وێنەی 72)

چنراوێك بە نەخشی نەمام و ڕەنگی ئاڵاو واڵا



(وێنەی 73) خاتوونێکی خومار، شەرواڵی پانی لە بەردایە، کە
لایەکانی بە گەوهەر تەتریزکراون
ئەم وێنەیە دەگەڕێتەوە بۆ هونەرمەند موحەمەد. ئێران، نزیکی



(وێنەی 74)

وێنەیەکی شازادە ئیبراهیم و شازادە زەینەب، دوو منداڵەکەی خدێوی ئیسماعیل لە جلو بەرگی ئەوروپیدان. ئەم وێنەیە لە قاهیرە و لە ساڵی 1873 وەرگیراوە



(وێنەی 75)

ئێوارە خوان، قاهیرە لە سییەکانی سەدەی 19

ئێدوارد لین، 1833- 1835



(وێنەی 76)

ئەستەنبوڵ، گەشتی چەند ئافرەتێك بە سواری عارەبانە

کۆنت ئەمادیۆ بریزیۆسی 1853



(وێنەی 77)

گەشتێکی خێزانی لە ئێران.

کاری عەلی ڕەزا عەباسی، 1020ك / 1612 ز



(وێنەی 78)

ڕێورەسمی پاکبوونەوە وەك ئێدوارد لێن وەسفی کردووە، قاهیرە لە نێوان 1833 و 1835



(وێنەی 79)

قەد دیوارێکی چنراوی لۆکەیی کە لەسەر شێوەی گوڵە قەنەفڵ نەخشێنراوە

تورکیا، سەدەی 17



(وێنەی 80)

ئاهەنگی ژنان

ئەستەنبوڵ، کۆنت ئەمادیۆ بریزیۆسی، 1853



(وێنەی 81) (جەواری) ژنی میسری ناوچەی ڕەشید، کە بەکرێ دەگیران تا لە ئاهەنگەکاندا گۆرانی بڵێن، بەڵام ڕێیان پێ نەدەدرا بچنە حەرەمەوە، بەڵکو لە دەرەوەی ماڵەکان گۆرانیان دەوت، هەروەك چۆن ئێدوارد لین لە کتێبەکەیدا (عادەتی میسرییە هاوچەرخەکان) دەیگێڕێتەوە.

ئی.بیرسی، 1848



(وێنەی 82)

(عالمە)ی میسری لە ئاهەنگەکاندا بەشداری دەکات، ئەمانە ڕێیان پێدەدرا بچنە ناوماڵەکان و لە وێدا گۆرانی بڵێن بە پێچەوانەی جەوارییەکان، وەك ئێدوارد لین لە کتێبەکەیدا(عاداتی میسرییە هاوچەرخەکان) ئێدوارد لین، 1833- 1835



(وێنەی 83)

جلی بووکێنی کە لە مەخمەلی تەتریزکراو دروستکراوە

تورکیا، کۆتاییەکانی سەدەی 19



(وێنەی 84)

ڕێورەسمی بەخاک سپاردن لە قەرافە، قاهیرە،

ئێدوارد لین، 1833 -1835

